# مێژووی هزری سیاسی له‌ رۆژئاوا

له‌ سوكراته‌وه‌ تا ماكیاڤیللی

**(یۆنانی كۆن و سه‌ده‌كانی ناوه‌ڕاست)**

**به‌رگی دووه‌م**

د. كه‌مال پوولادی

وه‌رگێڕانی

ئازاد وه‌لَه‌دبه‌گی    سیروان جه‌بار زه‌ندی

كوردستان ـ هه‌ولێر

٢٠٠٥

**ناونیشانی كتێبی لێوه‌رگێڕدراو:**
د. كمال پولادی
تاریخ اندیشه سیاسی در غرب
از ماكیاولی تا ماركس
نشر مركز، تهران
چاپ اول: ١٣٨٢ (٢٠٠٣ز)

ناوی كتێب: مێژووی هزری سیاسی له‌ رۆژئاوا (به‌رگی دووه‌م)
- نووسینی: د. كه‌مال پوولادی
- وه‌رگێڕانی: ئازاد وه‌له‌دبه‌گی ـ سیروان جه‌بار زه‌ندی
- نه‌خشه‌سازی ناوه‌وه‌: طـــه‌ حسین
- به‌رگ: هۆگر صدیق
- سه‌رپه‌رشتی چاپ: هێمن نه‌جات
- پیتچنین: محمد مامند
- تیراژ: (١٥٠٠) دانه‌
- ژماره‌ی سپاردن: (٣١٦)
- چاپی یه‌كه‌م: هه‌ولێر ٢٠٠٥
- نرخ: (٢٥٠٠) دینار
- چاپخانه‌: چاپخانه‌ی وه‌زاره‌تی په‌روه‌رده‌

زنجیره‌ی كتێب: -٢٤- (١٢٨)

**ناونیشان**
**ده‌زگای چاپ و بلاَوكردنه‌وه‌ی موكریانی**
پۆستی ئه‌لكترۆنی: asokareem@ maktoob.com
ژماره‌ی ته‌له‌فۆن: 2260311
www.mukiryani.com



# ناوەڕۆک

# پەیڤ

**خوێنەری هێژا**

ئەم کتێبەی کە لە بەردەستدایە بەرگی دووهەمە لە زنجیرە کتێبی مێژووی هزری سیاسی لە رۆژئاوا کە بەرگی یەکەمی بە هەوڵ و کۆششی دەزگای موکریانی رووناکایی بینی. ئەم بەرگە باس لە چەرخی نوێ دەکات کە هاوکاتە لەگەڵ سەردەمی رێنسانس و ئەو گۆڕانکارییە مەزنانەی کە لە ئەوروپادا روویانداوەو هەتا ئەمرۆش کاریگەرییان بەسەر روخسارو بنەماکانی هزری سیاسییەوە دیارە.

تایبەتمەندی ئەم کتێبە ئەوەیە کە جگە لە تێروتەسەل بوونی وەك ئینسکلۆپدیایەکی هزری سیاسی بەزمانێکی سادەو بە دوور لە ئاڵۆزی نووسراوە و ئێمەش لە وەرگێراندا هەوڵمان داوە وێڕای پاراستنی ئەو پەڕی ئەمانەتداری لەم تایبەتمەندییە لانەدەین، بۆ ئەوەی کە زیاترین ژمارەی خەڵك بە هەموو توێژەکانەوە بتوانن کەڵکی لێوەربگرین.

ماوەتەوە بڵێین کە پشت بەخودا بەرگی سێهەمیش کە تایبەتە بە هزرڤانانی سەدەی بیستەم دوابەدوای ئەم بەرگە دەبێتە میوانی خوێنەرانی بەرێز و کتێبخانەی کوردی. هیوادارین ئەم بەرگەش بە دڵی ئێوەی ئازیزبێت و دەرگاش لەسەر پشتە بۆ هەر رەخنە و پێشنیارێکی بەسوود......... لەگەڵ رێزماندا.

**ئازاد وەڵەدبەگی - سیروان جەببار زەندی**

**هەولێر- ٢٠٠٥/٥/٤**

Email: awaladbagi2002@yahoo.com



# سەرەتا

لە بەرگی یەکەمی ئەم کۆمەڵەیەدا باسمان لە ڕەوتی مێژوویی هزری سیاسی لە چەرخی کۆن و سەدەکانی ناوەڕاست کرد. لەو بەرگەدا ئێمە باسمان لە دەستپێکی هزری سیاسی کرد لە یۆنانی کۆن و پاش گەڕانێك بە ناو هزری سیاسیی فەیلەسووفەکانی یۆنانی کۆن، رۆمای کۆن و ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاست گەیشتینە سەرەتای چەرخی رێنسانس. لەم بەرگەدا باس لە ڕەوتی هزری سیاسی دەکەین لە سەردەمێك کە بە چەرخی رێنسانس دەستپێدەکات و دەگاتە دەوروبەری سەدەی بیستەم کە بە چەرخی نوێ یا سەردەمی مۆدێرن بەناوبانگە. لەم سەردەمەدا ئێمە لەگەڵ ئەو هزرانەدا سەروکارمان هەیە کە بنەما هزرییەکانی ژیانی فەرهەنگی مۆدێرنیان لە ئەوروپادا بنیات نا. ئەم سەردەمە لە هەمانکاتدا چەرخێکی گەرموگوڕە لە بواری هزری سیاسییدا و ئێمە لە کاتی پێداچوونەوەیدا لەگەڵ گەلێك هزرڤانی مەزن و هەروا سیستەمی هزری سەردەمسازدا بەرەوڕوو دەبین کە بنەما هزرییەکانی ئەندێشەی سیاسی سەدەی بیستەمیان بنیاتنا، کە لەبەرگی داهاتوودا باسیان لێوە دەکەین.





# پێشەکی

### ڕێنسانس، هیومانیزم، پرۆتیستانیزم و چەرخی نوێ

مێژووی نوێی ئەورووپا لە ڕەهەندی سەرەکی خۆیدا بە چەرخێك دەستپێدەكات كە بە چەرخی "ڕێنسانس" یا "نوێبوونەوە" بەناوبانگە. لەم چەرخەدا ئەورووپا سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست بەجێدەهێڵێ و پێدەنێتە ناو سەردەمێکی تازە کە مێژووی خۆی و مێژووی جیهانی مرۆڤایەتی بە تەواوی دەگۆڕێت و دەیخاتە سەر ڕێرەوێکی نوێ. ئەو گۆڕانکارییە مەزنانەی کە لە بواری زانست، تەکنەلۆژیا، فەرهەنگ، ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا دەیبینین لەم سەردەمەوە دەستپێدەکەن. لەم سەردەمەدا سیستەمی فیۆدالی لە ئەورووپا بەرەو لەناوچوون و سەرئەنجام رووخان دەڕوات و سیستەمێکی ئابووریی کۆمەڵایەتی نوێ بە ناوی سیستەمی سەرمایەداری سەرهەڵدەدات. سیستەمی سەرمایەداری دینامیکترین سیستەمی بەرهەمهێنانە کە هەتا ئێستا مێژووی مرۆڤ بەخۆیەوە بینیوە. ئەم سیستەمە ئەو دەرفەتەی بە مرۆڤ دا تا خێراترین و گەورەترین گۆڕانکاری لە پەیوەندی نێوان خۆی و سروشتدا دروستبکات و زیاترین دەسەڵات بەسەر سروشتدا پەیدابکات بە مەبەستی کەڵك لێوەرگرتنی لە پێناو بە دیهێنانی پێداویستییەکانی خۆی لە بەرزترین ئاستدا. (وێڕای ئەوەی کە ئێستا لەبەر هەندێ هۆکار کە لێرەدا جێگای باسکردنیان نییە لە هەندێ بواردا بەرەوتێکدانی هەنگاو دەنێت.) مرۆڤ بە کەڵك وەرگرتن لەم تواناییە (زیادکردنی ئاستی دەسەڵاتی خۆی بەسەر سروشتدا) توانیویەتی بەسەر قاتوقڕی و نەخۆشییە درمەکاندا زاڵبێت کە لە قۆناغە یەك لە



دوای یەکەکانی ژیاندا هەڕەشەیان لە بەشێکی بەرفراوانی خەڵك دەکرد. مرۆڤ ئێستا گەیشتۆتە قۆناغێك لە پێشکەوتن کە ئەگەر بێتو ئامرازەکانی ژیان بەشێوازێکی لۆژیکی دابەشبکرێن هەلومەرجی ژیانێکی پڕ لە خێر و خۆشی بۆ هەمووان فەراهەم دەبێت.

ئەورووپییەکان لە سەردەمی ڕێنسانسدا بەتوندی ئەو سەردەمە لە مێژووی رابردووی خۆیانیان دایە بەر ڕەخنە کە بە سەدەکانی ناوەڕاست بەناوبانگە و هەندێ جاریش ڕەتیاندەکردەوە. گەلێك لە ترادیسیۆنە هزریی، فەرهەنگی و ئایینییەکانی سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست کەوتنە بەر ڕەخنە و سەر لەنوێ پێداچوونەوە. هەندێ لە مێژوونووسان و ڕۆشنبیران گەیشتنە ئەو ئاستە کە سەدەکانی ناوەڕاستیان بە "چەرخی تاریکی" ناوزەدکرد. زۆر هونەرمەند، نووسەر و هزرڤانی هەرە گەورە لە چەرخی ڕێنسانس وەکو کاردانەوەیەك بەرامبەر بە ترادیسیۆنی وتاربێژیی و ئەدەبیات و هونەری سەدەکانی ناوەڕاست، کە روخسارە دیارەکەی زیادەڕۆییکردن بوو لە بەهاو بیروبۆچوونە ئاینییەکان، بەرەو هونەر، ئەدەبیات، بەهاو بیروبۆچوونەکانی سەردەمی بەر لەسەدەکانی ناوەڕاست واتە یۆنان و ڕۆمای کۆن گەڕانەوە و مۆدیلەکانی خۆیانیان لەوێ هەڵبژارد.

هەر ئەم گەڕانەوەیە بەرەو چەرخی "کلاسیك" ڕەهەندی دیاری هونەرو ئەدەبیاتی سەرەتایی چەرخی ڕێنسانس پێکدەهێنێ. چەرخی ڕێنسانس بە بزاوتێکی نوێ لە بواری بیروبۆچوون و هەڵسوکەوتە ئاینییەکان بەردەوام بوو کە بە "بزاڤی ریفۆرمی ئاینیی" ناوبانگی دەرکردووە. بزاڤی ریفۆرمی ئایینی بەشبەحاڵی خۆی گۆڕانێکی گەورە بوو لە شێوازی ئاینداریی و هەڵسوکەوتی ئایینی مەسیحییەکانی ئەورووپای رۆژئاوا و ئەمریکا کە کاریگەریی هەمەلایەنەی لەسەر چۆنێتی تێڕوانینی خەڵك بۆ سەرەکیترین دیاردەکانی ژیانی مرۆیی و لەوانەش جیهانی سیاسەت بەجێهێشت. لە درێژەی ئەم وەرچەرخانانەدا، ئایینزایەکی نوێ بە ناوی ئایینزای پرۆتیستان سەریهەڵدا کە بە هۆی ئەو گۆڕانکارییەی کە لە مەعنەویات و





شێوازی تێڕوانینی بڕوادارانی مەسیحیدا دروستیکرد ئەوانی بەرەو ڕێرەوێکی نوێ لە چالاکییە ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان پاڵ پێوەنا. یەکێك لەو دەرەنجامانەی ئەم بزاڤ و وەرچەرخانە لە تێڕوانینی خەڵکی ئەوروپا و ئەمریکادا دروستیکرد ئەوەبوو کە کەشوهەوای گشتیی کۆمەڵگا ئەوروپییەکانی ئامادەکرد بۆ پەسندکردنی ئەو شتەی کە بەبنەماو رەفتارەکانی ژیانی دیموکراتی و بنیاتنانی ئەو سیستەمە سیاسییەی کە بە دیموکراسی ناسراوە. ئەگەر سیستەمی سەرمایەداری بووە هۆی گۆڕینی پێکهاتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان ئەوا هاودەنگ لەگەڵ ئەودا بزاڤی پرۆتیستانی پێکهاتە زەینییەکانی خەڵکی تووشی گۆڕان کرد و هەموو ئەمانەش زەمینەیان بۆ سەرهەڵدانی ئۆرگانەکان و بنیاتە نوێیە سیاسییەکان خۆش کرد، ئەو ئۆرگان و بنیاتانەی کە فۆرمیان بە جیهانی سیاسی چەرخی نوێ بەخشی و هزرڤانە مەزنە سیاسییەکان (کە بەنۆرەی خۆیان لەوەرچەرخانی ئەم ژیانە سیاسییەدا رۆڵیان هەبووە) لە کەشوهەوایەکی لەم جۆرەی ژیانی ئابووری، هزریی و ئاینی، تیۆرەکانی خۆیانیان دادەڕشت و داهێنانیان دەکرد.

لەباسەکانی خوارەوەدا سەیرێکی گرنگترین ئەو رەوتانە دەکەین کە فۆرمیان بە بنەماکانی چەرخی نوێ بەخشیوە.



## ڕێنسانس

زاراوەی رێنسانس بۆ سەردەمێك لە مێژووی ئەوروپا بەکاردێت کە تێیدا سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست کۆتایی پێدێت و سەردەمێکی نوێ لە شارستانیەتی رۆژئاوایی دەستپێدەکات. نووسەرانی سەدەی ١٩ زاراوەی (زایینی دووبارەیان) بۆ ئەم چەرخە بەکارهێناوە.

چەرخی رێنسانس هاوکات بوو لەگەڵ لەناوچوونی ئۆرگانەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا. شارەکان خۆیان لە کۆت و بەندی سیستەمی فیۆدالی رزگاردەکرد و لە هەندێ ناوچەشدا تەنانەت دەستیان بۆ زەوی و زاری فیۆدالەکان درێژدەکرد. لە شارەکانی ئیتالیا، کە لە رێنسانسدا پێشڕەو بوون، هاوکات لەگەڵ گەشەکردنی بەرچاوی بازرگانی دەرەکی، خاوەن بانك و سەرمایەدارانی نوێ گەشەیان دەکرد کە جێگای خاوەنپیشەکانی سەدەکانی ناوەڕاستیان دەگرتەوە. لە هەموو جێگایەك پەیوەندییەکی نوێ لە بواری ژیانی ئابووریدا پەرەی دەسەند.

بازرگانان، بانکداران و سەرمایەداران لە هەموو جێگایەك خۆیان دەخزاندە ناو ناوەندەکانی دەسەڵاتی ئابووری و سیاسییەوە. ئۆرگانە کەلیساییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بە هۆی زێدەخوازی داموودەزگای پاپا و زێدەڕۆیی لە رازاندنەوە و تەشریفات پلەو پایەی رۆحانی خۆیان لە دەستدابوو. رۆشنبیرانی نوێ کە بە زۆری لە چینی ناوەنجی و چینەکانی خوارەوەبوون لە کلێسا دووردەکەوتنەوە. هزر و زانست لە پاوانکردنی کلێسا دەردەچوو. لە هەموو جێگایەك یاخیبوون بەرامبەر بە دەسەڵاتخوازیی و ژیانی پارێزکارانە سەریهەڵدا بوو. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەو چەرخەی کە بە رێنسانس دەستپێدەکات، گەڕانەوە بوو بۆ

نەریتە هزریی و فەرهەنگییەکانی سەردەمی کۆن کە بۆ یەکەمجار هیومانیستە ئیتالییەکان و لەوانەش شاعیری بەناوبانگی ئەم چەرخە (پترارك) خوازیاری ژیاندنەوەی بوون. ئەم بزاوتە کە سەرەتا لە ئیتالیا (بە هۆی پێشڕەوایەتی لە گەشەپێدانی بازرگانی، پەیوەندییە نوێیەکان و گەشەکردنی چینی نوێی بۆرژوازیی) دەستیپێکردبوو بەرەو ناوچەکانی دیکەی ئەوروپا رەگیداکوتا. (ژول میشلە) مێژوونووسی بەناوبانگی فەرەنسا لە ساڵی ١٨٨٥ بەرگی حەوتەمی کتێبەکەی بە زایینی دووبارە (رێنسانس) ناوناوە و لە هەڵسەنگاندنی خۆیدا بۆ رەوتی مێژووی گشتیی مرۆڤ، شوناس و خەسڵەتێکی تایبەتی بۆ ئەم سەردەمە دەستنیشان کردووە. میشلە، رێنسانس بە خاڵی بەرامبەری سەدەکانی ناوەڕاست پێناسەدەکات و باس لە هەندێ پرس دەکات کە رەهەندی نوێ یا مۆدێرنی مێژوو دروستدەکەن و دەبێ بە رەگەزی دووبارە زایین لە قەڵەمیان بدەین. میشلە، سەدەکانی ناوەڕاست وەك سەردەمێك ناوەدەبات کە تێیدا زانست و سروشتی مرۆیی لە بیر کرابوون و مرۆڤ لە ئازادی خۆی بێبەش کرابوو. بەپێی بۆچوونی میشلە گەشەکردنی زانستی نوێ بە هەوڵی کەسانێکی وەك (کۆپرنیك) و (گالیلۆ)، سەرهەڵدانی پرۆتیستانیزم یا چاکسازی ئایینی لەلایەن کەسانێکی وەك (مارتین لۆتر) و (جان کالڤین) و بزاڤی نوێی هونەری بەکاری کەسانێکی وەك (لیۆناردۆ داڤینچی) و (رافایل) و نوێگەرایی ئەدەبی بەکاری کەسانێکی وەك (پترارك) و (دانتە)، وایانکرد کە مرۆڤ بەرەو رێڕەوێکی نوێی وەرچەرخان هەنگاوبنێ و جارێکی تر رۆحی خۆی بدۆزێتەوە. میشلە، بزاڤی (دۆزینەوەی مرۆڤ و دۆزینەوەی جیهان)ی بە (جەوهەری رۆحی مۆدێرن) لێکدایەوە کە جووڵەی سەرەکی چەرخی رێنسانسی پێکدەهێنا. ئەو تۆژینەوانەی کە زانایانی دیکە دەربارەی چەرخی رێنسانس ئەنجامیانداوە هەندێ رەهەندی وەك (کامڵبوونی چەمکی تاك)، (ژیاندنەوەی چەرخی کۆن) و سەیرکردنی (دەوڵەت وەك دەستکردی مرۆڤ )یان بەروخسارە دیارەکانی دیکەی بزاڤی رێنسانس لە قەڵەمداوە.



سێ رەوتی سەرەکی لە مێژووی ئەوروپا بە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی رێنسانس دادەنرێت. ئەم سێ رەوتە بریتین لە هیومانیزم، چاکسازی ئایینی و شۆڕشی زانستی. بۆ تۆژینەوە لە هزری سیاسیی چەرخی نوێ سەرەتا دەبێ لەگەڵ ئەم سێ رەوتەدا ئاشنابین.

## هیومانیزم

هیومانیزم بزاڤێکی فەرهەنگی بوو کە بە گەڕانەوە بۆ تێڕوانینی زانایانی چەرخی کلاسیکی شارستانیەتی رۆژئاوا بەرامبەر بە مرۆڤ، بووە دەستپێکی گۆشە نیگایەکی نوێ لەسەر مرۆڤ کە لە بەرامبەر تێگەیشتنی سەدەکانی ناوەڕاست لەسەر مرۆڤ رادەوەستا. ئایینی مەسیحیەت لە سەدەکانی ناوەڕاست بە هۆی دیدگای دۆگمایانەی خۆی لە سنووردارکردنی چوارچێوەی دەسەڵات و ئازادی مرۆڤ لە بەرامبەر حەوزوە خوداییدا و سەیرکردنی وەکو قوربانی (یەکەمین گوناە) جێگایەکی زۆر تەسکی بۆ مرۆڤ لەم جیهانەدا دەستنیشان کرد بوو.

فەلسەفەی سکولاستیکیش بە هۆی تۆژینەوەی دەربارەی مرۆڤ لە چوارچێوەی پێناسە و شتە گشتییەکاندا بەشێوەیەکی تەواو ئابستراکت مەعریفەی پەیوەندیدار بە مرۆڤی کردبووە بابەتێکی بێ رۆح. هیومانیزم کاردانەوەیەك بوو لە بەرامبەر هزرە دۆگماکانی سەدەکانی ناوەڕاست و تێگەیشتنێکی تازە بوو دەرهەق بە مرۆڤ وەك بوونەوەرێك کە نەك قوربانی (یەکەمین گوناە) نییە بەڵکو خوازیاری پەرەپێدانی ئازادییە سروشتییەکانی خۆیەتی. هیومانیزم وەك رووکردنە هونەر، ئەدەبیات و هزرەکانی چەرخی کلاسیك لە شارستانیەتی رۆژئاوا (سەردەمی یۆنان و رۆم) بە شیعری (پترارك)ەوە، دەستیپێکرد و لە هزرەکانی (ئاراسموس)دا بە بەرزترین شێوە رەنگیدایەوە. تێگەیشتنی هیومانیستی لە مرۆڤ لە سەردەمی پترارك-ی شاعیرو زانای سەدەی چواردەهەمی ئیتالیا دستیپێکرد. پترارك





بەپێچەوانەی نەریتی سەدەکانی ناوەڕاست لەبری ڕێسا پەیوەندیدارەکان بە بیروبۆچوونی سکولاستیك خەریکی لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە بوو دەربارەی ڕەفتاری مرۆڤ بەو جۆرەی کە لە واقیعدا هەیە. ئەو مرۆڤی بە بوونەوەرێك وێناکردکە هەوڵدەدات بگاتە ژیانێکی باشتر، بەڵام هەواو هەوەسی چەند لایەنە، هەر لە حەزی خودخوازانەی زەمینی و نائومێدییەوە بگرە هەتا ئارەزووی گەورەیی و نەمری، ئەوی بەسەر چەند بەشێکدا دابەشکردووە. بە گشتی هیومانیستەکان لە پلەو پایەی وتاربێژ، شاعیر، مێژوونووس و زانای ئەخلاق مرۆڤیان بەبوونەوەرێك دەبینی کە بە ویست و کرداری خۆی جوانییەکان و چارەنووسی زەمینی خۆی دەخولقێنیّ. هیومانیستەکان پتر پشتیان بەرەهەندی غەریزی و سۆزی مرۆڤ دەبەست تا ڕەهەندی عەقلانیی ئەو. عەقڵ بەو هەموو گرنگییەی کە هەیەتی بازنەی دەسەڵاتی سنووردارە و نەدەتوانیّ بەسەر هەواو ئارەزووەکاندا زاڵبێت و نە بەسەر دژواری تێگەیشتن لە نهێنییەکانی نەمریشدا.

تێگەیشتنی هیومانیستی لە مرۆڤ ڕەنگدانەوەی بەشداریکردنی مێژووی خەڵکی خوێندەواری شارنشین بوو لە چینی ڕەشۆکی (عەوام) لە ژیانی فەرهەنگیدا، ئەو بوارەی کە لەمەو پێش لە بنەڕەتدا لە ژێر کاریگەریی قوتابخانەو ئاکادیمییە کەلیساییەکان و کۆڕوکۆمەڵە ئاریستۆکراتییەکاندا بوو. سیستەمی پەروەردە و فێرکردن بەرەبەرە لەژێر دەسەڵاتی دێر و کەلیساکان هاتە دەرەوە. بەم حاڵەش هەموو هیومانیستەکان لە لایەنگرانی سکۆلاریزم (نەریتگەرایی) نەبوون. هەندیّ ڕەوتی تازە لە مەسیحیەتیش بە تێگەیشتنی تایبەتی خۆیان ڕوویانکردە هیومانیزم و تەنانەت هەوڵی ژیاندنەوەی هونەرو ئەدەبی چەرخی کۆنیان دەدا. هەر بۆیە هەندیّ کەس باسیان لە بزاڤی (هیومانیزمی مەسیحی) کردووە.

هیومانیزمی مەسیحی تێکەڵەیەك بوو لە (فەلسەفەی مەسیح بە لێکدانەوەی ئاراسمۆس و فەلسەفەی ئەخلاقی یۆنان و ڕۆمی کۆن). هیومانیستە مەسیحییەکان



لە جیاتی خودناسی (تیۆلۆژی) لەسەر ئەخلاق و لەبری ڕواڵەتە ئاینییەکان جەختیان لەسەر باوەڕی دەروونی دەکردەوە.

هیومانیزمی مەسیحی لەژێر ڕێبەرایەتی ئاراسمۆس بووە بەرنامەیەکی چاکسازی بۆ نوێکردنەوەی کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی. ئاراسمۆس وتاربێژ و زانایەکی کۆتایی سەدەی پازدەهەم و سەرەتای سەدەی شازدەهەم بوو لە کەلیسای ڕۆتێردام ڕەخنەی لە فەلسەفەی سکولاستیك گرت و ڕوویکردە ژیاندنەوەی نەریتە فەرهەنگییەکانی چەرخی کلاسیك. چاکسازیخوازانی ئایینی و پرۆتیستانەکان کە لە بەشی داهاتوودا باسیان لێوەدەکەین، هەرچەندە هێرشیان دەکردە سەر ئەو شتانەی کە بە ڕەهەندی کوفرئامێزی بزاڤی هیومانیزم ناویان لێدەبرد، بەڵام وەك هیومانیستە نەریتگەراکان (سکۆلار) هەوڵی ژیاندنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کلاسیکیان دەدا و بە پێویستییەکی بڕواداری ڕاستەقینەیان لە قەڵەمدەدا. بە گشتی هیومانیزم لە سیستەمی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا، مرۆڤ تەوەریی کردە جێگری خودا تەوەریی سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست.

## چاکسازیی ئاینیی و پرۆتیستانیزم

لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمی زایینیدا لە ئەوروپای باکووری بزاڤێك بۆ کاردانەوەی بەرامبەر بە بیروباوەڕ و ڕێوڕەسمەکانی کەلیسانی کاسۆلیکی ڕۆمی دەستیپێکرد کە پاش پەرەسەندن لە ناو بەشێکی بەرفراوانی خەڵکی مەسیحی و کامڵکردنی فێرکراوەکانی خۆی، ئاینزای پرۆتیستانی وەك یەکێك لە سێ ئاینزای گەورەی مەسیحییەت بنیاتنا. ئەم بزاڤە کە بە پرۆتیستانیزم ناودەبرێت لە هەموو جێگایەك کاریگەریی لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی، ئابووری، فەرهەنگی و سیاسیی خەڵك دانا.





له ساڵی ١٥١٧ (مارتین لۆتر) كه بۆ خۆی قەشە بوو ڕاگەیاندراوێکی ٩٥ خاڵی لە بەردەم کەلیسای ویتنبرگ هەڵواسی کە دەربارەی ڕێورەسمی لێخۆشبوونی گوناهەکان و هەندێ پرسی باو لە کەلیسای ڕۆم بوو کە تێیدا باس لەوەکرابوو کە کرداری دەرەکی وەك ڕێوڕەسمی کڕینی لێخۆشبوونی گوناهەکان (کە لە چوارچێوەی کەلیسای کاسۆلیکدا باوبوو) ناتوانێ جێگای ئەو تەوبەیە بگرێتەوە کە لە ناخی دڵەوە هەڵقوڵاوە. چونکە تیۆری لێخۆشبوونی گوناهەکان پەیوەندی بە دەسەڵاتی پاپاوە هەبوو، هەر بۆیە ئەم ڕەخنە و ناڕەزاییە لە ڕاستیدا هەموو لایەنەکانی دەسەڵاتی پاپای دەبردە ژێر نیشانەی پرسیارەوە. ئەڵمانییەکان کە زۆر بەتوندی ناڕازی بوون بەرامبەر بە دەستتێوەردانی پاپا لە وڵاتەکەیاندا بۆ پشتگیریکردن لە لۆتر ڕاپەڕین و ئەم بزاوتەیان لەگەڵ بزاڤی ناسیۆنالیزمدا تێکەڵکرد.

چاکسازیخوازە ئایینییە سەرەتاییەکان دەیانویست کەلیسا ساکارتر بکەنەوە و لەو ناپاکییانە پاکی بکەنەوە کە گیرۆدەی ببوو. لایەنە دیارەکانی ئەم بزاڤە، کە خۆیان بازنەیەکی بەربڵاویان دەگرتەوە، بریتی بوون لە جەختکردنەوە لەسەر ئینجیل تەوەری، لە بری بەتەوەرکردنی کەلیسای ڕۆم، بڕوامەند بوون بە پرەنسیپی (ڕۆحانی بوونی هەر بڕوادارێکی مەسیحی) لە بری مەرجەعیەتی فەرمی، پشتبەستن بە هەڵسوکەوتی بڕوادارانی پشتبەستوو بە ڕێنومایی خوداوەند لەبری مەرجەعیەتە ئۆرگانیزەکراوەکان و سەر ئەنجام ( ویژدانی ئازاد)ی بڕواداری مەسیحی.

هەرچەندە بزاڤی چاکسازی لە شێوازی پەتی خۆیدا ڕابوونێکی ئایینی بوو هەر لەسەرەتاوە هەندێ ڕەهەند و دەرەنجامی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابووری گرنگیشی لە خۆگرتبوو کە وەرچەرخانی بنەڕەتی لەگەڵێك لە بوارەکانی ژیاندا دروستکرد. ریفۆرمخوازە سەرەتاییەکان لەوانەش (مارتین لۆتر) لە قۆناغی یەکەمدا لەگەڵ پرسە وتاربێژییەکان بەرەوڕوو بوون. تێگەیشتنی (مارتین لۆتر) لە قووڵترین واتای ئینجیل کاریگەرییەکی سەقامگیری لەسەر هەموو ڕەهەندەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و تیۆرییە کۆمەڵایەتییەکاندا هەبوو. یەکێك لە پرەنسیپە



بنەڕەتییەکانی ئەخلاقی کۆمەڵایەتی لۆتر، هەروەك لە نامیلکەکەی بە ناونیشانی (ئازادیی مەسیحی)دا هاتووە، ئەمەیە کە باوەڕی ئایینی دەبێ لەسەر ئەوین بنیات نرابێت. ئەوینی مرۆڤ وەك ئەوینی خوداوەند نابێ بەشایستەیی لایەنی ئەوین مەرجداربکرێت.

بەبۆچوونی لۆتر هەموو ڕاستییەکان پەیوەندییان بەمەیدانی خوداوەندەوە هەیە. کەلیسا بۆ چاکەی مەعنەوی و دەوڵەت بۆ چاکەی مادیی مرۆڤ دروستبووە. کەوابوو بوارە عورفییەکانی ژیان وەك بنەماڵە، هاوسەرێتی و دەوڵەتیش هەموویان بەشێکن لە سیستەمی خوداوەندی. ئەم سیستەمانە ئەگەرچی لە ڕووی مێژووییەوە تووشی کامڵبوون و لە ڕووی پێکهاتەییەوە دووچاری گەشەکردن دەبن، بەڵام سەرچاوەکەیان خودایە و بەفەرمانی خودایی دەجووڵێنەوە. ئەم دیدگایە بەواتای تێپەڕبوونە لە هەڵسەنگاندنی نێگەتیڤ بەرامبەر بە ئۆرگانە نائایینییەکان بەرەو هەڵسەنگاندنێکی پۆزەتیڤ لەم  ئۆرگانانە بەو جۆرەی کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا باو بوو. هەروەك لە بەرگی یەکەمدا ئاماژەی پێکرا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئۆرگانگەلێکی وەك هاوسەرێتی و دەسەڵاتی دەوڵەت بەو سنوورانە لە قەڵەم دەدران کە بە هۆی (یەکەمین گوناه)ەوە سەپێنراون. بەڵام لۆتر ئەم ئۆرگانانەی وەك ئامرازی ئەوینی خوداوەند ناساند و تێڕوانینێکی پۆزەتیڤی لە سەریان دروستکرد.

بە بۆچوونی لۆتر سیستەمی یاسای سروشتی بە بناغەی هەموو دەسەڵاتە نائایینییەکان و لەوانەش دەسەڵاتداری نامەسیحی دادەنرێت. چونکە گرووپە مرۆییەکان ملکەچی فەرمانی خودایین، هەر بۆیە یاسا باشەکانی ئەوان ناتوانن دژ بەویستی خوداوەند بن. بۆچوونی لۆتر لەمەڕ کۆمەڵگا و فەرهەنگی مرۆیی، دیالێکتیکییە. فەرهەنگ و کۆمەڵگا لەلایەکەوە نەریتێکی خودایین و لەلایەکی ترەوە نەریتێکی خۆیین. لەو ڕووەوە بە نەریتێکی خودایی دادەنرێت کە کرداری ئافراندن هەمیشە کردارێکی تایبەتە بە خوداوەند کە ئافرێنەرو دەسەڵاتدار و پارێزەری هەموو شتێکە، لەلایەکی ترەوە نەریتێکی خۆیین لەو ڕووەوە کە





بەرهەمی کرداری ئازاد، عەقڵانی و بەرپرسانەی تاکی مرۆیین. بڕوادارانی مەسیحی کە بە پاڵنەریی ئەوین دەکەونە جموجووڵ دەبێ بەشداری لە سیستمی کۆمەڵایەتیدا بکەن و بە ئاراستەی چاکەی مرۆڤ، چاکسازی تێدا بکەن.

رەخنەی لۆتر لە مەسیحییەت بەو جۆرەی کە لە کەلیسای کاسۆلیکدا رەنگی دابووەوە پێی لەسەر ئەم داخوازییە دادەگرت کە تاکی بڕوادار لە سەرپەرشتکاریی ئەو ئۆرگانە جۆراوجۆرانە بە تایبەت کەلیسای رۆم و کۆت و بەندە کلاسیکییەکان رزگاربکات. بەم جۆرە کارەکەی ئەو کارێکی ئازادیبەخش بوو. ئەم پەیامەش بووە هۆی کامڵبوونی ئەو تێگەیشتنە لە ئۆمەت کە تەنیا بە پەیوەندییەکی بڕوادارانە و ئەوین بۆ خوداوەند لێکگرێ دراون. بەڵام ئەم هزرە لە چاو ئەو واقیعە سیاسییانەی کە لە ئارادابوون هەڵوێستێکی شەرمنانەی هەبوو. ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی قەیرانێك لە هزری ئایینی لە رووی پەیوەندی بڕواداران لەگەڵ سیستەمی کۆمەڵگادا. هزری (کالڤین) بۆ نەهێشتنی ئەم کەموکوورییە و چارەسەرکردنی ئەم قەیرانە سەریهەڵدا.

(کالڤین) لە بەرامبەر پێکهاتە و نەریتەکانی کەلیسای کاسۆلیك، کە لۆتر لە بەرامبەریدا راپەڕیبوو و ناچار بەپاشەکشەی کردبوو، هەوڵیدا بیروباوەڕە جێگرەوەکان سەقامگیربکات. لە کالڤینیزم، مەسیحییەت ئیدی تەنیا هاوبەشییەکی مەعنەوی بڕواداران نییە لەگەڵ خوداوەند دا بەڵکو ئایینێکی کۆمەڵایەتییە. کالڤین لەو باوەڕەدا بوو کە مەسیحییەت بەبێ سەقامگیربوونی بیروباوەڕە کۆمەڵایەتییەکان ناتوانێ یەکگرتوویی و یەکپارچەیی گرووپی بڕواداران دابین بکات. لایەنگرانی کالڤین لەو باوەڕەدا بوون کەلیسای لۆتری بە هۆی بێلایەنی لە کاروباری سیاسییدا دەرفەتی زیان لێکەوتنیان هەیە. بەم جۆرە ئەوان هزری سیاسییان بە ئاراستەی بەشداری چالاکی بڕواداران پاڵ پێوەنا لە بواری کرداری سیاسی و هەوڵدان بۆ گۆڕینی ئەو جیهانەی کە لە ئارادایە بە ئاراستەی جیهانێکی ئیدیال. تیۆری (کالڤین) تیۆرییەکی پۆزەتیڤی رەخساند بۆ بۆرژوازی لە



حاڵی گەشەکردن و چالاکییە سیاسییەکان لە تێڕوانینیاندا بەرامبەر بە جیهان. لە تیۆری (کالڤین) جیهانی سیاسەت جیهانێکی سەربەخۆیە کە تێیدا خەریکی رێکخستنی کاروباری گشتی خۆیەتی. واتای ئەم وتەیە لە هەمانکاتدا جیاوازی جیهانی ئایینیی و جیهانی سیاسەتە. هەروەك (ماکس ڤیبەر)، کۆمەڵناسی گەورەی ئەڵمانی لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناونیشانی پرۆتیستانیزم و رۆحی سەرمایەداریدا باسی لێوەدەکات پرۆتیستانیزم کاریگەریی هەبووە لەسەر گەشەکردنی سەرمایەداری لە رۆژئاوادا. مەبەست لە (رۆحی سەرمایە) کە (ماکس ڤیبەر) باسی لێوەدەکات بڕوابوونە بە هەوڵی بێوچان، پارێزکاری، دوورکەوتنەوە لە چێژخوازی و بەرەڵلایی کە لە هزری (کالڤین)دا رەنگی داوەتەوە. (کالڤین) ستایشی (فەزیلەتە ئابوورییەکان)ی وەك هەوڵی بێوچان، دەستپێوەگرتن و دوورکەوتنەوە لە زێدەڕەویی کردووە و ئەم تایبەتمەندییانەش کاریگەرییان لەسەر گەشەکردنی سەرمایەداری هەبووە. (کالڤین) تەناتەن قەدەغەکردنی رەهای تەوراتی لەمەڕ ریبا پێشێل کرد و ئەو جۆرە ریبایەی پەسندکرد کە زیان بە هەژاران ناگەیەنێت. بەم جۆرە (کالڤین) فەرمانە ئایینییەکانی خستە خزمەت پێداویستییەکانی کۆمەڵگای بازرگانیی مۆدێرن.

پرۆتیستانیزم هەروا پشتیوانی ناسیۆنالیزم و دەوڵەتە رەهاکان بوو کە لە سەدەکانی شازدە و حەڤدە لە ئەورووپا دەسەڵاتیان بە دەستەوە بوو و کاری لەناوبردنی سیستەمی فیۆدالی، گەشەکردنی سەرمایەداری و نفووزی چینی بۆرژوایان بۆ پلەکانی دەسەڵات خێراترکرد. پرۆتیستانەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی دژایەتی پاپا، پاشاکانیان بە هاوپەیمانی سروشتی خۆیان لە قەڵەمدەدا.





# شۆڕشی زانستی

شۆڕشی زانستی، بە بەرهەمەندێکی گرنگی دیکەی ڕێنسانس دادەنرێت. هەندێك لە ڕاڤەکاران ئەو وەرچەرخانەی کە شۆڕشی زانستی لە تێڕوانینی خەڵکیدا دروستی کرد زۆر بەگرنگتر لە بزاڤی چاکسازیی ئایینی هەڵدەسەنگێنن دەگوترێ بەدرێژایی ئەو سەردەمەی کە بە بڵاوبوونەوەی کتێبی سووڕانی فەلەکەکان لە نووسینی (کوپرنیك)ەوە دەستپێدەکات و هەتا کتێبی بنەماکان لە نووسینی (نیۆتۆن) درێژدەبێتەوە (١٤٣٥-١٦٨٧) وەرچەرخانێکی گەورە لە هەموو بنەماکانی ژیانی هزری و فەرهەنگی رۆژئاوادا روویاندا. بە هۆی ئەو وەرچەرخانەی کە لە فەرهەنگی رۆژئاوادا روویدا زانست، شێواز و تێڕوانینی زانستی وەك هێزی سەرەکی رێنومایییکەری ژیان مەیدانی بە تیۆلۆژی و ئەدەبیات چۆڵکرد. لەسەدەی حەڤدەهەم زانستی نوێ بووە هۆی ئەوە کە ئایینی مەسیحییەت لەبواری ژیانی مادییەوە بەرەو بواری ئەخلاقی تایبەتی پاشگەزببێتەوە. زانستی نوێ تەنانەت بووە هۆی گۆڕینی تێگەیشتنی فەیلەسووفەکان لە جیهان و هەندێ ئامرازی نوێی خستە بەردەستی تێوردارێژانی کۆمەڵایەتی و سیاسی (لە ناساندنی هزری سیاسیی تۆماس هۆبز، بیرمەندی گەورەی سەدەی ١٧، لەم بارەیەوە روونکردنەوەی پتر دەخەینە روو). زانستی نوێ، تێڕوانینی مرۆڤی بەرامبەر بە نەریتەکان گۆڕی و ئەم دەرفەتەی بۆ مرۆڤ رەخساند تا سەربەخۆبوونی خۆی لە رابردوو رابگەیەنێت. یەکێکی دیکە لە ئەنجامەکانی سەرهەڵدان و پێشکەوتنی زانستی نوێ ئەوە بوو کە ئەمەی بۆ مرۆڤ سەلماند چاکسازیکردنی هەلومەرجی ژیان تەنیا بە گۆڕانکاری لە ناوەوەی مرۆڤ نایەتەدی، بەڵکو پەیوەندی بە گۆڕانی ژیانی دەرەکی و سیستەمی کۆمەڵایەتی و سیاسیشەوە هەیە.

## پاژی -١-

# ماکیاڤیللی

### Nicolo Machiavelli

### دەستپێکی ڕەوتێکی نوێ لە هزری سیاسی

### کورتەیەك لە ژیان و بەرهەمەکانی ماکیاڤیللی

ماکیاڤیللی (١٤٦٩-١٥٢٧) سیاسەتمەدار، تیۆرداڕێژ، نووسەر و شاعیری گەورەی چەرخی ڕێنسانسی ئیتالیا لە شاری فلۆرانس لە دایکبووە. بنەماڵەکەی بە بنەماڵەیەکی ناسراوی سیاسی و دێرین دەژمێردرێ. باوکی (ماکیاڤیللی) ماڵ و سامانێکی زۆری نەبوو و بە پیشەی پارێزەری و دادنووسی ژیانی بەڕێوەدەبرد. بنەماڵەی ماکیاڤیللی مولکدارێکی ناوەنجی بوو، هەربۆیە نە بەچینی ئاریستۆکرات لە قەڵەمدەدرا نە بەخەڵکی ڕەشۆکی. بەم حاڵەش ماکیاڤیللی توانی خوێندنێکی وەها بکات کە بیخاتە ریزی نوخبەکانی شاری خودموختاری فلۆرانسەوە. لەو سەردەمەدا لە کۆماری فلۆرانس. تەنیا چینێکی بەرزی کۆمەڵایەتی دەیتوانی لە خوێندنی باڵاو لەوانەش فێربوونی زمانی لاتینی سوودمەند بێت و ماکیاڤیللیش یەك لەو کەسانە بوو. فلۆرانس شارێکی بازرگانی بوو و خوێندنی زۆربەی خەڵکیش لە ئاست بەڕێوەبردنی کاروباری بازرگانیدا بوو.

(ماکیاڤیللی) بەپێی هەلومەرجی سەردەم کەوتە ژێرکاریگەریی بۆچوونەکانی ڕێنسانس و پەروەردەی هیومانیستی (قوتابخانەی ڕەسەنایەتی مرۆڤ). واپێدەچێت



(ماکیاڤللی) بەشداری لەو وانە زانکۆییانەدا کردبێت کە لەو سەردەمەدا بە پێچەوانەی نەریتی سەدەکانی ناوەڕاست تەژی بوون لە ڕۆحی هیومانیستی. لە تەمەنی ٢٩ ساڵیدا چووە ناو سیاسەت و لە پۆستەکانی سکرتێری دیوان، دیپلۆمات و بەڕێوەبردنی کاروباری سەربازی فلۆرانس بە ئیش و کاری حکومییەوە خەریکبوو. بۆ ماوەی ١٤ ساڵ وەك بەرپرسێکی بەرزی حکوومی و دیپلۆمات گەلێك ئەزموونی کۆکردەوە. بۆ وێنە لە دەربارەکانی فەرەنسا، سویسراو ئەڵمانیا ئەرکی دیپلۆماسی پێسپێردرا.

لە ساڵی ١٥١٢ دوابەدوای یەکێك لەو هەورازو نشێوە بەردەوامانەی فلۆرانس و هاتنە سەرکاری بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوا بە ناوی (مدیچی) بە تۆمەتی بەشداری لە پیلان دارشتن دژ بە بنەماڵەی (مدیچی) لەسەر کار لابراو زیندانی کرا. لە زینداندا ڕووبەڕووی گەلێك ئەشکەنجەی قورس بووەوە، بەڵام وا دیارە توانی لە بەرامبەر ئەو ئەشکەنجە ترسناکانەدا دان بە خۆیدا بگرێت و مل بۆ ئەو دانپیانانە سەپێنراوانە کەچ نەکات کە وەك تۆمەتبارەکانی دیکە دەبووە هۆی لە سێدارەدانی. پاش ئازادبوونی لە زیندان بەرەو تاراوگە دوورخرایەوە و ڕوویکردە مەزراکەی خۆی لە دەرەوەی فلۆرانس و بە نووسینی کتێبەوە خەریکبوو. کتێبەکانی لە بواری تیۆری سیاسی و سەربازی بریتین لە:

میر، وتارەکان، مێژووی فلۆرانس (ناتەواو)، هونەری جەنگ. (ماکیاڤیللی) شاعیرو نووسەریش بوو. کتێبەکانی چیرۆك و تەنزی ماندراگولا و بلفاکور لە ریزی بەرهەمە ئەدەبییەکانی ئەودان. ئەو پرسە سەرەکییەی کە زەینی (ماکیاڤیللی) بە خۆیەوە خەریك کردبوو جۆری حکوومەتی شیاوبوو بۆ فلۆرانس و رزگارکردنی ئیتالیا بوو لەو ڕەوشە کارەساتبارەی کە لەو سەردەمەدا بە دەستییەوە دەیناڵاند. ئیتالیا لەو سەردەمەدا تووشی پرژو بڵاوی، بشێویی و دەستتێوەردانی سەربازی وڵاتانی دراوسێ ببوو. لەو باسانەی کە دوابەدوا دێن بە ناساندنی هزری سیاسی (ماکاڤیللی)یەوە خەریك دەبین.





## ١- نەخشەی گشتی تیۆری سیاسیی ماکیاڤیللی

### دوو کتێبی جیاواز بۆ یەك تیۆری

تیۆری سیاسیی (ماکیاڤیللی) بە شێوەیەکی سەرەکی لە هەردوو کتێبی وتارەکان و میردا هاتووە. لە ڕواڵەتدا وا دیارە لە نێوان ئەم دوو کتێبەو ئەو تیۆریانەی کە تیایاندا خراونەتە روو هیچ پەیوەندییەك لە ئارادا نییە و تەنانەت هەندێ کەس ئەو تیۆرییانەی کە لەم دوو کتێبەدا خراونەتە روو دژبەیەك دەزانن. لە وتارەکاندا (ماکیاڤیللی) بەرگری لە کۆماری و بەهاکانی ئازادی دەکات و لە میردا باس لە چۆنیەتی بە دەستهێنان و پاراستنی دەسەڵات و بەها بنچینەییەکانی ئاسایش دەکات. هەروەك لە داهاتوودا باسیدەکەین نابێ تیۆرییەکانی (ماکیاڤیللی) لەم دوو کتێبەدا دژبەیەك بزانین. بەهەرحاڵ ماکیاڤیللی کەسێکی کۆماریخوازە. جیاوازی لە نێوان ناوەڕۆکی ئەم دوو کتێبە بۆ ئەو هۆیە دەگەڕێتەوە کە ماکیاڤیللی کتێبی میری بۆ کۆمەڵگایەك نووسیوە کە تووشی گەندەڵی بووە، کۆمەڵگایەك کە خەڵك و سیاسەتەکەی تووشی گەندەڵی هاتوون و پاشای نوێ دەبێ ریفۆرمی تێدابکات. ئەگەر بمانەوێ بە کەڵك وەرگرتن لە زاراوە ئەرەستۆییەکان مەبەستەکەی خۆمان دەربڕین دەبێ بڵێین کتێبی میر بۆ رەوشێکە کە مادە کۆمەڵایەتییەکەی تووشی گەندەڵی بووە. بەڵام کتێبی وتارەکان بۆ کۆمەڵگایەکە کە مادە کۆمەڵایەتییەکەی ساخلەمە و خەڵکەکەی خاوەن فەزیلەتی سیاسیین. هەر بۆیە باشترین حکوومەت بۆ ئەم کۆمەڵگایە حکوومەتی کۆمارییە.

خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە ماکیاڤیللی و گەلێك لە نووسەرانی هیومانیستی سەردەمی ئەو، لە رووی ناوەڕۆکەوە جیاوازییان دانەدەنا لە نێوان حکوومەتی پاشایەتی سنووردار و دەستووریی لەگەڵ سیستەمی کۆماریدا. بەوتەیەکیتر شێوازی حکوومەت بۆ ئەوان گرنگ نەبوو ئەوەی کە گرنگ بوو پاراستنی



(ئازادییە)کانی خەڵك بوو و هەروەك لە داهاتوودا باسیدەکەین ئەو لێکدانەوەیەی کە ماکیاڤیللی بۆ ئازادی بەکاریهێناوە لەگەڵ لێکدانەوەی ئەمڕۆیدا جیاوازە.

### ماکیاڤیللی وەك تیۆردارێژ

ماکیاڤیللی بەواتای تەکنیکی زاراوەکە، فەیلەسوفێکی سیاسی نییە و لەو کەسانە نییە کە بە دروستکەری سیستەمی فەلسەفی لە قەڵەم بدرێت. ئەو لەو کەسانە نییە کە لە نامیلکەیەکی دیاریکراودا بە شێوەیەکی رێکوپێك تیۆری خۆی دەربارەی مرۆڤ و حکوومەت خستبێتەڕوو بەڵکو نووسراوەکانی ئەو پرژو بڵاون. هەر بۆیە ئەو کەسانەی کە بەبێ وردبینی پێویست و تێڕوانینێکی هەمە لایەنە نووسراوەکانی ئەویان خوێندۆتەوە تێگەیشتنی جیاواز، نادروست و تەنانەت دژ بەیەکیان لێکردووە. بەم حاڵەش راڤەکاران توانیویانە یەکگرتوویەك لە نێوان تیۆرییەکانی ماکیاڤیللیدا بدۆزنەوە و بە شێوەی هزرێکی سیستماتیك بیخەنە روو. ئێمە لەم نووسراوەدا پەیڕەوییمان لە بۆچوونی ئەم گرووپە کردووە.

یەکێك لە کارە گەورەکانی ماکیاڤیللی ئەوە بوو کە سیاسەتی بە بوارێکی سەربەخۆ لە قەڵەمدا و هەوڵیدا سیستەم و رێساکانی ژیانی سیاسی لەناو خودی ئەم بوارەدا بدۆزێتەوە. ئەو هەوڵیدا بە تێڕوانینێکی عەقڵانی و دوور لە دادوەریکردنی پێشوەختە شێوازەکانی بە دەستهێنان و پاراستنی دەسەڵاتی سیاسی شیبکاتەوە. بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیەش بە شێوازی تایبەتی خۆی سوودی لە تۆژینەوەی پشکنەرانە وەرگرت. مێژوو ئەو بوارە بوو کە ماکیاڤیللی بۆ تۆژینەوەی پشکنەرانە کەڵکی لێوەرگرت. جگە لەمەش، رووداوەکانی سەردەمی خۆشی گەلێك کەرەستەو پێداویستی خستبووە بەر دەستی بۆ تۆژینەوە و هەڵێنجان. خاڵی دەستپێکی ماکیاڤیللی لە تیۆرییە رامیارییەکەیدا سروشتی مرۆڤە کە ئەو بەسەقامگیر و نەگۆڕی لە قەڵەمدەدات. لێکدانەوەی ماکیاڤیللی بۆ سروشتی مرۆڤ لەگەڵ لێکدانەوەی زانایانی پێشوودا جیاوازە. زانایانی پێشوو مرۆڤیان بە





بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی دەژمارد و دەرهاویشتە ناکۆمەڵایەتییەکانی ڕەفتاری ئەویان بە نەخۆشی و لادان لە قەڵەم دەدا. بەڵام ماکیاڤیللی، مرۆڤ بە بوونەوەرێکی خۆپەرست دەزانێ کە شوێنکەوتووی خواست و ئارەزووە بێکۆتاییەکانی خۆیەتی. لە دیدگای ئەودا مرۆڤ بوونەوەرێکی ڕواڵەتبینە و هەوڵی پاراستنی نەفسی خۆی دەدات و ئەم پاڵنەری خۆپارێزیی و سروشتی ڕواڵەتبینە وای لێکردووە کە لەلایەن ڕێبەرانی سیاسییەوە دەستەمۆ بکرێت و ئامادەی وەرگرتنی ڕێکخستنی سیاسی ببێت. ڕێکخراوی سیاسیی عەقڵانی دەتوانێ ئەم بوونەوەرە خۆپەرستە ملکەچی ڕێکوپێکی و فەزیلەتی سیاسی بکات. بەم جۆرە فەزیلەتی شارستانی دەتوانێ ببێتە بەشێك لە سروشتی دووهەمی مرۆڤ. کەوابوو سروشتی مرۆڤ کەرەستەیەکی سەرەتایی و خاوە کە ڕێبەرایەتی سیاسی دەتوانێ بۆ پەروەردەکردنی فەزیلەتی شارستانی کەڵکی لێوەربگرێت. ئامانجی بەرزی کۆمەڵگای سیاسی، بەرژەوەندی، ئاسایش و بەختەوەریی خەڵکە لەم جیهانەدا، نەك ئەو مەبەستە ئەخلاقییەی کە هزرڤانانی پێشوو بە دوایەوەبوون.

## فەزیلەت یا شایستەیی وەك هێزی پاڵنەری ڕەفتاری مرۆڤ

زانایانی بەر لە ماکیاڤیللی فەزیلەتیان بە هێزێك دادەنا کە لەناو ڕۆح یا سروشتی مرۆڤدایە بەڵام ماکیاڤیللی لەو باوەڕەدابوو کە فەزیلەت تەنیا لە کۆمەڵگادا دەتوانێ شێوازی کردەیی بەخۆیەوە بگرێت. مرۆڤ دەبێ بە هۆی یاسا و دابەوە، خۆی بە خشڵی فەزیلەت بڕازێنێتەوە. فەزیلەت لە چوارچێوەی چاکەی گشتیدا پێناسەدەکرێت. چاکەی گشتیش ئەو ئامانجانەیە کە هەموو کۆمەڵگایەك بە دوایدادەگەڕێ، وەك ئاسایش، سەقامگیریی (ئازادی) و حکوومەتی یاسا. فەزیلەت ناتوانێ شتێك بێت جگە لە فەزیلەتی شارستانی. مرۆڤ گەرچی بوونەوەرێکی خۆپەرستە، بەڵام دەتوانرێت بە ڕۆحێکی گرووپی پەروەردە بکرێت. مرۆڤ لە سروشتی خۆیدا باش نییە، بەڵام دەتوانرێت بە شێوەکی باش پەروەردە بکرێت.



پرسیار ئەوەیە کە بە چ شێوازێك دەکرێت ئەم مرۆڤە خراپانە بە چاکی پەروەردە بکرێن؟ وەڵام ئەوەیە بەئارەزووی گەورەیی و شکۆمەندیی و شایستەیی لەلایەن (پاشای نوێ) و بە ترس و پاڵنەری خۆپارێزیی لەلایەن خەڵکەوە. (پاشای نوێ)ش پاڵنەری خۆپەرستی و قازانجپەرەستی هەیە، بەڵام خۆپەرەستی ئەو دەکەوێتە خزمەتی گەورەیی و شکۆمەندی و دروستکردنی کۆمەڵگایەکی چاك. کاتێك کە پاشای نوێ کۆمەڵگایەکی چاکی دروستکرد ئینجا هەمووان لەسەر چاکە ڕادێن.

کۆمەڵگای چاك دەبێ بە هێزی شمشێر دروستبکرێت نەك بە ئامۆژگاری و وتاردان. تا ئەو کاتەی کە کۆمەڵگای چاك دروستدەبێت نابێت تووشی گومان بین لە بەکارهێنانی ئەو ئامرازانەی کە لە ڕوانگەی گشتی و لە دیدگای ئاساییەوە بە نائەخلاقی لە قەڵەم دەدرێن.

## ململانێ، ڕەوشی هەمیشەیی کۆمەڵگا

ماکیاڤیللی بە پێچەوانەی هزری کلاسیك ململانێ بە ڕەوشی ئاسایی کۆمەڵگا دەزانێ کە ڕەگ و ڕیشەی لە ناو سروشتی مرۆڤدایە. ئەرەستۆ وێڕای پەسندکردنی جووڵەی هەمیشەیی لە وزەوە بۆ کردەوە گوتبووی کە ماددە لە حاڵەتی وەستاندا سروشتیترە، لە حاڵەتی جووڵان. ڕەنگدانەوەی سەرەکی ململانێی کۆمەڵایەتی، جەنگی هەمیشەییە لە نێوان جەماوەری خەڵك و ڕەخنەگراندا. مارکس، هەروەك لە داهاتوودا باسی لێوەدەکەین، ناکۆکی چینایەتی لە زەمینەی سیستەمی ئابووری-کۆمەڵایەتی بە بنەمای ئەم ململانێیە دادەنا کە بە ململانێی کۆمەڵایەتی ناودەبرێت. بەڵام ماکیاڤیللی ئەمەی بە ململانێیەك بۆ بە دەستهێنانی دەسەڵات دادەنا. جەماوەری خەڵك بە دوای ئاسایشی خۆیاندا دەگەڕێن بەڵام کۆمەڵێك ئاریستۆکرات بە دوای دەسەڵات و قازانجدا دەگەڕێن.

ماکیاڤیللی لەو باوەڕەدایە کە دەتوانین لەم ململانێیە بە ئاراستەی ئامانجە باشە کۆمەڵایەتییەکان کەڵك وەربگرین. لە کۆمەڵگایەکی چاکیشدا ململانێ





هەردەبێت، بەڵام ئاراستەی ئەو ململانێیە بەرەو چاکەی هاوبەش، لە خۆبردوویی بۆ نیشتمان و ڕێزگرتنە لە یاساو دەسەڵات. بەڕای ماکیاڤیللی لە کۆماری ڕۆمدا ململانێ لە نێوان پاتریسیەنەکان (ئاریسیتۆکراتەکان) و پولی بیەنەکان (خەڵکی ئاسایی) لەسینات و ئەنجوومەنەکانی گەل شێوازێکی ئۆرگانی و دروستی هەبووە. ئێستا پاش ناساندنی پێکهاتەی گشتی هزری سیاسیی ماکیاڤیللی لە باسەکانی خوارەوە ڕوونکردنەوەی پتر لەسەر بەشە سەرەکییەکانی تیۆری ماکیاڤیللی دەخەینەڕوو.

## ٢- شێوازی نوێ لە تۆژینەوە سیاسییەکان

### ماکیاڤیللی وەك دەستپێکەری زانستی سیاسی نوێ

ماکیاڤیللی لەو هزرڤانانەیە کە وێڕای ئەوەی هێشتا پێیەکی لەناو هزری سیاسیی کلاسیکە و درێژەپێدەری دانەبڕاوی پێشینانی خۆیەتی، لە هەمانکاتدا ڕێگایەکی نوێی لە زانست و هزری سیاسییدا کردۆتەوە. ماکیاڤیللی ئەو بۆچوونەی کە لە بەشی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست و لەوانەش لە بەرهەمەکانی (ئاکویناس، مارسیلە و ڤیلیام ئۆکام) دا سەرهەڵدا بوو تا کۆتاییەکەی بەرەو پێشەوە دەبات و سیاسەتێکی تەواو عورفی دەستپێدەکات. هەر بۆیە هەندێك وتوویانە کە ماکیاڤیللی بنیاتنەری ڕاستەقینەی زانستی سیاسەتە. ئێمە لە بەرگی یەکەمدا ئاماژەمان بەوە کرد کە بیرو بۆچوونی جیاواز هەیە لەسەر ئەوەی کە چ کەسێك زانستی سیاسەتی بنیاتناوەو بەپێی ئەو پێناسەیەی کە ئێمە دەربارەی زانستی سیاسەت و شێوازەکەی هەمانە، ئەم جیاوازی بیرو بۆچوونە شتێکی سروشتییە. گەلێك کەس شانازی بنیاتنانی زانستی سیاسەت دەدەنە پاڵ سوکرات. هەندێکی دیکەش ئەرەستۆ بە بنیاتنەری زانستی سیاسەت دەزانن، چونکە دەستپێکەری تۆژینەوەی ئەزموونییە لە زانستی دەوڵەتدا. (تۆماس هۆبزیش) کە لە پاژەکانی



داهاتوودا باسی لێوەدەکەین، تێڕوانینی پێشینان بۆ سیاسەت بە تەواوەتی ڕەتدەکاتەوە و خۆی بە بنیاتنەری زانستی سیاسی بەواتا ڕاستەقینەکەی دەناسێنێ.

ئێمە مشتومڕەکانی پێوەندیدار بە بنیاتنانی زانستی سیاسی بەلاوە دەنێین و لە بری ئەوە ئاماژە بە داهێنانە سەرەکییەکانی ماکیاڤیللی دەکەین کە ئەوی کردۆتە کەسایەتییەکی دیار لە بواری زانستی سیاسیی نوێدا. ماکیاڤیللی یەکەم بیرمەندە کە سیاسەتی بە بوارێکی سەربەخۆ لە قەڵەم داوە کە دەبێ بە دوور لە هەر تێبینییەك و بەجیا لە چوارچێوەی ئەخلاق و پەیڤ بخرێتە بەر تۆژینەوە. ماکیاڤیللی مرۆڤ بە بوونەوەرێك دەناسێنێ کە بۆ ئامانجێکی ئەم جیهانە هەوڵدەدات. مرۆڤ بۆ مەبەستێکی گەورەتر لە ئامانجی مرۆڤ ناژی. ئەو بەدوای ئاسایش و بەدوای ناوبانگ و شانازیدا دەگەڕێ تا خۆی دەربخات.[1]

ماکیاڤیللی کە سەر بە بۆچوونەکانی چەرخی ڕێنسانس بوو، یەکێك لە بەشە بنەڕەتییەکانی هزری سەدەکانی ناوەڕاستی بەلاوەنا کە بریتیبوو لە دابەشکردنی ژیانی مرۆیی بۆ دوو بواری دنیایی و ئاخیرەت و پشت بەستنی بواری دنیایی بە بواری ئاخیرەت و میتافیزیك. هەروەك بینیمان بیرمەندانی سەدەکانی ناوەڕاست تەنیا ڕزگاربوونی ئەم جیهانەیان بە پێویست نەدەزانی، بەڵکو ئەمەیان بە پێشەکییەك دەزانی بۆ ڕزگاربوون لە جیهانی دیکە. ماکیاڤیللی بە پێچەوانەی هزرڤانانی پێشوو لە دادپەروەری، یاسا و یاسای سروشتییەوە دەستپێنەکرد بەڵکو لە دەسەڵاتەوە دەستیپێکرد و هەوڵیدا ئەوە پێشانبدات کە چ جۆرە کارگەلێك لە بارودۆخە جیاوازەکاندا دەبێتەهۆی سەرکەوتن یا شکستی سیاسی. ئەو گۆشەنیگای پێشینانی بۆ سیاسەت بەلاوەنا، کە لە هەڵوێستێکی ئەخلاقییەوە سەیری ڕەفتاری مرۆڤیان دەکرد و لە بری ئەوە لە هەڵوێستێکی واقیعگەرایانە و عەقڵانییەوە سەیری ڕەفتاری سیاسی مرۆڤی کرد.

بە گشتی ماکیاڤیللی هۆکارە میتافیزیکییەکانی لە ژیانی سیاسیی مرۆڤدا بەلاوەنا و ڕوویکردە تۆژینەوەی هۆکارە سروشتییەکان. هەروا ئەو لە بری





فەیلەسووفە کۆنەکان بۆ نووسەرانی نا فەیلەسووف و بە زۆری مێژوونووس گەڕایەوە وەك گەزەنفۆن، لیڤی، تاسیتۆس و پلۆتارك. شێوازی ماکیاڤیللی لە تۆژینەوە سیاسییەکاندا شێوازێکی پشکنەرانەیە بە پشتبەستن بە رووداو و بەڵگە مێژووییەکان.

## تیۆری ماکیاڤیللی دەربارەی مرۆڤ

دیدگای ماکیاڤیللی لەمەڕ سروشتی مرۆڤ بە بناغەی تیۆری سیاسیی ماکیاڤللی دادەنرێت. ئەو بە تۆژینەوەکانی خۆی لە مێژوودا گەیشتە ئەو ئەنجامە کە سروشتی مرۆڤ نەگۆڕە و دەتوانین لەسەر ئەو بنەمایە بگەینە هەندێ رێسای گشتی یا گشتگیر لە سیاسەتدا. مرۆڤ بوونەوەرێکە کە گەلێك ئارەزووی تێر نەبوو و زێدەخوازیی بێکۆتایی هەیە. یەکەمین خواستی ئەو پاراستنی خۆیەتی. ئەو کورتبین، رواڵەتبین و لاساییکەرەوەیە و حەزی لە پەیڕەوەیی کردنی کەسایەتییە مەرجەع و دووڕوو و فریوکارەکانە. بەم جۆرە ماکیاڤیللی لە دیدگای گەلێك لە فەیلەسووفە گەورەکانی بەر لە خۆی دووردەکەوێتەوە، کە مرۆڤیان بە سروشت بە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی دەزانی.

بەڵام بەسەرنجدان بەم تایبەتمەندییانە لە سروشتی مرۆڤ ئایا دروستکردنی کۆمەڵگایەکی بنیاتنراو لەسەر هاوکاری و هەوڵی هاوبەش مومکینە؟ ماکیاڤیللی وەڵامێکی پۆزەتیڤ بەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێ هەر رێك لەسەر بنەمای ئەم تایبەتمەندییە سروشتییانە دەتوانرێت کۆمەڵگایەکی دامەزراو لەسەر رێك و پێکی، سەقامگیریی و فەزیلەت (بەو واتایەی کە ماکیاڤیللی بەکاری بردووە) بنیاتبنرێت.

سروشتی مرۆڤ نەگۆڕە بەڵام خەسڵەتەکانی دەگۆڕێت. خەسڵەتەکانی مرۆڤ بەرهەمی ئەزموونە تاك و گرووپییەکانی ئەون. ئەزموون بریتییە لە پەرچەکردار بەرامبەر بەو رووداوانەی کە لە ژیانی مرۆڤدا روودەدەن. کاتێك کە ئەم پەرچەکردارانە بوونە داب، ئینجا خەسڵەتێکی سەقامگیر. ئەم خەسڵەتانە بە درێژایی زەمەن بە شێوەی



تاك و گرووپی، حەزە کەسییەکانی مرۆڤ دروستدەکەن. کاتێك کە کۆمەڵگا گەندەڵ بووە و خەسڵەتە خراپەکان تێیدا گەشەیان کردووە، ئەرکی پاشای نۆی ئەوەیە سەر لە نوێ فۆرم بە خەسڵەتەکان ببەخشێتەوە.

پاشا سەرەتا ئەو هاوڵاتییانەی کە گیرۆدەی خەسڵەتە خراپەکانن بە هاوڵاتییانی شەرمن دەگۆڕێت، پاشان لەسەر یاسای چاك رایاندێنی تا بتوانن خەسڵەتی باش بە دەستبهێنن.

ئێمە لە داهاتوودا روونکردنەوەی زیاتر دەدەین لەسەر ئەوەی کە پاشا چۆن دەبێت خەڵکی خۆی بەرەو رێگای دروست رێنومایی بکات، بەڵام خراپ نییە هەر لێرەدا ئەم پرسیارە بهێنینە گۆڕێ کە بۆچی کۆمەڵگا گەندەڵ بووەو ئەو کۆمەڵگایەی کە لە کتێبی وتارەکاندا کەرەستەی سیستەمی کۆمارییە دەبێتە کۆمەڵگایەك کە کەرەستەی سیستەمی پاشایەتییە لە کتێبی میردا؟ وەڵامی ماکیاڤیللی بۆ ئەم پرسیارە بریتییە لە دابەشبوونی زۆر نایەکسانی سامان لە نێوان زۆرینەی هەژار و کەمینەی زۆر دەوڵەمەندا. هەر کۆمەڵگایەك لە بنەرەتدا لە دوو جۆرە خەڵك پێکهاتووە. یەکەم گرووپی بچووکی دەسترۆیشتووەکان و ئەویتر گرووپی بەرفراوانی جەماوەری خەڵك. ململانێی بەردەوام لەنێوان ئەم دوو گرووپە لە ئارادایە، گرووپی بچووکی دەسترۆیشتووەکان دەیانەوێ بەسەر خەڵکدا دەسەڵاتیان هەبێت و گرووپی بەرفراوانی جەماوەری خەڵکیش دەیانەوێ لەم دەسەڵاتە ئازادبن. هەر بۆیە ململانێی دەسەڵات لە نێوان ئەم دوو گرووپەدا بەردەوامە. لە هەمانکاتدا گرووپی یەکەم بیری تیژترە. جەماوەریش حەزی لە دەسەڵاتە، بەڵام پاڵنەری دەسەڵاتخوازیی لەواندا نووستووە. بەهەر حاڵ دابەشکردنی کۆمەڵگا بە گرووپێکی بچووکی زۆر دەوڵەمەند و گرووپێکی گەورەی هەژار، کۆمەڵگا تووشی گەندەڵی دەکات. ئەم کۆمەڵگایە بۆ چاکسازی پێویستی بە پاشایە. بەڵام کۆمەڵگایەك کە چینە ناوەنجییەکەی زیاترە هەلوومەرجەکەی بۆ حکوومەتی کۆماری لەبارترە.





بەڵام کۆمەڵگایەك کە بەسەر دوو گرووپی دژ بەیەکدا دابەشبووە خەڵك بەرامبەر بەیەکتر سوپاسگوزار و ئەمەکدار نین. ترس و نەفرەت خەڵك بەرەو زیان پێگەیاندن و فریودان و فریوخواردن پاڵپێوەدەنێت.

### ۳- سیاسەت و رەوشت لە تیۆری سیاسیی ماکیاڤیللیدا

#### مەتەڵی میرو وتارەکان

ئەو شتەی کە بووەتە هۆی ناوبانگ (و هەندێ جاریش بەدناوی) ماکیاڤیللی کتێبی میرە. لەم باسەدا وێرای خستنە رووی بەشەکانی تیۆری ماکیاڤیللی باس لە ناوەرۆکی ئەم کتێبە دەکەین. بەڵام بەر لە هەموو شتێك پێویستە جەخت لەسەر نەهێشتنی خراپ لێکگەیشتنێك بکەین و لێرەدا زیاتر روونی بکەینەوە.

بۆ گەلێك کەس ئەمە هێشتا مەتەڵ بوو (و بۆ هەندێ کەس هێشتاش هەر مەتەڵە) کە ئایا دەبێ لە کتێبی وتارەکاندا بەدوای بۆچوونی راستەقینە و سەرەکی ماکیاڤیللیدا بگەڕێین یا لە کتێبی میردا؟ هەروەك ئاماژەمان پێکرد ماکیاڤیللی لە وتارەکاندا بەرگری لە کۆماری دەکات و لە میردا خوازیاری پاشایەکی سەروویاسایە کە گوێ نەداتە هیچ بنەمایەکی ئەخلاقی و دامەزراوە یاساییەکان. دەربارەی ئەم پرسیارە بۆچوون و تیۆری جیاواز خراونەتە روو و لایەنگرانی ئەم تیۆر و بۆچوونە جیاوازانە مشتومڕیان لەگەڵ یەکتردا کردووە. ئێمە ئاماژمان بەوە کرد کە لە راستیدا نابێ ئەم پرسە وەك مەتەڵ سەیر بکرێت. ئەم دوو کتێبە باس لە دوو کۆمەڵگای جیاواز دەکەن یەکێکیان ساخلەم (وتارەکان) و ئەویتر نەخۆشە (میر). کتێبی میر کە بووەتە هۆی بەدناوی و گومان لەسەر کۆماریخوازی ماکیاڤیللی بریتییە لە ئامۆژگارییەکانی ماکیاڤیللی بۆ پاشا لە کۆمەڵگایەکی نەخۆشدا و هەڵگری تیۆری ماکیاڤیللی نییە لە مەڕ چۆنێتی و جۆری حکوومەت.



هەندێکی دیکەش وتوویانە کە ماکیاڤیللی وەك سیاسەتمەدارێکی کردارگەرا میری بۆ حاڵەتی تایبەتی فلۆرانس یا ئیتالیا نووسیوە و دەبێ وەك کتێبێکی ئامۆژگارینامە لە قەڵەم بدرێت کە لە سەردەمی ماکیاڤیللیدا گەلێك نموونەی وا (نموونە لە رووی فۆرمەوە نەك لە رووی ناوەرۆکەوە) هەبووە.[۲] ئەم تێگەیشتنەش دروست نییە. میریش هەر بە قەدەر وتارەکان هەڵگری تیۆری سیاسی و بیرو بۆچوونەکانی ماکیاڤیللییە.

### ئەخلاقی سیاسی لە تیۆری ماکیاڤیللی

ماکیاڤیللی لە کتێبی میردا ئامۆژگاری ئەو فەرمانڕەوایە دەکات کە مەبەستیەتی و دەڵێ هەر کاتێك کە پێویست بوو تووشی گومان نەبێت لە بەکارهێنانی فریو، پەیمان شکێنی و توندوتیژیدا. ئەو تەنانەت بە تێروتەسەلی باس لە کاریگەربوونی ئەم شێوازانە دەکات لەلای فەرمانڕەوایانی پێشوو و بە تێروتەسەلی ئەوە روون دەکاتەوە کە چۆن دەبێ ئەم شێوازانە بەکاربهێنێ. ئەو باس لە کردەوەی یەکێك لە فەرمانڕەوایانی سەردەمی خۆی دەکات کە چۆن بۆ رەزامەندی خەڵکی شار، دوژمنەکەی خۆی دەکاتە دوو کەرتەوەو لەسەر دەروازەی شار هەڵیدەواسێ.

ئەم بابەتانە بوونە هۆی ئەوە کە پاش بڵاوبوونەوەی کتێبی میر گەلێك کەس بە کتێبی وانەیی دیکتاتۆرە تاوانبار و چارەڕەشەکان لە قەڵەمی بدەن و سەرزەنشتی بکەن. تەنانەت ناوی یەکەمی ماکیاڤیللی واتە نێکۆلۆ بوو بە هاوواتای (ئەهریمەن) و (شکسپێر) لە سەردەمی خۆیدا بە ناونیشانی (ماکیاڤیللی تاوانبار) ئاماژە بە ماکیاڤیللی دەکات و (یاگۆ) لە شانۆنامەی (ئۆتیللۆ) لە مۆدیلی ماکیاڤیللی وەرگیراوە. بەپێی یەکێك لەو زاراوە باوانە ئەو سیاسەتمەدارانەی کە پابەندی هیچ کۆت و بنەمایەکی ئەخلاقی نین و بە ئاسانی فریوکاری دەکەن بە (ماکیاڤیللیست) بە ناوبانگن.





راڤەکردنی جۆراوجۆر دەربارەی تیۆری ئەخلاقیی ماکیاڤیللی لە ئارادایە. ئێمە لێرەدا نەختێك لەسەر ئەم راڤەکردنانە رادەوەستین و بەلێوردبوونەوەیەکی زیاتر سەیریان دەکەین. هۆی ئەم کارەش ئەوەیە کە تیۆری ئەخلاقیی ماکیاڤیللی یەکێکە لە بەشە سەرەکییەکانی تیۆرییەکەی ئەو.

دەتوانین چوار راڤە دەربارەی تیۆری ئەخلاقیی ماکیاڤیللی لە یەکتر جیابکەینەوە:

### ١- باوەڕنەبوونی ماکیاڤیللی بە ئەخلاق

ئەم تێگەیشتنە لە رابردوو پاش بڵاوبوونەوەی کتێبی میر تا ماوەیەك راڤەکردنی باوبوو. بەپێی ئەم لێکدانەوەیە، ماکیاڤیللی باوەڕی بە هیچ پرەنسیپێکی ئەخلاقی نەبووە، پاشاشی فێردەکرد کە چۆن باوەڕی بەهیچ پرەنسیپێکی ئەخلاقی نەبێت و هەموو کۆت و بەندە ئەخلاقییەکان پشتگوێ بخات. ئەم تێگەیشتنە تێگەیشتنێکی رەشۆکی و سەرپێیە و هیچ سەرنجێکی نەداوەتە سەر جوانکاریی تیۆری ماکیاڤیللی.

### ٢- سیاسەت لەگەڵ ئەخلاقدا سازگار نییە

ئەم راڤەکردنە بۆ (بێندیتۆ کرۆچە) فەیلەسوفی بە ناوبانگی ئیتالی دەگەڕێتەوە. کرۆچە لەو باوەڕەدایە کە ماکیاڤیللی نکۆڵی لە بەهای ئەخلاقی مەسیحی نەکردووە و نەیگوتووە ئەو تاوانەی کە زەروورەتی سیاسی دەیخوازێ لە راستیدا بە تاوان ناژمێردرێ. ماکیاڤیللی تەنیا دەیەوێ ئەم خاڵە دەربڕێ کە ئەخلاق لە سیاسەتدا جێگایەکی نییە و هەر سیاسەتێکیش کە پشت بە گریانەکردنی بەهای ئەخلاق، ببەستێ بە کارەسات کۆتاییدێت.

ئەم وتەیە کە سیاسەت لەگەڵ بنەما ئەخلاقییەکاندا یەك ناگرێتەوە وتەیەکی باوە و ئێمە زۆرجار گوێمان لێدەبێت کە دەڵێن (سیاسەت دایك و باوکی نییە). بەڵام ئایزایا بەرلین هزرڤانی سەدەی بیستەم کە پاشان قسەی لێوەدەکەین ئەم بۆچوونەی



کرۆچە رەتدەکاتەوە و دەڵێ ئەمە پێویستی بەوەیە کە بڵێین ماکیاڤیللی ژیانی کۆمەڵگا بەسەر دوو بواری پابەند بە ئەخلاق و پابەند نەبوو بە ئەخلاق دابەش بکات و سیاسەت لە بواری پابەند نەبوو بە ئەخلاق یا شتێك لە سەرووی چاك و خراپەوە لە قەڵەم بدات. بە وتەی ئایزایا بەرلین ئەمە راست دەرناچێت، چونکە ماکیاڤیللی چالاکی سیاسی بە بەشێك لە چالاکی ئەخلاقی دەژمێرێت.[٣] بۆچوونی ئایزایا بەرلین ئەوەیە کە ماکیاڤیللی هێڵێکی جیاکەرەوە لە نێوان سیاسەت و ئەخلاقدا راناکێشێ بەڵکو هێڵی جیاکەرەوە لە نێوان دوو جۆرە ئەخلاق، ئەخلاقی ئاسایی مەسیحی و ئەخلاقی دێرین (رۆم و یۆنانی کۆن) یا ئەخلاقی جیهانی کوفردا رادەکێشێ. ماکیاڤیللی ستایشی بەهاکانی جیهانی کۆن دەکات وەك دلێری، هەوڵی بەردەوام، سەرکەوتنخوازی لە بواری گشتی، رێکوپێکی، رێککاری، بە هێزی و شادبوون و لە هەمانکاتدا نکۆڵی لە ئەخلاقی مەسیحی ئاسایی دەکات وەك خۆشەویستی، قەناعەت، ئەوین بە خودا، بەخشش، لە خۆ بردوویی، خێر، بێ نرخکردنی خۆشییەکانی دنیا و ستایشکردنی رزگاریی ئاخیرەت. هۆی نکۆڵی لێکردنی بەهاکانی ئەخلاقی مەسیحی ئەوەیە کە بەجێبەجێکردنیان ناتوانرێت کۆمەڵگایەکی مرۆیی جێی رەزامەندی دروستبکرێت. ئەم بەها مەسیحییانە خراپ نین، بەڵام بۆ دروستکردنی کۆمەڵگایەکی بەشکۆی وەك کۆمەڵگای ئەسینا و رۆم ناتوانرێت پشتی پێببەسترێت.

### ٣- ئەخلاقی سیاسی پێویستی بە دووربینییە

سکینر بەم جۆرە تیۆری ئەخلاقیی ماکیاڤیللی لێکداوەتەوە: سروشت بەهرەیەکی تایبەتی بەهەریەك لە ئێمە بەخشیوە و هەڵسوکەوتی ئێمە لە ژێر دەستی ئەم بەهرە تایبەتیانەدایە. بەڵام زەمەن بەردەوام لە گۆڕاندایە، و ئەگەر ئێمە نەتوانین شێوازی کاری خۆمان بگۆڕین بە ناچار سەردەمێك لەگەڵ بەختی باش و سەردەمێکی تر لەگەڵ بەختی خراپ بەرەو رووەبین. بۆ ئەوەی بتوانین هەمیشە





کەڵك لە بەختی باش وەربگرین دەبێ بتوانین خۆمان لەگەڵ هەلومەرج و زەمەندا بگونجێنین.[٤] پاشایەك کە نەتوانێ خۆی لەگەڵ زەمەن و پێداویستیەکاندا بگونجێنێ ناتوانێ بەسەر بارودۆخەکەدا زاڵ ببێت.

## ٤- تا گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی ئیدیال ناتوانێ بە شێوەکی رەها ملکەچی ئەخلاقی باوبێت

بەرای ئێمە دەکرێ تیۆری ئەخلاقیی ماکیاڤیللی بە شێوەکی دیکەش لێك بدرێتەوە. وادێتە بەرچاو ماکیاڤیللی وێرای ئەوەی کە هێڵێکی جیاکەرەوەی لە نێوان ئەخلاق و سیاسەتدا رانەکێشاوە و لە هەمانکاتدا کە نکۆڵی لە ئەخلاقی باو نەکردووە، هەندێ پرەنسیپی ئەخلاقی تایبەتی بۆ سیاسەت لەبەرچاو گرتووە. ئامانجی ژیانی سیاسی ئەوەیە کە بۆ بەدیهێنانی ئارەزووە بنچینەییەکانی پاراستنی نەفس هەوڵبدات تا ئاسایش و سەقامگیریی و رێکوپێکی لە کۆمەڵگادا جێگیر بکات. کە وابوو ئەخلاقی سیاسی ئەو ئەخلاقەیە کە بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە سەری هەڵداوە. ئەخلاقی مەسیحی باو (خۆشەویستی، دڵسۆزی، راستگۆیی) لە گەلێك هەلومەرجدا (نەك لە هەموو هەلومەرجەکاندا) بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە شیاو نییە و پێداگرتن بۆ کارکردن بەپێی فەزیلەتی باو بۆ خۆی دەبێتە هۆی ئەنجامی نائەخلاقی. لە هەندێ حاڵەتدا بە ناچاری بۆ گەیشتن بە ئەنجامی باش دەبێ پشت بە ئامرازی خراپ ببەسترێت. چونکە لە کۆمەڵگایەکی نەخۆش کە گەلێك لە خەڵك پابەندی بنەما ئەخلاقییەکان نین چۆن دەتوانرێت بۆ چاکسازیی کۆمەڵگا بە شێوەکی رەها پشت بە هەندێ پێوەری باوی وەك دڵسۆزی و راستگۆیی و پەیمانداری ببەسترێت؟ هەر بۆیە ماکیاڤیللیش بەم جۆرە ئامۆژگاری پاشای خۆی دەکات لە کۆمەڵگایەکدا کە خەڵك پەیمان شکێن، ناسوپاسگوزار، درۆزن و ناسەقامگیرن، ئەگەر ئەو راستگۆ، دروستکار، پەیماندار و دڵسۆز بێت ئەوا بەزوویی خۆی دەخاتە بەردەم هەرەشەی لەناوچوون. کە وابوو دەبێ سەرەتا



کۆمەڵگایەکی ساخلەم دروستبکرێت تا هەلومەرجی راستگۆیی و پەیمانداری و دڵسۆزی بەسەریدا زاڵ بێت.

تا بەر لە گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی ساخلەم بۆ گەیشتن بەم کۆمەڵگایە (نەك بۆ بەرژەوەندی تایبەتی) ئەگەر پێویست بوو دەکرێت بنەما باوەکان پشتگۆی بخرێت.

ئەم وتەیە بە لێکدانەوەیەکی تر بریتییە لە پاساو هێنانەوە بۆ ئامراز بۆ گەیشتن بە ئامانج و گوتوویانە کە (ئامانج پاساو بۆ ئامراز دەهێنێتەوە). ترۆتسکی شۆڕشگێڕی رووس دەڵێ لە کۆمەڵگایەك کە بەسەر چینەکاندا دابەشکراوە و ململانێی چینایەتی تێدایە، بوونی درۆ و توندوتیژی حەتمییە. شۆڕشیش ناتوانێت ئەم کۆمەڵگایە لە توندوتیژی پاك بکاتەوە.[٥] کە وابوو فەزیلەت و نادانی پەیوەندیی بە هەلومەرج و کەش و هەوای کاری سیاسی ئێمەوە هەیە. ماکیاڤیللی لە وتارەکاندا دەنووسێ: (کاتێك کە ئاسایشی وڵات بەتەواوی پشت بەبڕیارێکی دیاریکراو دەبەستێ کە دەبێ بدرێت نابێ سەیری دادپەروەر یا نادادپەروەر بوون، دڵسۆز یا نادڵسۆز بوون و چاك یا خراپ بوونی بکرێت. سەرەڕای ئەمانە دەبێ ئەو رێگایە دەستنیشان بکرێت کە رزگارکردنی ژیان و ئازادی وڵات پشتی پێدەبەستێ)[٦] ئەم وتەیە هەمان ئەو شتەیە کە پاشان بە (بەرژەوەندی وڵات) ناوبراو و بووە زاراوەیەکی باو لە زمانی سیاسییدا.

## ئامۆژگاریکردنی پاشا

بەم پێیە ماکیاڤیللی ئامۆژگاری پاشای نوێ دەکات کە دەیەوێ کۆمەڵگایەکی نوێ دروست بکات و ئەمەش لە قۆناغی یەکەمدا وا پێویست دەکات کە بەسەر ئەو بەرهەڵستکارییەدا زاڵ بێت کە بە ناچار لەسەر رێگایدا دروستدەبن و ئامۆژگاری پاشا دەکات کە دەبێ فێربێت هەم لە شێرو هەم لە رێوی وانە وەربگرێت. هەم لە هێز کەڵك وەربگرێت و هەم لە رێگای یاساوە کەڵك لە ئامرازە مرۆییەکان وەربگرێت بۆ رێکوپێککردنی دەوروبەر. کەڵك وەرگرتن لە یاسا شیاوی مرۆڤە و





کەڵك وەرگرتن لە هێز شیاوی ئاژەڵە. بەڵام لە کۆمەڵگایەکدا کە تووشی گەندەڵی بووە یاسا هەمیشە کاریگەر نییە و پشتبەستن بە هێز و فرتوفێڵێش پێویستیەکە تایبەت بە ئاژەڵەکان. پاشا دەبێ ئاگاداربێت کە نەکەوێتە بەر نەفرەتی خەڵك، بەڵام ئەگەر دەرفەتی ئەوە نەبێت کە خۆشەویستی و لێترسان بە یەکەوە کۆبکاتەوە وا باشترە کە لێی بترسن تا ئەوەی کە خۆشیان بوێت.

## بنەماکانی نوخبەگەرایی لە هزری ماکیاڤیللیدا

ماکیاڤیللی ڕۆڵی خەڵك لە دروستکردنی کۆمەڵگایەکی باشدا پشتگوێ ناخات و گرنگی بە دادوەریکردنی خەڵك دەدات، بەڵام هەمیشە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە خەڵك تەنیا لە ژێر ڕێبەرایەتی کردنی ڕێبەرانی باشدا دەتوانن ڕۆڵێکی سازێنەریان هەبێت و بە ڕێگایەکی عەقڵانیدا بڕۆن. چ لە حکوومەتی پاشایەتی و چ لە کۆماریدا شارەزایی ڕێبەران بۆ یەکگرتووکردنی خەڵك بە ئاراستەی چاکەی هاوبەش گرنگییەکی بنەڕەتی هەیە. ئەم دیدگایە یەکێکە لە بنەما هزرییەکانی ئەو تیۆرییەی کە ئێمە بە تێڕوانینی نوخبەگەرایی ناوی لێدەبەین. بەهەرحاڵ لە ڕوانگەی ماکیاڤیللییەوە توانایی و ڕۆڵی خەڵك سنووردارە و ئەوان بە خاوەنی ڕۆڵ دەزانێت. لە پاراستن و بە هێزکردنی دەوڵەت نەك لە بنیات نانی و ملکەچبوون بۆ پێشنیارە باشەکان نەك داهێنانی شێوازە باشەکان بە وتەیەکی تر لێهاتوویی خەڵك لێهاتوویی ئەو کەسانەیە کە وتەی ڕێبەران دەبیستن و دەتوانن بە دروستی دادوەریی لەسەر بکەن و پاشان بە پەیڕەوکردنی بەرنامە باشەکان یارمەتی بەدیهاتنی ئامانجە مەزنەکان دەدەن. ڕاستە کە خەڵك ڕواڵەتبین و فریوکار و فریوخۆرن بەڵام بەبێ ئەوان بە ئەنجام گەیاندنی کارە مەزنەکان مەیسەر نابێت.



## پێگەی حکوومەت لە کۆمەڵگادا

بوونی دەوڵەت گرنگترین ڕێخۆشکەرە بۆ ئەوەی کە سروشتی خۆپەرەستی مرۆڤ بەرەو ئامانجە ئیدیالە کۆمەڵایەتییەکان هەنگاو بنێت. دەوڵەت ئامرازێکە کە مرۆڤ بە هۆیەوە دەتوانێ هەلومەرجی ئاسایش و ژیانێکی باشتر بخولقێنێ. لە ڕاستیدا دەوڵەت ناتوانێ ئامانجێکی لەمە بەرزتری هەبێت. بۆ گەیشتن بەم ئامانجە دەوڵەت دەبێ ڕێکوپێکی و یاسا زاڵ بکات و لە ڕێگای یاسا و ڕێکوپێکییەوە هەلومەرجی سەقامگیریی فەراهەم بکات. ماکیاڤیللی ئەم ئامانجە بە(ئازادی) ناودەبات. لە ڕوانگەی ماکیاڤیللییەوە ئازادی بریتییە لە ئاسایشی گیان، ماڵ و ئابڕوو لە ژێر سێبەری باڵادەستی یاسادا. ڕاستە ماکیاڤیللی ئامۆژگاری پاشا دەکات کە بە پەیمانی خەڵك دڵخۆش نەبێت و دڵ بەستەی پەیمانی خۆی نەبێت بەڵام ئەم وتەیە واتای ئەوە نییە کە حکوومەتی تاکڕەویی حکوومەتی خوازراوی ئەوە. کۆمەڵگا پاش تێپەڕاندنی قۆناغی ڕاگوزاریی، واتە تێپەڕبوون لە ڕەوشێك کە پاشا بۆ گەڕاندنەوەی ساخلەمی بۆ کۆمەڵگا دەستی بۆ ئەنجامدانی هەموو کارێك ئاوەڵایە، دەبێ بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی یاسا و ئازادی و ئاسایشی خەڵك گەرەنتی بکرێت. زۆرینەی خەڵك خوازیاری (ئازادی)ن (بە واتای ئاسایشی گیان و ماڵ و ئابڕوو) و تۆڵە لەو تاکڕەوانە دەکەنەوە کە (ئازادی) ئەوان لەبەرچاو ناگرن. لە ئەنجامدا پاشای نوێ دەبێ دەوڵەتەکەی خۆی بکاتە دەوڵەتی یاساگەراو خەڵکی خۆشی بکاتە هاووڵاتیانی ملکەچی یاسا.

## جۆرەکانی حکوومەت

ماکیاڤیللی لەسەر بنەمای دوو پێوەر حکوومەتەکان دەستەبەندی دەکات. پێوەری یەکەم لەسەر بنەمای ژمارەی دەسەڵاتدارانە. لەم گرووپەدا دەتوانین دوو جۆرە حکوومەت لە یەکتر جیابکەینەوە، یەکەم کۆماری و ئەویتر پاشایەتی. پاشایەتیش بۆ پاشایەتی سنووردار (وەك فەرەنسا)، پاشایەتی دیکتاتۆری





(توركيا) و تاكرەوى (سيراكوز) دابەش دەكرێت. كۆماريش دەتوانێ كۆمارييەكى جەماوەرى بێت وەك ئەسينا يا كۆمارييەكى هاوسەنگ بێت وەك كۆمارى رۆم. كۆمارى هاوسەنگيش بە نۆرەى خۆى دەتوانى ئاريستۆكراتى بێت وەك ڤينيسيا يا ديموكراتى بێت وەك رۆم. پێوەرێكى ديكەى ماكياڤيللى لە دەستەبەندى كردنى حكوومەتدا شێوازى بەدەستهێنان و پاراستنى دەسەلاتە كە رەنگە لەسەر بنەماى زێدەخوازى بێت وەك ئيمپراتۆرى رۆم يا گەندەڵى بێت وەك ڤينيسيا يا توانايى (ڤێرتۆ) وەك كۆمارى رۆم.

## چاكترين دەوڵەت

هەروەك ئاماژەى پێكرا، لە تيۆرى ماكياڤيللى باشترين دەوڵەت پەيوەندى بە هەلومەرج (كەرەستەى كۆمەڵايەتى)ەوە هەيە. باشترين حكوومەت، حكوومەتى كۆمارييە. بەڵام ناكرێت حكوومەتى كۆمارى لە هەر كۆمەڵگايەكدا بەرپا بكرێت. لە جێگايەكدا كە كۆمەڵگا هەلومەرجى شياوى بۆ كۆمارى نييە باشترين حكوومەت پاشايەتى سنووردارە. بەهەرحاڵ چ لە سيستەمى‌كۆمارى و چ لە پاشايەتى سنووردار حكوومەت دەبێ ژيان، ئابڕوو و ماڵى خەڵك لە هەر مەترسييەك بپارێزێت، دەبێ هەلومەرجى خۆشگوزەرانى گشتى فەراهەم بكات، پێش بە رازاوە پەرستى و كەڵەكەبوونى ماڵ و سامان لە دەست گرووپێكى كەم (تەنانەت بە بەهاى سەركوتككردنى دەست رۆيشتووەكان) بگرێت و هەلومەرجێكى وا بڕەخسێنێ كە هەر كەسێك بتوانێت بەپێى تواناى خۆى يارمەتى كۆمەڵگا بدات و كەڵكى لێوەربگرێت. ململانێى زۆرينە و كەمينە لە كۆمەڵگادا هەر هەيە، بەڵام دەكرێت لەم ململانێيە بۆ بەهێزكردنى (دەوڵەت) كەڵك وەربگرێت. بۆ وێنە دەكرێت لە سيستەم و ئۆرگانە تێكەڵەكان بۆ ئەم مەبەستە سوود وەربگيردرێت. ماكياڤيللى لەو باوەڕەدا بوو كە لە هەلومەرجى حكوومەتى ياسادا جەماوەرى خەڵك باشترين پشتيوانى سەقامگيريى و ئاسايشن.



بەم حاڵەش شيكردنەوەى ماكياڤيللى ئەوە بوو كە زۆربەى خەڵك پتر نيگەرانى (ئازادى) و ئاسايشى خۆيانن و لە حاڵەتى فەراهەم بوونى ئەم خواستە كەمتر نيگەرانى بەشداريكردنى ئەكتيڤن و قەناعەت بە پەيڕەويى كردن لە رێبەرانى باش و ياسا باشەكان دەكەن. بەهەرحاڵ هەرچەندە بەشداريكردنى خەڵك لە ياسادانانىدا شتێكى پێويست نييە، بەڵام رەزامەندى ئەوان بۆ ياسا مەرجێكى پێويستە بۆ كۆمەڵگايەكى ياسامەند و سەقامگير. ئايينيش يارمەتى سەقامگيربوونى كۆمەڵگا دەدات، بەڵام كەليسا بەو شێوازەى ئێستاى گەندەڵە و ناتوانێ خوازيارى جێگايەك بێت لە كۆمەڵگادا.

## يادداشتەكان


1- John Plamenatz, Man and Society, London, Longman, 2ed edition. 1992 P.XVI

2- Nigel Warburton et al, Reading Political philosophy, London, Rout ledge, 2000.

3- Isaiah Berlin, The proper study of Mankind, in Nigel warburton of cit pp.43.

4- Quentin skinner, Machiavelli, oxford University press, p.73.

5- Qoated from Maureen Ramsay in Nigel Warburton, of cit.

6- Janet coleman, A History of political Thought, Black well publisher, 2000, p.284






## پاژی -٢-

# تۆماس هۆبز

**Thomas Hobbes**

### گرێبەستی کۆمەڵایەتی وەك بنیاتی کۆمەڵگای سیاسی

### کورتەیەك دەربارەی ژیانی هۆبز

تۆماس هۆبز (١٥٨٨-١٦٧٩) کە بە یەکێك لە مەزنترین فەیلەسووفە سیاسییەکان دادەنرێت لە شاری وێست پۆرتی بریتانیا لە دایکبووە. باوکی قەشەیەکی بچووکی گەڕەکێك بوو کە توانای بەخێوکردنی منداڵەکەی نەبوو و هۆبز لە لای مامی کە پیاوێکی دەوڵەمەند بوو گەورە بووە. هۆبز قۆناغی سەرەتایی لە پێشدا لە قوتابخانەی کەلیسا و پاشان لە قوتابخانەیەکی تایبەتی تەواوکرد و سەرئەنجام خوێندنی خۆی لە ئۆکسفۆرد تەواوکرد. پاش کۆتایی هێنان بە خوێندن لە لای ئارستۆکراتێك بە ناوی کاوندیش بووە مامۆستای ماڵان و تا کۆتایی تەمەنی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەم بنەماڵەیەدا پاراست. لە دەیەی یەکەمی سەدەی حەڤدەهەمدا لەگەڵ ئەم بنەماڵەیە و کوڕەکەیان کە قوتابی هۆبز بوو لە ساڵەکانی (١٦٢١،١٦١٠ و١٦٢٥) سێ گەشتی بۆ ئەوروپای کیشوەری، فەرەنسا، ئیتالیا کرد. هۆبز لەم گەشتانەیدا چاوی بە زانایانی گەورەی ئەو سەردەمەی ئەورووپا کەوت وەك گالیلۆ، کوپلێر و هەروا بیکۆن، گاسندی و دیکارت. لەم گەشتانەدا هۆبز لەگەڵ ئەندازەی ئیستدلالی ئۆقلیدوس و ئەندێشەکانی مادەگەرایی



میکانیکی ئاشنا بوو کە هەریەك لەوانە کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر شێوازی کارو هزرەکانی ئەودا هەبووە.

بەرهەمەکانی هۆبز بریتین لە: وەرگێڕانی مێژووی توسیدید، توخمەکانی یاسا، دوسیوە (هاووڵاتی) و سەرئەنجام لڤیاتان[1] کە گەورەترین بەرهەمی ئەوە لە بواری فەلسەفەی سیاسییدا.

### * نەخشەی گشتی فەلسەفەی سیاسیی هۆبز

گرنگترین کتێبی هۆبز بە ناوی لڤیاتان پەیوەندی بە چۆنێتی شکڵ گرتنی کۆمەڵگای مەدەنییەوە هەیە لەسەر بنەمای هەڵسوکەوتی ئاوەزیانەی تاکی مرۆیی. هۆبز لەم کتێبەدا سەرەتا لە هەلومەرجی پێویست بۆ ئارامی و ئاسایش دەکۆڵێتەوە و پاشان بەگرێبەستی کۆمەڵایەتی و دروستکردنی دەوڵەتی ئیدیال بۆ ئەم هەلومەرجە خەریك دەبێ. واتای سەرەکی تیۆری هۆبز مافی سروشتییە لە جیاتی یاسای سروشتی کە لە تیۆرییەکانی هزرڤانانی کۆندا هەبووە و ئێمە لە بەرگی یەکەمدا باسمان لێوەکردووە. لە بنەڕەتدا مافی سروشتی لە روانگەی هۆبزەوە بریتییە لە مافی پاراستنی گیان. کۆمەڵگای سیاسی بۆ دروستبوونی دەسەڵاتێك پێکدێت کە تێیدا مافی پاراستنی گیان و یاسای سروشتی پارێزراو بێت. دەتوانین بەڵگە هێنانەوەی هۆبز بەم جۆرەی خوارەوە کورت بکەینەوە. بناغەی دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسی دروستکردنی هەلومەرجێکە کە تێیدا یاسای سروشتی لە لایەن هەموانەوە پەیڕەو بکرێت و مافی سەرەتایی و سروشتی پاراستنی گیان پارێزراو بێت. ئەم هەلومەرجەش تەنیا بە دروستبوونی کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت دێتەدی. لە هەلومەرجێکدا کە کۆمەڵگای مەدەنی نەبێت (رەوشی سروشتی) زاڵ دەبێت کە تێیدا تاکەکان بە شێوەیەکی هەمیشەیی گومانی خراپیان بەرامبەر بەیەکتر هەیە و کەس لە گیان و ماڵی خۆی دڵنیا نییە. لە هەلومەرجێکی وەهادا هەموو کەسێك بۆ بەرزکردنەوەی رادەی ئاسایشی خۆی،





هەوڵدەدات دەسەڵاتی خۆی زیاتر بکات. چونکە دەسەڵات شتێکی ڕێژەییە و لە پەیوەندی لەگەڵ کەسانی دیکەدا هەڵدەسەنگێندرێت و لە حاڵەتێکی وادا ململانێیەکی بێکۆتایی دروست دەبێت. بەڵام ئەم ململانێ بێکۆتاییە بە قازانجی کەس نییە و لە ئەنجامدا تەگەرە دەخاتە بەردەم هەمان مافی سروشتی پاراستنی گیان. کە وابوو دەبێ ئەم ڕەوشە سروشتییەش تەنیا بە گرێبەستێکی کۆمەڵایەتی کۆتایی پێ بهێنرێت. ئەم گرێبەستە کۆمەڵایەتییە کۆتایی بە جەنگی هەمووان دژبە هەمووان دەهێنێ. ئەم گرێبەستە بەم جۆرە دروست دەبێ کە هەرکەسێك لەگەڵ هەموو کەسانی تردا پەیمان دەبەستێ کە هەموو مافی دادوەریکردن دەربارەی پاراستنی گیانی خۆی و دروستکردنی هەلومەرجی پێویست بۆ ئارامی و ئاسایش بە تاك یا کۆمەڵێك لە تاکە سێهەمەکان بسپێرێت. بەم جۆرەیە کە دەسەڵاتدارییەك سەرهەڵدەدات کە هۆبز بە سیفەتی لڤیاتان ناوی دەبات.

لەم وێنە گشتییەی تیۆری هۆبز لەمەڕ چۆنێتی سەرهەڵدانی دەسەڵاتداریێتی سیاسی و کۆمەڵگای مەدەنی هەندێ چەمکی وەك ڕەوشی سروشتی، گرێبەستی کۆمەڵایەتی و ڕەوشی مەدەنی بە چەمکی کلیلئاسا لە قەڵەم دەردێن کە لە باسەکانی داهاتوودا پتر باسیان لێوەدەکەین.

## ١- شێواز و تێڕوانینی هۆبز لە تۆژینەوە سیاسییەکاندا

### بنیاتەکانی هزری سیاسیی مۆدێرن

سەدەی حەڤدەهەم سەدەی گەشەکردنی زانست بوو و زانایان لە هەموو بوارە زانستییەکاندا بۆ کردنەوەی دەرگا بەسەر سنوورە نوێیەکان و هەڵسەنگاندنی هەموو شتێك لەسەر بنەمای عەقڵ زۆر بە چڕی لە هەوڵدابوون. لە هەلومەرجێکی وەهادا هۆبز هەوڵی خۆی دەستپێکرد بۆ ڕاڤەکردنی هۆکارەکانی بوونی کۆمەڵگای سیاسی لەسەر بنەمایەکی عەقڵی. هۆبز بەدوای ئەوەدا بوو کە بەبێ پشتبەستن بە باوەڕە میتافیزیکییەکان بە دوای سەرچاوەی کۆمەڵگای



سیاسییدا بگەڕێت. هەروەك بینیمان بەر لە چەرخی ڕێنسانس و بەر لە ماکیاڤیللی بوونی سیستەمی سیاسی و دەوڵەتیان، یان لەسەر بنەمای یاسای سروشتی ڕاڤە دەکرد (لە ئەفلاتوونەوە تا هەیوانییەکان و تەنانەت ئەکویناس) یا لەسەر بنەمای ویستی خوداوەندی (سێنت ئاگۆستین و شوێنکەوتووە هزرییەکانی ئەو). هۆبز کە ڕۆڵەی ڕێنسانس، هیومانیزم و زانستگەرایی چەرخی نوێ بوو دەیویست بۆچیەتی و چۆنیەتی سیستەمی سیاسی لەسەر بنەمای هەڵسوکەوتی عەقلانیی مرۆڤ شیبکاتەوە.

هۆبز لە هەمانکاتدا ڕۆڵەی سەردەمێك بوو کە دەیویست هەموو زانستی نوێ لەسەر بنەمای بیرکاری و لەسەر بناغەی ئەو وردەکارییە بنیات بنێت کە شایستەی بیرکارییە. گالیلۆ و دیکارت، لە ناودارانی زانستی نوێ، دەیانویست هەموو شتێك بۆ زانستی بیرکاری بگەڕێننەوە. هۆبزیش کە دەیویست زانستی سیاسەت بە وردبینی بیرکاری پشت ئەستووربکات شێوازی هەڵێنجانی باو لە ئەندازەی بۆ تۆژینەوەکانی خۆی گرتەبەر. ئەم دەیویست بۆ ڕاڤەکردنی سیستەمی سیاسی تیۆرییەکی مەزن بنیات بنێت کە لە ڕووی شێواز، بەهای زانستی و ڕوون بوونی باسەکە لەگەڵ تیۆری گالیلۆ لەمەڕ تەنە ماددییەکاندا بە تەواوی گونجاو بێت.

هۆبز بۆ شێوازی هەڵێنجان و شیکاریی خۆی سەرەتا کۆمەڵگای سیستماتیك وەك گشتێك بەسەر بەشە سەرەتاییەکاندا دابەشدەکات و ئینجا بە دەستپێکردن لە سادەترین بەشەوە هەنگاو بە هەنگاو بەرەو گشتێکی ئاڵۆز هەنگاو دەنێت. هۆبز بەشیکردنەوەی کۆمەڵگا بەسەر بەشەکانی خۆیدا گەیشتە تاك و پاشان سروشتی تاکی شیکردەوە و گەیشتە ئارەزوو و عەقڵ. لە ڕوانگەی هۆبزەوە عەقڵ لە خزمەتی ئارەزوودایە. لە لایەکیترەوە سادەترین و سەلماوترین ئارەزووی مرۆڤ پاراستنی گیانە. لە هەلومەرجێکدا کە سیستەمی سیاسی بوونی نییە گەڕان بە دوای ئەم ئارەزوودا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ڕەوشی جەنگی هەمووان دژ بە هەمووان. بەڵام جەنگی هەمووان دژ بە هەمووان لەگەڵ خواستی پاراستنی گیان

لە دژایەتیدایە. لێرەدایە کە عەقڵ دێتە یارمەتی ئارەزوو و ڕێگای گرێبەستی کۆمەڵاتی و بە سپاردنی ئاسایش بە دەسەڵاتێکی ناوەندی پێ نیشان دەدات. بە گشتی زانایانی سەدەی حەڤدەهەم سیستەمی جیهانیان بە ماشێن دەچواند و دەیانویست لەسەر شێوازی ماشێن کارەکەی روونبکەنەوە.[٢] هۆبزیش دەیویست لەسەر شێوازی ماشێن سیستەمی سیاسی و دەوڵەت شیبکاتەوە.

### * دەوڵەت وەك دەستکردێکی مرۆیی

بە گشتی بەر لە چەرخی ڕێنسانس دەوڵەتیان بەشتێکی سروشتی لە قەڵەم دەدا نەك بەشتێکی دەستکرد. هەڵبەت ژمارەیەك لە سۆفیستاییەکان و بەتایبەت ئیپیکۆرییەکان ئەم هزرەیان خستبووە روو کە کۆمەڵگای سیاسی یا دەڵەوت ئامادەکارییەکی مرۆییە، بەڵام ئەوان نەیانتوانیبوو ئەم هزرە بکەنە تیۆرییەك و لە چوارچێوەیەکی تیۆری ڕێکوپێکدا ڕاڤەی بکەن و بیخەنە روو. ماکیاڤێلیش کە بوونی دەوڵەتی لە چوارچێوەیەکی هیومانیستی و عورفیگەرا (سکۆلار) داخستبووە بەر لێکۆڵینەوە نەیتوانیبوو لەم بارەیەوە تیۆرییەکی بەڵگەدار دابڕێژێت. هۆبز یەکەمین بیرمەندی سیاسی بوو کە بە شێوەیەکی تێروتەسەل و لە چوارچێوەی تیۆرییەکی ڕێکوپێکدا دەوڵەتی وەك دەزگا یا ماشینێك خستەبەر شیکردنەوە.

هۆبز جگە لەوەی کە دەوڵەتی بە دەستکردی مرۆڤ لە قەڵەمدا لە هەمانکاتدا لەسەر ئەم شێوازە ڕۆیشت کە مرۆڤ، دەوڵەتی لەسەر بنەمای مۆدیل هەڵگرتنەوە لە جێگایەك یا بە پشت بەستن بە عەقڵێك لە دەرەوەی عەقڵی مرۆڤ دروست نەکردووە. هۆبز دەیویست دەوڵەت وەك دەزگایەك شیبکاتەوە کە خاوەن پاساوێکی عەقڵانییە و تاکەکان دەبێ نەك بە شێوازێکی شەرمنانە بەڵکو بە شێوازێکی چالاك ملکەچی بن و ئەم ملکەچییەش بە عاقڵانە بزانن.



تیۆری دەوڵەت وەك دەستکردی مرۆڤ لە بەرامبەر تیۆری ئۆرگانیکی دەوڵەتدا رادەوەستێ. لە تیۆری ئۆرگانیکی، دەوڵەت و کۆمەڵگای سیستماتیك وەك گشتێکی ئۆرگانێك لە قەڵەم دەدرێن کە لە غەریزەی کۆمەڵایەتی مرۆڤەوە سەرچاوەیان گرتووە. لە تیۆری ئۆرگانیکی، دەوڵەت ماشین یا ئامێرێك نییە کە مرۆڤ بە ویستی ئاگایانەی خۆی دروستی کردبێت.

### * دەوڵەت وەك بەرهەمی هاوکاری تاکەکان

ئەم تێڕوانینە کە دەوڵەت بە بەرهەمی دەستکردی مرۆڤ دەژمێرێت لە هزری هیومانیزمەوە سەرچاوەی گرتووە کە لەمەوپێش ئاماژەمان پێکرد. بەپێی ئەم هزرە مرۆڤ بەسەر چارەنووسی خۆیدا زاڵە و دەتوانێ لەسەر بنەمای عەقڵی مرۆیی کۆمەڵگای خۆی ڕێکبخات. بە پەسندکردنی ئەم بیروباوەڕە هەندێ پرسیاری لەم جۆرە دێنەئاراوە: مرۆڤ بە چ شێوەیەك دەتوانێ دەوڵەتێکی لەم جۆرە دروستبکات و بۆچی دەبێ ئەم دەوڵەتە دروستبکات؟ تاکەکانی مرۆڤ دروستکردنی چ جۆرە دەوڵەتێك بە باشتر دەزانن؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە ئەمەیە کە دەوڵەت دەبێ دەرەنجامی ڕێککەوتنی نێوان تاکەکان بێت. لە ئەنجامی ئەم ڕێککەوتنەیە کە سیستەم و یاسا سەرهەڵدەدات. بەڵام ئەم دەوڵەتە خاوەنی دەسەڵاتێکە سەرووتر لە دەسەڵاتی تاکەکان.

تێڕوانینی هۆبز بۆ سیستەمی سیاسی یا دەوڵەت وەك بەرهەمی ویست و دەستکردی مرۆڤ بە شێوەیەکی لۆژیکی دەگاتە ئەم بڕیارە کە دەوڵەت بە ڕەزامەندی تاکەکان بنیات نراوە. کە وابوو دەوڵەت نە دیاردەیەکە کە لە ویستێکی سەرووترەوە سەرچاوەی گرتبێ و پێشەکی مۆدیلێکی تایبەتی بۆ دیاری کرابێت و نەگشتێکی ئۆرگانیکە لە دەرەوەی ویستی تاکەکان کە بەپێی سیستەمێکی تایبەتی لە کاروبارو پلەکانی فەرماندەیی و فەرمانبەرییەوە سەری هەڵدابێت. دەوڵەت بەرهەمی هاوکاری، ڕەزامەندی و گرێبەستە.





## ٢- بەشە سەرەکییەکانی تیۆری سیاسیی هۆبز

### ڕەوشی سروشتی

گوتمان هۆبز دەیەوێ عەقلانییەت واتا چۆنیەتی و بۆچیەتی کۆمەڵگای سیاسی (دەوڵەت لە واتا گشتییەکەیدا) ڕاڤە بکات. هەروا گوتمان کە بۆ گەیشتن بەم مەبەستە، بە شێوازی هەڵێنجان کە لەسەردەمی خۆیدا باوبووە، کۆمەڵگا وەك گشتێکی لێکدراو بەسەر بەشەکانیدا شیدەکاتەوە تا دەگاتە بچووکترین بەشەکەی. هۆبز دەڵێ ئەگەر شیکاری کۆمەڵگای سیاسی بکەین دەگەینە تاکە پەراکەندەکان، ئەو کەسانەی کە هەریەکەیان بە شێوەیەکی تاك بۆ ئاسایشی خۆیان هەوڵ دەدەن. هۆبز بە پێی دیدگای نۆمینالیستی (ناوگەرایی) مرۆڤەکان بە بوونەوەرێك دەزانێ کە هەریەکەیان جیهانێکی زەینی تایبەت بە خۆیان هەیە و ناتوانن بڕۆنە ناو جیهانی زەینی کەسێکی ترەوە. هەر بۆیە بوونەوەرگەلێکی خۆخۆاز (یا بە دەربڕینێك کە ڕەنگە هەندێك لە تێگەیشتنی هۆبزەوە دووربێت) خۆپەرستن. کە وابوو لە هەلومەرجێکدا کە ڕێکوپێکی هاوبەش دروست نەبووە سەرهەڵدانی بەدگومانی لە نێوان تاکەکاندا شتێکی حەتمییە. هۆبز ئەم هەلومەرجە بە (ڕەوشی سروشتی) ناودەبات. (ڕەوشی سروشتی) زاراوەیەکە لە بەرامبەر (ڕەوشی مەدەنی). ڕەوشی مەدەنی بەو هەلومەرجە دەگوترێ کە ڕێکوپێکی هاوبەش شکڵی گرتووە و دەوڵەت دروست بووە.

(ڕەوشی سروشتی) لە ڕوانگەی هۆبزەوە بریتییە لە بارودۆخی بەدگومانی، ڕکابەری بێکۆتایی بۆ دەسەڵات و ترس لە مەرگی ناسروشتی.

لە ڕەوشێکی وەهادا ئارامی و ئاسایش بوونی نییە و شارستانیەت ناتوانێ سەرهەڵبدات. پێویستە جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە ڕەوشی سروشتی، ڕەوشێکی گریمانەییە نەك ڕەوشی مێژوویی (واتە ڕەوشێك کە لە قۆناغێك لە مێژووی مرۆڤدا بە ڕاستی بوونی هەبووە). هەروەك گوتمان هۆبز بەپێی شێوازی



خۆی بە شیکاریکردنی کۆمەڵگای سیاسی وەك گشتێك و بەسەرنجدان بە دەروونناسی تاك ئەمەی وەك چەمکێکی زانستی هەڵێنجاوە.

### * گرێبەستی کۆمەڵایەتی

گرێبەستی کۆمەڵایەتی یەکێك لەو چەمکە گرنگانەیە کە هۆبز لە فەلسەفەکەی خۆیدا خستوویەتە ڕوو. گرێبەستی کۆمەڵایەتی وەك بناغە و پەیڕەوی ناوخۆی پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی سیاسییە، ئەم زاراوەیە و تیۆرییە پەیوەندیدارەکەی ئێستاش لەناو هزرڤانە سیاسییە گەورەکاندا لایەنگری هەیە و بنیاتی گەلێك لە تیۆرییە سیاسییە جۆراو جۆرەکان دەربارەی شێوازی ئیدیالی ڕێکخستنی کۆمەڵگای سیاسی. زاراوەی (گرێبەستی کۆمەڵایەتی)یش چەمکێکی گریمانەییە بۆ ئاماژەکردن بە پەیمانێك کە مرۆڤەکان بۆ دەرچوون لە ڕەوشی جەنگ (کە لە ڕەوشی سروشتیدا زاڵە) لەگەڵ یەکتردا دەیبەستن. بەگرێبەستی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت هاوکات و لەیەك جێگادا دروست دەبن. ئەگەر مافی پاراستنی خود و ئارەزووی پاراستنی خود هۆکاری دووری پێکهێنانی دەوڵەت بێت، ئەوا گرێبەستی کۆمەڵایەتی هۆکاری نزیکیەتی.

تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتی وەك بناغە و سەرچاوەی دەوڵەت لە بەرامبەر تیۆری مافی خودایی پاشاکاندا ڕادەوستێ کە ئەم تیۆرییە لە سەردەمی هۆبزدا تیۆری پاشایەتییە ڕەهاکانی ئەوروپا بووە کە لە سەدەکانی ١٦و١٧زایینی بەسەر ئەم ناوچەیەدا زاڵبوون. ئەم تیۆرییە هەروا لە بەرامبەر تیۆری سروشتی بوونی سەرچاوەی دەوڵەتدا ڕادەوستێ کە لە یۆنانی کۆن و ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاستدا باوبووە. ئەم تیۆرییە لە ناوەڕۆکدا تیۆرییەکی شۆڕشگێڕانەیە چونکە ڕەوابوونی حکوومەت بە ڕەزامەندی و ڕێککەوتنی خەڵکەوە گرێ دەدات. پاش هۆبز هەندێ تێگەیشتنی نوێ لەمەڕ گرێبەستی کۆمەڵایەتی پەیدابوون، بەڵام بەپێی تیۆری هۆبز گرێبەستی کۆمەڵایەتی بەم جۆرەیە کە هەر کەسێك لەگەڵ ئەویتردا پەیمان

دەبەستێ کە مافی حکوومەت کردن لەسەر خۆی بە تاك یا کۆمەڵەیەك بسپێرێت و ئەو دەسەڵاتەی پێبدات کە دادوەریکردن لەمەڕ ئاسایشی تاکەکان ئەنجام بدات. بەم پەیمانە تاکەکان مافی خۆیان بۆ پاراستنی ئاسایشی خۆیان بۆ کەس یا دەستەیەکی سێهەم دەگوازنەوە.

### * ڕەوشی مەدەنی

بەم گرێبەستە کە لە ڕاستیدا گرێبەستی گواستنەوەی مافەکانە، هاوکات دەسەڵاتداری سیاسی و کۆمەڵگای سیاسی دروستدەبن. بەم جۆرە ڕەوشی جەنگ کۆتایی پێدێت و لەمە بەدوا دەسەڵاتدار بەزەبری شمشێر پاسەوانی لەم پەیمانە دەکات. کاتێك کە حکوومەت دامەزرا ترس لە مەرگی ناسروشتی دەبێتە ترس لە حکوومەت. ئێستا ئیدی ئارەزووی پاراستنی خود دەتوانێ ئاستێکی بەربلاو تر بە خۆیەوە بگرێت و بەرەو پاڵنەری پاراستنی ئارامی و بەرزترکردنەوەی هەلومەرجی ژیانێکی باشتر گەشەبکات.

### * جۆری حکوومەت

بەگرێبەستی کۆمەڵایەتی چ جۆرە حکوومەتێك دروستدەبێت ؟ هۆبز لایەنگری پاشایەتی بوو و سیستەمی پاشایەتی زیاتر پەسند دەکرد، چونکە دەبووە هۆی یەکگرتوویەکی کارامەتر. بەڵام گرێبەستی کۆمەڵایەتی دەتوانێ هەریەك لە حکوومەتەکانی پاشایەتی، ئاریستۆکراسی یا دیموکراسی بنیات بنێت. فۆرمی حکوومەت بەستراوەتەوە بە توانای ئەو حکوومەتە بۆ پاراستنی ئاسایش و دابینکردنی ئاشتی و ئارامی. گرێبەستی کۆمەڵایەتی هۆبز جۆرێکە لە حکوومەتی ڕەها، چونکە دەسەڵاتدار لایەنێك نییە لە گرێبەستەکەداو خەڵك ناتوانن لە سنووردارکردنی دەسەڵاتداردا پابەندی هەندێك مەرجی بکەن. تاکەکان هەر دوابەدوای بەستنی گرێبەست دەبنە هاووڵاتی. لە تیۆری هۆبز سپاردنی



دەسەڵاتدارێتی مەرجدار نییە و لە بنەڕەتیشدا ناتوانێ مەرجداربێت. پاش دامەزراندنی دەسەڵاتدارێتی، فەرمانی دەسەڵاتدار وەك یاسایە. بەم حاڵەش دەتوانین بڵێین ئەو شتەی کە بە هۆی گرێبەست و دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنییەوە دروست دەبێت، ڕەهایی دەسەڵاتدارێتییە نەك دەسەڵاتدارێتی ڕەها.

ئەو شتەی کە ڕەهایە لە ڕاستیدا خودی پرەنسیپی (دەسەڵاتدارێتی)یە. دەسەڵاتدارێتییە کە دەتوانێ هەموو یاسایەك دابنێت. بەڵام ڕەها بوونی پرەنسیپی دەسەڵاتدارێتی، بەپێچەوانەی وتەیەکی ڕاشکاوانەی هۆبز، ناتوانێ بە شێوەیەکی لۆژیکی بە واتای ڕەها بوونی حکوومەت بێت.

بۆ ڕەها بوونی دەسەڵاتدارێتی پێویستە کەلیسا ملکەچی دەوڵەت بێت. دەسەڵاتدارێتی هەموو ئەو شتانەی کە بۆ دابینکردنی ئاشتی و ئارامی کۆمەڵگا پێویستە و لەوانەش ئایینەکان و بیروباوەڕەکان دەخاتە ژێر چاودێری خۆیەوە. هەر لەبەر ئەمەیە کە هۆبز دەسەڵاتدار بە لڤیاتان (خودای زەمینی) ناودەبات.

### * ئازادیی هاووڵاتیان

هەموو ئەو شتانەی کە تاکەکان لە کاتی گرێبەستدا بە دەسەڵاتداریان نەسپاردووە بۆ خۆیانی دەپارێزن. ئەو شتەی کە تاکەکان بە دەسەڵاتداریان سپاردووە سەقامگیرکردنی هەلومەرجی ئاشتی و ئارامی و ئاسایشە. کە وابوو هاووڵاتیان لە کاروباری تایبەتی خۆیان لەوانەش چالاکی ئابووری مامەڵەکردن، هەڵبژاردنی پیشە، شوێنی نیشتەجێ بوون و شێوەی ژیانی خۆیان ئازادن. خەڵك دەسەڵاتی گیانی خۆیانیان بە دەسەڵاتدار نەسپاردووە. جگە لەمەش هەرکاتێك کە دەسەڵاتدار نەتوانێ گەرەنتی پاراستنی ئاشتی و ئارامی و پاسەوانی کردنی هاووڵاتیانی بکات ئەوا ئەرکی ملکەچبوون بەرامبەر بە دەسەڵاتدار لەناو دەچێت.

دەسەڵاتدار یا لڤیاتان ناکۆکییەکی تایبەتی لەگەڵ ئازادیدا نییە. زەین و ویژدانی تاکەکان لە دەرەوەی دەسەڵاتی دەسەڵاتدارە. دەسەڵاتدار دەست لە بیروباوەڕی تایبەتی وەرنادات. کەوابوو لە تیۆری هۆبزدا دەسەڵاتدار ناتوانێ دەسەڵاتدارێکی پاوانخوازبێت.

## ٣- هەڵسەنگاندن و پشکنینی تیۆری هۆبز

### ڕەها بوونی دەسەڵاتدارێتی یا ڕەها بوونی دەسەڵاتدار؟

تیۆری هۆبز لەمەڕ دەوڵەت شمشێرێکی دوودەمە. هەم دەتوانین پاساوی حکوومەتی دەسەڵاتگەرای پێبکەین و هەم دژ بەم حکوومەتە بە کاری بهێنین. لە ڕاستیدا خودی هۆبزیش دەیزانی شمشێرێکی دوودەمی خولقاندووە.[٣] هۆبز دەڵێ کاتێك کە تاکەکان هاوکات مافی سروشتی خۆیان بە دەسەڵاتدار دەسپێرن دەبنە (تاك)ێکی یەکبوو. دەتوانین ئەم بڕیارە هەم دژ بە دەسەڵاتدار بە کاربهێنین بۆ بەرگریکردن لە مافی هاوولاتیان و هەم دژ بە هاوولاتیان بە کاری بهێنین بۆ بەرزکردنەوەی دەسەڵاتی دەسەڵاتدار، هەر بۆیە هەم لایەنگرانی پاشایەتی و هەم شۆڕشگێران هەردووکیان بایەخیان بە بیروبۆچوونەکانی هۆبز داوە. ئەو ڕەخنەیەی کە لە گرێبەستی کۆمەڵایەتی تیۆری هۆبز گیراوە ئەوەیە کە ئەم گرێبەستەی بێمەرجە و هەڵناوەشێنرێتەوە. ئەم گرێبەستە لە ڕاستیدا دەبێتە گرێبەستی خۆبەدەستەوەدان. ڕەخنەگران دەپرسن ئێستا کە لەسەر بنەمای گرێبەست، دەوڵەت و حکوومەت دادەمەزرێنین ئەی بۆچی نەتوانین هەر لەسەر ئەم بنەمایە حکوومەت سنووردار بکەین. بۆچی دەبێ تاکەکان ملکەچی گرێبەستێك بن کە بۆ یەکجار و بۆ هەمیشە حکوومەت بە دەسەڵاتدارێك بسپێرن کە هەتا هەتایە بەسەریاندا فەرمانڕەوایی بکات. ئەم ڕەخنەگرانە دەڵێن ئەم گرێبەستە دەبێتە هۆی دروستبوونی ڕەوشێکی پارادۆکس ئامێز. چونکە کاتێك کە تاکەکان هەموو دەسەڵاتەکانی خۆیان بۆ



دەسەڵاتدار دەگوازنەوە ئیدی لە ڕاستیدا سەربەخۆیی خۆیان لە دەستدەدەن و ناتوانن وەك بوونەوەرگەلێکی سەربەخۆ بوونیان هەبێت.[٤]

ڕەخنەیەکی تر کە لەم بارەیەوە دەگیرێت ئەمەیە کە ئەگەر تاکەکان بە مەبەستی پاراستنی گیانی خۆیان هەڵدەستن بە ئەنجامدانی گرێبەست و دامەزراندنی دەوڵەت بۆچی دەبێ بە دەست بەستراوەیی خۆیان تەسلیم بە دەسەڵاتدار بکەن؟ ئایا باشتر نییە کە هێزێکی دەسەڵاتداری وا بخولقێنن کە لە بەرامبەریدا هەندێك ماف بۆ خۆشیان دیاری بکەن؟[٥]

لە ڕاوڵەتدا هۆبز ئەم شتەی بە مەیسەر نەزانیوە. بەپێی بەڵگەهێنانەوەی ئەو هەر ڕێککەوتنێك لەمەڕ سنووردارکردنی دەسەڵاتی دەسەڵاتدار تەنیا لە گریمانەیەکی ئابستراکت شیاوی وێناکردنە نەك لە کرداردا. لە جیهانی واقیعیدا هەر کە بمانەوێ ئەم سنووربەندییانە بەکار بهێنین ڕاڤە و لێکدانەوە جۆراوجۆرەکان دێنە ئاراوەوە و هەزاران ناکۆکی سەرهەڵدەدەن. ئینجا پێویست بە مەرجەعێکی سێهەم دەکات. چونکە تا کاتێك کە چارەنووسی ڕاڤەکردنەکان دیاری نەکراوە ئاشتی و ئاسایش دەکەوێتە بەر هەڕەشە. بەڵام هەرکە مەرجەعێك بۆ دادوەریکردن دەربارەی ڕاڤەکردنەکان دیاریکرا لە ڕاستیدا ئەم مەرجەعە هەر دەسەڵاتدار دەبێت.[٦]

### * یەکبوونی دەسەڵاتدارێتی و دەسەڵاتدارێتی یاسا

ئەم مەتەڵە لە سەردەمی هۆبزیشدا هەبووە و هێشتا لە هزری سیاسی ئەو سەردەمەدا ڕێگا چارەیەکی بۆ نەدۆزرابووەوە. ئەم مەتەڵە پاشان بەسەرهەڵدانی بیروبۆچوونی دەسەڵاتدارێتی یاسا چارەسەرکرا. بەپێی بۆچوونی دەسەڵاتدارێتی یاسا دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان دامەزراوە جۆراوجۆرەکاندا دژایەتی لەگەڵ یەکبوونی دەسەڵاتداریدا (پرەنسیپی یەکێتی دەسەڵاتدارێتی) نییە. ئەمڕۆ ئەم پرەنسیپە پەسندکراوە کە دەسەڵات دەبێ لە نێوان ئەنجومەنی یاسادانان و دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن و دیوانی باڵای دادوەریدا دابەش بکرێت. ئەم سێ دەسەڵاتە





وێڕای ئەوەی کە یەکتری سنووردار دەکەن لە هەمانکاتدا هیچ کامیان بەبێ مۆڵەتی  دوو دەسەڵاتەکەی تر دەسەڵاتیان نییە. ئەم کارەش بەم شێوازە مەیسەر کراوە کە هەریەك لەم سێ دەسەڵاتە بەبێ ئەو پرەنسیپانەی کە لە دەستووردا هاتوون دەسەڵاتیان پێ دراوە. دەستوور چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی هەر سێ دەسەڵات و ئەو ڕێگاچارانەی دەستنیشان کردووە کە لە حاڵەتی ڕوودانی هەر ناکۆکییەك سەرهەڵدەدەن. ئەوان بەپێی دەستوور دەسەڵاتی دیاریکراویان هەیە و هەر یەکەیان لە ملکەچبوون بەرامبەر بە یاسا و دەسەڵاتدارێتی یاسا هەمان ئەو قازانجەیان هەیە کە لە تیۆری هۆبزدا هاوولاتیان لە ملکەچبوون بەرامبەر بە دەسەڵاتدار هەیانە.

### * پێگەی عەقڵ لە تیۆری هۆبزدا

هەروەك گوترا عەقڵ لە تیۆری هۆبزدا دەبێتە هۆی ئەوە کە مرۆڤ لە بارودۆخی سروشتی دەربچێت و بگاتە بارودۆخی مەدەنی و عەقڵ لێرەدا لە خزمەتی حەزوو ئارەزووەکاندایە و باشترین ڕێگای تێرکردنی ئەوان پیشان دەدات. عەقڵ بەندەکانی ئاشتی بۆ گرێبەستی کۆمەڵایەتی و دەرچوون لە ڕەوشی جەنگ پێشنیار دەکات. هەتا حەز بۆ ئارامی و ئاسایش زیاتر نەبێت عەقڵ ناتوانێ ڕێگای ئاشتی پیشان بدات و دۆخی ئاشتی سەقامگیر بکات.

لەم بارەیەشەوە ئەم ڕەخنەیە لە هۆبز گیراوە کە لە جێگایەکدا ڕۆڵی عەقڵی بە کەم بایەخ و لە جێگایەکی تردا بە پڕ بایەخ لەبەرچاوگیراوە. ڕەخنەگران دەڵێن ئەمە هەڵەیە کە عەقڵ بخەینە خزمەتی حەز و شەهوەتەکان و بە کۆیلەی هەندێ ئامانجی لە قەڵەم بدەین، نەك بە دیاریکەر یا مۆڵەتدەری ئامانجەکان. ئەم ڕەخنەگرانە دەڵێن کە هۆبز هەندێ جار وا قسەدەکات کە دەڵێی ئەگەر مرۆڤ بوونەوەرێکی عەقڵانی نەبوایە هەر دیسان خاوەنی ئەو حەزو ئارەزووانە دەبوو. لە کاتێکدا کە مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی خاوەن عەقڵ هەندێ حەزو ئارەزووی هەیە کە ئەگەر



خاوەنی نەبوایە ئەم حەزو ئارەزووانەی نەدەبوو. لە ڕێگای عەقڵەوەیە کە مرۆڤ هەندێ وێنای دەربارەی خۆی و ژینگەی خۆی و پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەوانیتردا هەیە. ئەم وێنایانەش بە نۆرەی خۆیان کاریگەریی هەمەلایەنەیان لەسەر سۆز و ئارەزووەکانیدا هەیە.[٧]

ڕاستییەکەی ئەمەیە کە هۆبز عەقڵی بە شوێنکەوتووی ئارەزووەکان داناوە، بەڵام کاتێك کە عەقڵ دەکەوێتە خزمەتی بە هێزترین ئارەزووەکانی مرۆڤ واتە ئارەزووی پاراستنی گیان ئەوا دەبێتە بە هێزترین توخمی ژیان و سیستەمگەلێکی نوێ بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی دەخوڵقێنێ.

### * بایەخی هزری سیاسیی هۆبز

هۆبز بە یەکێك لە گەورەترین فەیلەسووفە سیاسییەکان و بە بنیاتنەری فەلسەفەی سیاسیی نوێ دادەنرێت. بەشێکی زۆر لە فەلسەفەی سیاسیی مۆدێرن لە ژێر کاریگەری بیروبۆچوونەکانی ئەودان. چەندین وەچە لە هزرڤانانی پاش ئەو هزرەکانی ئەویان کردە سەرچاوەیەك بۆ هەڵێنجانی تیۆری نوێ. ئەو یەکەمین بیرمەند بوو کە ئەفسوونی دەوڵەتی هەڵوەشاندەوە و وەك ماشێنێك چاوی لێکرد. ئەم تێڕوانینە و بیروبۆچوونی گرێبەستی کۆمەڵایەتی ئەو ڕۆڵێکی گەورەیان لە مێژووی هزری رامیارییدا هەبووە.

هۆبز بنیاتنەری زنجیرەیەکی دوور و درێژە لەو ئەندێشانەی کە بە شێوازە جۆراوجۆرەکان لەگەڵ لیبرالیزم لە پەیوەندیدان و ئێمە لە پاژەکانی داهاتوو زیاتر لەگەڵیاندا ئاشنا دەبین. بەو هۆیە هۆبز بە دامەزرێنەری لیبرالیزم لە هزری سیاسی دەزانین چونکە ئەو وێڕای خستنە ڕووی تیۆری دەستکردبوونی دەوڵەت بۆ یەکەمجار مافی تاکی لە پێشەوەی ئەرکی ئەو دانا و ئەرکی سیاسی تاکی لە مافی ئەو (مافی سروشتی پاراستنی گیان) هەڵێنجاند. زانایانی پێشوو هەمیشە ئەرکی تاکیان لە پێشەوە دادەنا و مافی ئەویان لە ئەرکەکەی هەڵدەهێنجاند. هۆبز ئەم

هاوکێشەیەی پێچەوانە کردەوە و مافی کردە بنەمای دامەزراندنی دەوڵەت و لە تیۆری سیاسی خۆیدا ئەرکی بە سەرچاوەگرتوو لە ماف و لە پاش ماف دانا.[٨] و ئەمەش شۆڕشێك بوو لە هزری سیاسییدا.

هۆبز بە هەموو هێزی خۆیەوە هەوڵیدا کە فەلسەفەی سیاسی لەسەر پێی خۆی رابوەستێ و لە تیۆرییە میتافیزیکییەکان دەربارەی دەوڵەت رزگاری بکات. هەر لەسەر ئەم بناغەیە بوو کە ئەو هەوڵیدا فەلسەفەی سیاسی لەسەر بنەمای دەروونناسی مرۆڤ و تێڕوانینی میکانیکی دەربارەی بزاوتن بنیات بنێت.[٩]



## یادداشتەکان:

١- تۆماس هابز، لویاتان، ترجمە: حسین بشیریە، تهران، نشرنی، ١٣٨٠.

2-C.L (wayper, political Thought, English University press LTD,1943,P.43.

3- Richard Ashcraft, (Ideology and class in hobbeses. Political theory), Political Theory, Vol 2, No 1 Febraury 1978, pp 27-67.

4- Ernest cassirer, The Myth of the state, Yale University press, 1946, p.175.

5- Ibid. p.176.

6- John Plamenatz, Man and Society, London, Longman, 1963, p. 148.

7- Ibid p.121.

٨- لئواشەراوس، حقوق طبیعی و تاریخ، ترجمە: باقر پرهام، تهران، نشراگە، ١٣٧٣، ص ٢٠١.

٩- فردریك کاپلستون، تاریخ فلسفە، جلد پنجم، ترجمە امیر جلال الدین اعلم، انتشارات علمی و فرهنگی-سروش، چاپ دوم، ١٣٧٠، ص ٦٤.

## پاژی -٣-
# جۆن لۆك
## John Locke

**گرێبەستی کۆمەڵایەتی وەك بنیاتی حکوومەتی دەستووری**

### ژیان و بەرهەمەکانی

جۆن لۆك (١٦٣٢-١٧٠٤) کە یەکێکە لە فەیلەسووفە گەورەکانی سەدەی حەڤدەهەم لە ساڵی ١٦٣٢ لە دەوروبەری بریستۆل لەدایکبووە. باوکی لە یەکێك لە گوندەکاندا پارێزەر بوو، بەڵام جۆن لۆك لە قوتابخانەی وێست مینستر دەستی بە خوێندن کرد و خوێندنی باڵای لە زانکۆی ئۆکسفۆرد تەواوکرد و هەر لەوێ ماوەیەك خەریکی وانەوتنەوە بوو بەڵام زۆربەی تەمەنی خۆی وەك پزیشکی راوێژکار لە بنەماڵەی لۆرد شافتسبری بەسەر برد و هەروەك هۆبز لەگەڵ ئەواندا بەرەو تاراوگە و ئەوروپای کیشوەری رۆیشت. لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لەگەڵ فەلسەفەی سکۆلاستیکدا ئاشنابوو کە لەو سەردەمە هێشتا لەم زانکۆیەدا گرنگی پێدەدرا بەڵام ئەویش وەك هەمموو رۆشنبیرانی چەرخی نوێ ئەم فەلسەفەیەی زۆر بەبێ ناوەرۆك زانی و لێی هەڵگەڕایەوە.

لە ساڵی ١٦٧٥ بەرەو پاریس کەوتە رێ و لەوێ خەریکی لێکۆڵینەوە بوو و وەك هۆبز کەوتە ژێر کاریگەریی بیروبۆچوونەکانی گاسندی. ماوەیەکیش بە هۆی



پەیوەندی لەگەڵ بنەماڵەی لۆرد شافتسبری کە لە پیلانی سیاسی دژ بە پاشا بەشدار بوو، ناچار بوو بەرەو هۆڵەندا هەڵبێت و لە تاراوگەدا بمێنێتەوە.

ناوبانگی لۆك پتر لە بواری ئیپیستمۆلۆژیایە و گرنگترین کتێبی ئەو بریتییە لە (وتار دەربارەی تێگەیشتنی مرۆڤ). لەم کتێبەدا لۆك دیدگای ئەزموونگەرایی لە بەرامبەر عەقڵگەراییدا خستۆتە روو. هزری سیاسی لۆك لە کتێبی (دوو نامیلکە دەربارەی حکوومەت) خراوەتە روو. لۆك ئەم کتێبەی بۆ رەتدانەوەی بیروڕای هزرڤانێکی سیاسی دیکەی سەدەی حەڤدەهەمی ئینگلتەرا نووسیوە کە بەرگری لە تیۆری مافی خودایی پاشاکان دەکرد و بەو جۆرە بەڵگەی دەهێنایەوە کە دەسەڵات یا مەرجەعییەتی سیاسی لە لایەن خوداوەندە دەبەخشرێ نەك بە هەڵبژاردنی تاکەکان. لۆك لە بواری پەروەردە و فێرکردنیشەوە هەندێ هزری نوێی خستەڕوو کە لە کتێبی (هەندێ هزر دەربارەی پەروەردە و فێرکردن)دا باسی لێوەکراوە. لەم بوارەشدا ئەو وەك بواری ئیپیستمۆلۆژیا و تیۆری سیاسی کاریگەرییەکی زۆری لەسەر رۆشنبیران و چەرخی رۆشنگەری هەبووە.

### * نەخشەی هزری سیاسیی لۆك

پرسی سەرەکی تیۆری سیاسیی لۆکیش هەروەك پرسی هۆبزە:

بۆچی مرۆڤ کۆمەڵگای سیاسی (یا بە زاراوەی باوی ئەو سەردەمە "کۆمەڵگای مەدەنی") دروست دەکات.

ئەم کارە چۆن ئەنجام دەدرێت؟ لۆك پاساوهێنانەوە بۆ خاوەندارێتی تایبەتیش دەخاتە ناو چوار چێوەی ئەم نەخشەیەوە. هەرچەندە پرسیاری سەرەکی هزرەکەی لۆك لەگەڵ هۆبز هەریەك پرسیارە بەڵام ئەو وەڵامەی کە لۆك بۆ ئەم پرسیارە دەیدۆزێتەوە لەگەڵ وەڵامەکەی هۆبز جیاوازە. لۆکیش هەر لەسەر هەمان بنەما و گریمانەکانی هۆبزەوە دەستی پێکرد واتە ویست و یارمەتی وەرگرتن لە عەقڵ لە





پێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسی لەسەر بنچینەی پاراستنی گیان بەڵام بە پێچەوانەی هۆبز لە بری حکوومەتی دەسەڵاتخواز گەیشتە حکوومەتی سنووردار و دەستووری. هۆکاری ئەم کارەش، بە چاوپۆشی کردن لە پاڵنەرە دەرەکییەکان و بە لە پێشتر دانانی ئایدۆلۆژیایی ئەوە بوو کە لۆك پارادۆکسێکی لۆژیکی بەدی دەکرد لە نێوان گریمانەکانی هۆبز و ئەو دەرەنجامانەی کە بە هۆی ئەم گریمانانەوە پێی گەیشتبوو. لۆك وابیری دەکردەوە کە بنەما و گریمانەکانی هۆبز لەگەڵ ئەو دەرەنجامانەی کە پێیان گەیشتبوو یەکناگرنەوە. بۆچی دەبێ گرێبەستی کۆمەڵایەتی تاکەکان ببێتە هۆی سەقامگیرکردنی فەرمانڕەوایەك کە خەڵك کۆنترۆڵیان بەسەریدا نەبێت. عەقڵ وافەرمان دەکات کە دەسەڵاتدارێك بە دەسەڵاتی مەرجدار و سنووردار بخولقێنن.

لۆك بۆ هەڵێنجانی دەرەنجامگەلێکی جیاواز لەگەڵ دەرەنجامەکانی هۆبز لێکدانەوەیەکی نوێی بۆ بنەماکانی تیۆری هۆبز خستەروو. بەم جۆرە چەمکەکانی ڕەوشی سروشتی، ڕەوشی مەدەنی، گرێبەستی کۆمەڵایەتی و شێوازی پێکهێنانی دەوڵەت لە تیۆری لۆکدا ناوەڕۆکێکی تازەیان بە خۆوە گرت. ڕەوشی سروشتی لە تیۆری لۆك بارودۆخی جەنگی هەمووان نییە دژ بە هەمووان، بەڵکو بارودۆخی ئازادی و ملکەچ بوونە بۆ یاسای سروشتی. کەموکووڕی ئەم ڕەوشە بریتییە لە نەبوونی دادوەرێکی بێلایەن، یاسایەکی نووسراو و نەبوونی هێزێك بۆ جێبەجێکردنی یاسای سروشتی. کە وابوو تاکەکان سەرەتا دەچنە ناو گرێبەستێکی کۆمەڵایەتییەوە و (ڕەوشێکی مەدەنی) دەخولقێنن. پاشان ئەم کۆمەڵگا مەدەنییە وێڕای بەستنی گرێبەستێك لەگەڵ دەسەڵاتدار بۆ نەهێشتنی کەموکوڕییەکانی سەرەوە حکوومەتێك پێکدەهێنێ. ئەم حکوومەتە مەرجدار و سنووردارە و وەك ئەمانەتداری کۆمەڵگای مەدەنییە نەك ئەوەی کە هاوڕێ بێت یاخود دەسەڵاتدار بێت بەسەریدا. ئەم حکوومەتە دەبێ مافی ژیان، ئازادی و خاوەندارێتی خەڵك بپارێزێت. لە باسەکانی خوارەوەدا بە تێروتەسەلی ئەم نەخشەیە دەخەینە بەرلێکۆڵینەوە.



## ١- ڕەوشی سروشتی، ڕەوشی مەدەنی، حکوومەت

### ڕەوشی سروشتی

لۆکیش هەروەك هۆبز بۆ شیکردنەوەی سەرهەڵدانی کۆمەڵگای سیاسی و ناوەڕۆك و تایبەتمەندییەکانی لە ڕەوشی سروشتی گریمانەییەوە دەست پێدەکات. بەڵام بە جۆرێك باس لە ڕەوشی سروشتی دەکات کە تێیدا مرۆڤە ئازاد و یەکسانەکان لە چوارچێوەی یاسای سروشتی بە ئاشتییەکی ڕێژەیی لەپاڵ یەکتردا دەژین. ئەوان دەسەڵاتێکی بەرزتریان لە سەرووی خۆیانەوە نییە، بەڵام بە گشتی بەپێی عەقڵ و ویژدان پەیڕەویی لە یاسای سروشتی دەکەن. یاسای سروشتی هەندێ پرەنسیپی وەك مافی ژیان، ئازادی و خاوەندارێتی دەگرێتەوە. ئازادی مرۆڤەکان تا ئەو جێگایەی کە لەگەڵ یاسای سروشتدا ناسازگار نەبێت دەتوانێ پەرەبستێنێ. ئەم ئازادییە تەنیا بە عەقڵ مەرجدارو سنووردار دەکرێت. عەقڵ، مرۆڤەکان بۆ پەیڕەویی کردن لە یاسای سروشتی بانگهێشت دەکات. ملکەچ نەبوون بۆ عەقڵ و بانگەشەی ئازادیی بێسنوور و هەنگاونان بەرەو بواری زێدەخوازی و بەرەڵڵایی لەگەڵ جەوهەری مرۆڤدا ناگونجێ و ئەم بوونەوەرە بەرەو قەڵەمڕەوی ئاژەڵەکان پاڵ پێوەدەنێت. لە ڕەوشی سروشتیشدا مرۆڤەکان بەڵێنی خۆیان بەجێدەگەیەنن و پێویست ناکات بەو جۆرەی کە هۆبز دەڵێ هێزێکی دەرەکی وەك حکوومەت هەبێت تا گەرەنتی بەجێ گەیاندنی بەڵێن بکات لە کاتی بەستنی گرێبەستدا. بە بۆچوونی لۆك ڕاگرتنی بەڵێن پەیوەندی بە ناوەڕۆکی مرۆڤەوە هەیە نەك لەبەر ئەوەی کە مرۆڤ ئەندامی کۆمەڵگای سیاسییە. بەم جۆرە بە پێچەوانەی بۆچوونی هۆبز ڕەوشی سروشتی ڕەوشی جەنگ نییە کە هەروەکو هۆبز دەڵێت، ژیان تێیدا سووك، توندوتیژ، گۆشەگیرو پیس و کورت بێت.

ئەگەر لێکدانەوەکەی لۆك دەربارەی ڕەوشی سروشتی پەسندبکەین ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە کە بۆچی مرۆڤ دەبێ بیەوێت لە ڕەوشی سروشتی دەربچێت و





کۆمەڵگای سیاسی پێکبهێنێت. وەڵامی لۆك ئەمەیە کە ئەگەرچی رەوشی سروشتی، رەوشی جەنگ نییە، بەڵام هەندێ کەموکووڕی هەیە کە ئاشتی و ئارامی تێیدا گەرەنتی ناکرێت. هەندێ مرۆڤی وا هەن کە دەیانەوێ بە پێچەوانەی دۆخی ئاسایی بجووڵێنەوە و ئاشتی و ئارامی تێکبدەن. بەم جۆرە رەوشی سروشتی بە تەواوی لە مەترسی بە دوور نییە.

### * گرێبەستی کۆمەڵایەتی

رەوشی سروشتی سێ کەموکووڕی سەرەکی هەیە:

یاسای نووسراو و دیاریکراو.

دادوەرێکی بێ لایەن کە لە لایەن هەمووانەوە پەسندبکرێت.

هێزێك کە بڕیارەکان جێبەجێ بکات.

کەوا بوو هەنگاونان بەرەو رەوشی مەدەنی بەشتێکی پێویست دادەنرێت. بۆ دەربازبوون لە رەوشی سروشتی مرۆڤەکان دەبێ ملکەچی گرێبەستێکی کۆمەڵایەتی بن کە یەکگرتوویان بکات و بەرەو رەوشی مەدەنی بەرزیان بکاتەوە. ئەم گرێبەستە پەیمانێکە لەگەڵ هەموو کەسێکدا. ئەم گرێبەستە بە پێچەوانەی ئەو گرێبەستەی کە هۆبز دەڵێ پەیمانێك نییە کە هەر کەسێك بەویتر بڵێ (من مافی دادوەریکردن لەمەڕ ئاسایشی خۆم بەفلانە کەس یا فلانە کۆمەڵە دەسپێرم ئەگەر بێت و تۆیش کارێکی لەو جۆرەبکەیت). بەو پەیمانەی کە لۆك مەبەستیەتی تەنیا کۆمەڵ یا کۆمەڵگایەکی مەدەنی دروست دەبێت. بۆ سەقامگیربوونی حکوومەت پێویست بە گرێبەستێکی دووهەمیش دەکات. لە گرێبەستی دووهەمدا کۆمەڵگای مەدەنی ئەرکی بەڕێوەبردنی کاروباری گشتی بۆ تاکە کەس یا گرووپێك دەگوازێتەوە. بەم جۆرە بە پێچەوانەی بۆچوونی هۆبز کە کۆمەڵگای مەدەنی و حکوومەت لە یەك جێ و لە یەك ساتدا دروست دەبێ، لەو گرێبەستەی کە لۆك مەبەستیەتی سەرەتا



کۆمەڵگای مەدەنی دروست دەبێت و پاشان بە گرێبەستێکیتر حکوومەت دروست دەبێت. هەرچەندە بەپێی پێوەرەکانی فەلسەفەی سیاسی و پرەنسیپی هاوسازبوونی ناوخۆیی تیۆری هۆبز رێکوپێکترە و بەڵگەکەشی زۆر بە هێزترە، بەڵام لە رووی جیاکردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی لە حکوومەت تیۆری لۆك بەش بەحاڵی خۆی داهێنانێکی نۆیی گرنگ لە خۆدەگرێت.

لە گرێبەستی دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنی، مرۆڤ هەندێك لە ئازادییەکانی خۆی لە دەست دەدات بەڵام ئەو بەشە لە ئازادییەکانی خۆی گەرەنتی دەکات کەماونەتەوە. لە گرێبەست لەگەڵ حکوومەتیشدا، مرۆڤ هەندێك لە مافەکانی خۆی لە دەست دەدات، بەڵام بەشەکەی دیکەی گەرەنتی دەکرێت. دەسەڵاتی حکوومەت دەسەڵاتێکی ئەمانەتدارانەیە بۆ چالاکی بە ئاراستەی هەندێ ئامانجی دیاریکراو. خەڵك بە گرێبەستی کۆمەڵایەتی هەروا رێك دەکەون کەدان بە فەرمانڕەوایی زۆرینەدا بنێن.

## حکوومەتی مەرجدار نەك حکوومەتی رەها

هەرچەندە گریمانەکانی هۆبز دەربارەی بناغەی پیکهێنانی حکوومەت لەسەر بنەمای مافی پاراستنی گیان و هاوکاری و رەزامەندیی تاکەکان سەرنجی ژمارەیەکی زۆریان لە هزرڤانی سیاسی بەرەو لای خۆیان راکێشا، بەڵام هەڵێنجانی حکوومەتی ئۆتۆریتەگەرا لەم بنەمایانە رەخنەیەکی زۆری لێگیرا تەنانەت لە لایەن پاشایەتی خوازەکانیشەوە.[1]

جۆن لۆك و جەیمز هارینگتۆنی هاوولاتی ئەو (تیۆرداڕێژی سیاسی سەدەی حەڤدەهەم) ناسازگارییەکیان لە نێوان بنەماکان و دەرەنجامەکانی تێوری هۆبزدا بەدی کردو ئەم بابەتەیان هێنایە گۆڕێ کە بۆچی دەبێ تاکەکان ملکەچی گرێبەستێك بن کە هەمیشەییە و گەڕانەوەی بۆ نییە و بەرپرسایەتییەکە بە کەس یا گرووپێك دەسپێردرێت کە لە بەرامبەر ئەواندا





هەست بە هیچ بەرپرسیارێتییەك ناكات. بۆچی نەتوانین دەسەڵات بدەین بە گرووپێك كە لە بەرامبەر خەڵكدا بەرپرس بێت؟ بەم جۆرە بوو كە لۆك گەیشتە هەڵێنجانێكی جیاواز و گوتی ئارەزووی پاراستنی گیان نە تەنیا نابێتە هۆی دروستبوونی حكوومەتی ئۆتۆریتەگەرا، بەڵكو رێك بە پێچەوانەوە دەبێتە هۆی دروستبوونی حكوومەتێكی سنووردار.

رزگاربوون لە دەسەڵاتی رەها و ئۆتۆریتەگەرا باشترین پارێزەری مافی پاراستنی گیانە. هەر بۆیە مەبەستی گرێبەستی كۆمەڵایەتی، حكوومەتی سنووردار و پشت بەستوو بە یاسایە.

## فەلسەفەی سیاسیی لۆك و لیبرالیزم

هەر چەندە بەپێی لێكدانەوەیەك و بە سەرنجدان بەوەی كە هۆبز لە شیكردنەوەی خۆی دەربارەی سەرچاوەو ناوەڕۆكی كۆمەڵگای سیاسی مافی لە پێشەوەی ئەرك داناوە هەر بۆیە بە بنیاتنەری لیبرالیزم ناودەبرێت بەڵام هەندێك لە خاوەنڕایان لۆك-یان بە یەكەمین بیرمەندی لیبرالیزم لە قەڵەم داوە. ئەم لێكدانەوەیە پشت بە دوو بەڵگە دەبەستێ. یەكەم ئەوەی كە ئەو هزری دەستوورگەرایی لە نەریتی رابردوو جیاكردەوەو بەو جۆرەی كە لە ناو هزری رۆمی و سەدەكانی ناوەڕاست لەئارادابوو لە سەر بنەمای گرێبەستی كۆمەڵایەتی بنیاتی نا. لۆك لەسەر ئەم بنەمایە پاساوی بۆ پرەنسیپەكانی دەستوورگەرایی دەهێنایەوە كە مرۆڤ بوونەوەرێكی عەقڵانی و خودڕێسایە و دەتوانێ لە رووی هەستكردن بە بەرپرسیارێتییەوە بجوولێتەوە و هەڵبژێرێت. دووهەمیش ئەوەیە كە لۆك زەمینەی خۆشكرد بۆ باسێكی جدی دەربارەی چەمكەكانی جیاكردنەوەی دەسەڵاتەكان، پاشایەتی دەستووریی و رێسای زۆرینە.[٢]

هزری لۆك لە نەریتی  لیبرالیشدا بەردەوام بوو و گەشەی كرد و ئەم بەڵگەیە لە ناخییەوە سەریهەڵدا كە مرۆڤەكان وەك بوونەوەرێكی عەقڵانی بۆ گەڕان بەدوای



بەرژەوەندییەكانی خۆیان لە كۆمەڵگادا خەریكی هەوڵ و ركابەریین و كۆمەڵگا دەبێ لە چوارچێوەی یاسا سنووری ئازادی ئەوان بە رەسمی بناسێت. بەم حاڵەش ناتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین كە لۆكیش، هەروەك پێشینانی خۆی، هەمووانی لە رووی بەهرەمەند بوون لە عەقڵانییەت و شێوازی بەشداریكردنی سیاسی بە بەرامبەر و یەكسان زانیوە. ئەمە بابەتێكە پێویستی بە روونكردنەوەی زیاتر هەیە كە لە باسەكانی خوارەوە لێیان دەدوێین.

## ٢- تاكگەرایی موڵكدارانە

### تیۆری موڵكدارێتی لۆك

نووسینەكانی لۆك راڤەی جیاوازیان بۆ كراوە. هەندێ جار ئەم راڤەكردنانە لە جەمسەرگەلی دژبە یەكدا دەوەستن. لە جەمسەرێكەوە راڤەكردنێكی وا دەخرێتەڕوو كە لۆك بە لایەنگری هەڵوەشاندنەوەی موڵكدارێتی و هەموو ئیمتیازاتی ئەم پلە و پایەیە دەزانێ.[٣] لەبەرامبەریشدا راڤەكردنێكی واهەیە كە لۆك بە تیۆردارێژی سەرمایەداری و خاوەن موڵكە بازرگانەكان دەناسێنێ.[٤] لە لایەكی تریشەوە لە هەندێ لێكدانەوەی دیكەشدا، لۆك بە تیۆر دارێژی كۆمەڵگای لیبرال و لە لێكدانەوەیەكی تردا وەك دیموكراتی رادیكاڵ و تەنانەت بە چەپگەرا لە قەڵەم دراوە. لەم جۆرە راڤەكردنانەدا هەوڵدراوە كە پاكانە بۆ ئەو تۆمەتانە بكرێ كە لۆك وەك لیبرالی و لایەنگری سەرمایەداری دەناسێنێ. لەم جۆرە راڤەكردنانەدا دەگوترێ كە پرسی سەرەكی لۆك دژایەتیكردنی حكوومەتە رەهاكانی سەردەمی خۆی بووە كە بەسەپاندنی باجی جۆراوجۆر خەڵكیان دەڕووتاندەوە. بەرگری كردنی لۆك لە موڵكدارێتیش بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەستدرێژییەكانی پاشاو ئاریستۆكراتەكان بووە و لۆك لە راستیدا بەرگری لەم پرەنسیپە كردووە كە ئەو كەسانەی كە باج دەدەن دەبێ لە رێكخستنی سیاسەتی كۆمەڵگا و مافی دەنگداندا بەشداربن.





بە بۆچوونی ئێمە لە نێوان ئەو راڤەکردنە جۆراوجۆرانە ئەو راڤەکردنە لەوانی دیکە بە پەسندتر دەزانین کە لۆك بە تیۆرداڕێژەری موڵکداریێتی تایبەتی و سەرمایەداری لە حاڵی گەشەکردوو لە قەڵەم دەدات. لە باسی خوارەوە ئەم بابەتە دەخەینە بەر لێکۆڵینەوە.

## موڵکداریێتی تایبەتی و پەیوەندییەکانی کارو سەرمایە

دیدگای لۆك لەمەڕ کۆمەڵگای سیاسی و بەشداری سیاسی پەیوەندییەکی هەمەلایەنەی لەگەڵ دیدگای ئەو لەمەڕ موڵکداریێتی تایبەتی هەیە. لۆك تیۆری خۆی دەربارەی موڵکداریێتی تایبەتی لەم پرەنسیپەوە دەست پێدەکات کە خوداوەند بە شێوەیەکی هاوبەش زەوی بە هەموو تاکەکانی مرۆڤ داوە و تاکەکانی مرۆڤ بۆ مانەوەی خۆیان دەتوانن ئەو شتەی کە لە سروشت بە پێویستی دەزانن وەریبگرن. هەرکەسێك خاوەنی هێزی کاری خۆیەتی و دەتوانێ بە تێکەڵکردنی کاری خۆی لەگەڵ سروشت ببێتە خاوەنی ئەو شتە. هەڵبەت دەبێ سنوورێك بۆ ئەم خۆ بە خاوەنکردنە دا بنرێت و لە زێدەڕەویی دوور بکەویتەوە تا ئەم دەرفەتە بۆ خەڵکی دیکەش (تێکەڵکردنی کاری خۆیان لەگەڵ سروشت و خۆ بە خاوەنکردنی لەم رێگایەوە) برەخسێت. ئەم بۆچوونە هەروەکو لە بەرگی یەکەمدا ئاماژەی پێکرا دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە لقە گرنگەکانی یاسادانەرانی مەسیحی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا.

هەرچەندە تێکەڵکردنی کار لەگەڵ سروشت سەرەتا لەسەر  شێوازی میوە چنینەوە بووە، بەڵام لۆك دەڵێ دەتوانی زەوی پاوان بکەیت و بیکەیت بە موڵکی تایبەتی. ئەمەش لە راستیدا تێکەڵکردنی کارە لەگەڵ سروشت و بەکردوەیەکی رەوا لە قەڵەم دەدرێت. لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە کە ئایا لە ئینگلتەرای ئەو رۆژگارەدا ئەم دەرفەتە بۆ هەموو خەڵك هەبووە، واتە ئایا هەموو کەس دەیانتوانی بە کاری خۆیان پارچە زەوییەك پاوان بکەن و بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی خۆیان



کەڵکی لێوەربگرن؟ وەڵامی ئەم پرسیارە روونە کە نیگەتیڤە. کاتێك کە زەوی بەرادەی پێویست هەبێت خۆ بە خاوەنکردنی لە لایەن تاکە کەسێکەوە نابێتە دەستدرێژی کردن بۆ سەر مافی ئەوانی دیکە، بەڵام کاتێك کە زەوی بە رێژەی پێویست نەبێت ئینجا دەبێ چی بڵێین؟

لۆك وەڵامێکی روون بەم پرسیارانە ناداتەوە و لەباتی ئەوە بە مانۆرێکی زیرەکانە لەم پرسیارە دەسووڕێتەوە. ئەو هەندێ پرسی نوێ دەهێنێتە ئاراوە کە بە کۆکردنەوەیان بەرەو ئەو ئەنجامە رادەکێشرێین کە کەڵەکەبوونی زەوی و سەرمایە لە دەستی هەندێك و بێ زەوی مانەوە و پشت بەستن بە هێزی کاری گرووپێکیتر بە رەوا خۆبنوێنێ. لۆك دەڵێ کە داهێنانی پارەو ئاڵوگۆڕی کاڵا ئەم دەرفەتە دەرەخسێنێ کە کەڵەکەبوونی زەوی و سامان نەبێتە هۆی لەناوچوونی سروشت و بەرهەمی کار. لە مامەڵەدا مرۆڤ دەتوانێ زێدە بەرهەمی خۆی بفرۆشێت و بەهاکەی کۆبکاتەوە کە بە شێوەی پارەیە و تووشی گەندەڵی نابێت. خەڵك بە شێوەیەکی لابەلا لەسەر برەو پێدانی پارە رێککەوتوون و پارە دەتوانێ جێگای بەرهەم (کە کەڵەکەبوونی دەبێتە هۆی گەندەڵ بوونی) بگرێتەوە.

لۆك بنەماکانی تیۆری سیاسی و بۆچوونی موڵکداریێتی تایبەتی خۆی لەسەر مافە سروشتییە کلاسیکییەکان دادەمەزرێنێ، بەڵام ئەو ئەنجامانەی کە لەم بنەمایانەوە هەڵیدێنجێنێ بە واتای هەڵوەشاندنەوەی مافە سروشتییە کلاسیکییەکان نییە. لۆك بە پەسندکردنی پرەنسیپی موڵکداریێتی تایبەتی، رەوابوونی کەڵەکەبوونەوەی سامان و دابەشکردنی کۆمەڵگا بەسەر توێژە خاوەن سەرمایەکان ئەو توێژانەی کە جگە لە هێزی کار هیچ جۆرە ئامرازێکی دیکەی گوزەرانیان نییە بەرەو کۆمەڵگایەکی سیاسی هەنگاو دەنێ کە تێیدا هەموو ئەندامی کۆمەڵگای سیاسیین، بەڵام هەموویان خاوەنی مافی دەنگدانی یەکسان نین. لەم کۆمەڵگایەدا کرێکاران هەرچەندە ئەندامی کۆمەڵگای سیاسیین، بەڵام خاوەنی مافی دەنگدان نین.

## رەزامەندی و مافی دەنگدانی گشتی

بەڵام هەندێك لە ڕاڤەكاران كە لۆك دەخەنە ڕیزی تیۆردارێژەرانی دیموكراتیزمەوە لەو باوەڕەدان كە ئەو باوەڕی بە مافی دەنگدانی گشتی (نەك بێبەشكردنی كرێكاران لە مافی دەنگدان) هەبووە.[٥] ئەم ڕاڤەكارانە دەڵێن كە جۆرە پەیوەندییەك لە نێوان پرەنسیپی ڕەزامەندی لە حكوومەت و پرەنسیپی دەنگدانی گشتیدا هەیە. بەڵام سەرەڕای بۆچوونی ئەم گرووپە، مێژووی هزری سیاسی باس لەوە دەكات كە مەرج نییە لە نێوان ئەو دووانەدا پەیوەندی هەبێت. هەندێك لە تیۆردارێژەران تەنانەت كەڵكیان لە پرەنسیپی ڕەزامەندی وەرگرت بۆ پاساو هێنانەوە بۆ حكوومەتی ڕەها. لۆكیش جیاوازی دادەنا لە نێوان ڕەزامەندی وەك سەرچاوەی پێكهێنانی كۆمەڵگای مەدەنی (گرێبەستی كۆمەڵایەتی یەكەم) و ڕەزامەندی وەك دیاریكەری ڕەوایەتی جۆری حكوومەت (گرێبەستی كۆمەڵایەتی دووهەم) و دەیگوت ئێمە بە گرێبەستی دووهەم دەتوانین حكوومەت سنووردار و مەرجدار بكەین. بەڵام كێشەكە لەوەدایە كە لۆك ئامادەبوونی تاكی لە كۆمەڵگای سیاسی بەواتای ڕەزامەندی لاوەكی تاك لە قەڵەم دەدا بۆ سەقامگیریی دەوڵەت. مەرج نییە ئەم جۆرە ڕەزامەندییە (ڕەزامەندی لاوەكی) لەگەڵ مافی دەنگدانی گشتی لە پەیوەندی دابێت.

## ئەندامێتی لە كۆمەڵگای سیاسی و مافی سیاسی

لە تیۆری لۆكدا ئەندامێتی لە كۆمەڵگای سیاسی مەرج نییە بە واتای هەبوونی مافی سیاسی تەواوبێت. لۆك باسی لە مافە جۆراوجۆرەكان كردووە: مافی ملكەچبوون بۆ دەسەڵاتداریێتی یاسا، مافی دەنگدان و مافی بەرهەڵستكاری. پرەنسیپی دەسەڵاتداریێتی یاسا یەكێكە لە بنەما گرنگەكانی تیۆری سیاسی لۆك.[٦] ئەو ڕاڤەكارانەی كە تیۆری سیاسی لۆك لەگەڵ مافە دیموكراتییەكان بە گونجاو دەزانن یەكێك لەو بەڵگانەی كە بۆ شێوازی تێگەیشتنی خۆیان دەیهێننەوە



بریتییە لە باوەڕمەندی لۆك بە مافی تاكەكان لە ملكەچبوونیان بۆ دەسەڵاتداریێتی یاسا.[٧] بەڵام دەتوانین بەرگری كردنی لۆك لە دەسەڵاتداریێتی یاسا تەنیا بە بەرگری كردن لە حكوومەتی دەستووری لە قەڵەم بدەین نەك مافی دەنگدانی گشتی. یەكسانی لە بەرامبەر یاسادا نایەكسانی لە مافی دەنگدان ڕەتناكاتەوە. لە سەردەمی لۆكدا كەم نەبوون ژمارەی ئەو دەستوورخوازانەی كە دەسەڵاتداریێتی یاساو مافی دەنگدانی گشتیان لە یەكتر جیانەدەكردەوە.

دەتوانین بڵێین كە لە تیۆری لۆكدا هەمووان ئەندامی كۆمەڵگای سیاسین بە بێ ئەوەی مافی دەنگدانی یەكسانیان هەبێت. ئەندامبوون لە كۆمەڵگای سیاسی (كە هەندێ جار بەرەزامەندی ناڕاشكاوانە هاتووتە دی نەك بەرەزامەندی ڕاشكاوانە) لەگەڵ مافی بەشداری كردن لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران لە پەیوەندی دانییە. لۆك لە هیچ جێگایەك ئەندامانی كۆمەڵگای سیاسی لەگەڵ دەنگدەران (Electors) بە یەكسان نەزانیوە. هەموو دەنگدەران ئەندامی كۆمەڵگای سیاسیین، بەڵام هەموو ئەندامانی كۆمەڵگای سیاسی بە دەنگدەر ناژمێردرێن.

## پەیوەندییەكانی نێوان كار و سەرمایە

لۆك كە سەرەتا بەڵگەهێنانەوەی خۆی لە گریمانەكانی مافی سروشتی بنیاتنراو لە سەر ئەم بنەمایە دەست پێكردبوو كە زەوی و بەرهەمەكانی مۆڵكی هاوبەشی هەموو تاكەكانی مرۆڤن لە ئەنجامدا دەگاتە پاساوهێنانەوە بۆ بنەمای ئەخلاقی پەیوەندییەكانی نێوان كار و سەرمایە. بەم جۆرە ئەو كە لە عەقڵانی بوونی هەموو تاكەكانی مرۆڤەوە دەستی پێكردبوو لە ئەنجامدا دەگاتە دوو جۆرە عەقڵانییەتی جیاواز، یەكەمیان عەقڵانییەتی ئەو كەسانەی كە خاوەنی دارایین و ئەویتر عەقڵانییەتی ئەو كەسانەی كە خاوەن دارایی نین. ئەنجامیگری ئەو ئەمەیە كە هەر چەندە كرێكاران بەشێكی پێویستن لە ئەندامانی كۆمەڵگای سیاسی، بەڵام بە ئەندامی تەواوی ئەم كۆمەڵگایە لە قەڵەم نادرێن. كۆمەڵانی كرێكاری هەژار





ناتوانن خاوەنی ژیانێکی ئەخلاقی تەواوبن. ئەم بۆچوونە لە سەردەمی لۆکدا بۆچوونی باوبوو. لۆك لەو باوەڕەدایە کە چونکە کرێکاران لە ڕەوشێکی وەهادان کە دەستیان ناگاتە دەمیان کە وابوو ناتوانن بە دروستی بیربکەنەوە یا بچنە ناو کاری سیاسییەوە (جگە لە حاڵەتی دەگمەن نەبێت کە ئەویش دۆخی یاخیبوونە). لۆك کە باوەڕی بە مافی شۆڕش هەیە مافێکی لەم جۆرە بۆ کرێکاران بەڕەوا نازانێ[8].

لۆك لە ریزی ئەو کەسانەیە کە لەو باوەڕەدا بوو لەو جێگایەی کە دەستەکان لەگەڵ دەسکە بێڵ و دەسکە گاسن لە پەیوەندیدان، سەر ناتوانێ بۆ بیرکردنەوە دەربارەی چەمکە پاکیزەکان جێگایەکی زۆری هەبێت. بەرای ئەو کۆمەڵانی کرێکار و هەژار ئامادەیی ئەوەیان نییە کە پەیڕەویی لە ئەخلاقی عەقڵانی بکەن. ئەوان پێویستیان بە باوەڕە. ئەوان دەبێ لە ڕێگای باوەڕمەندبوونیان بە پاداشت و سزای خوداوەندییەوە بۆ ملکەچبوون هان بدرێت.

## بەشداری سنووردار

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە پارادۆکسێکی بنەڕەتی لە نێوان دەسەڵاتداریێتی زۆرینە و مافی موڵکداریێتی تایبەتی لە ئارادایە. پیرۆزی موڵکداریێتی و مافی حکوومەتی زۆرینە لەگەڵ یەکتردا کۆناکرێتەوە. ئەگەر ئەو کەسانەی کە موڵکداریێتی (دارایی، زەوی و سەرمایە) یان نییە و خاوەن مافی سیاسی تەواوبن چۆن دەتوانین چاوەڕوانی ئەوەیان لێ بکەین کە هەمیشە پابەند بمێننەوە بە پرەنسیپی ئەخلاقی پیرۆزیی سەرمایە و هەوڵی گۆڕینی پەیوەندییەکانی موڵکداریێتی نەدەن؟ لە سەردەمی جۆن لۆك لە ئینگلتەرا زەوی بە دەستی ئاریستۆکراتە موڵکدارەکانەوە بوو کە بەشێوەی بە کرێدان و وەرگرتنی هەقدەست کەڵکیان لێوەردەگرت. بەپێی ئەم مافە حکوومەتی زۆرینە دەیتوانی ببێتە هۆی داواکردنی گۆڕینی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان (پەیوەندییەکانی موڵکداری و کارو سەرمایە)، و جۆن لۆك کە دەستوور خوازێکی میانڕەو بوو خاوەن بۆچوونێکی لەم جۆرە نەبوو.



لە کۆتاییدا لۆك لەم پرەنسیپانەی خۆی دەگاتە ئەنجامگیرییەك کە هەڵێنجان و بەڵگەکانی لەگەڵ یەکتردا ناکۆکن. ئەو کە لە ئاوەزمەندبوونی هەموو مرۆڤەکانەوە دەستی پێکردبوو لە ئەنجامدا دەگاتە دوو جۆرە عەقڵانیەت واتە عەقڵانیەتی خاوەن موڵکەکان و بێ موڵکەکان. بەم جۆرە لە کاتێکدا کە ئەو لە ڕووی یاسای سروشتییەوە هەمووان بە یەکسان دەژمێرێت بەڵام لە کۆتاییدا دوو جۆرە سیستەمی جیاواز بۆ سوودوەرگرتن لە یاسای سروشتی دەناسێنێ. بەم جۆرە لۆك پتر لەوەی کە نیگەرانی پێکەوە گونجانی ناوخۆیی لە نێوان تیۆری و بەڵگەکانی خۆیدا بێت، نیگەرانی پاساوهێناوەیە بۆ ئەو هەلومەرجە کە لە سەردەمی ئەودا بوونیان هەبووە. لۆك وێڕای ئەوەی کە لایەنگیری حکوومەتی دەستووری بوو، لە هەمانکاتدا خوازیاری ئیمتیازی سیاسیی تایبەتی بوو بۆ ئەو بەشەی کۆمەڵگا کە خاوەن دارایی بوون.

## هەڵسەنگاندنی شێوازی ئەنجامگیری لۆك

لۆك ڕەخنەی لە تیۆری هۆبز گرتووە لەمەڕ هەڵێنجانی حکوومەتی ڕەها لە پرەنسیپەکانی سروشتی پاراستنی گیان و بەناهاوسازی لە قەڵەم داوە. بەڵام بەڵگەهێنانەوەکەی هۆبز گەلێك پتەوترە لە بەڵگە هێنانەوەکەی ئەو. لە بەڵگەهێنانەوەی لۆکدا ڕەهەندی لایەنگیری لە سیستەمێکی ئابووری-کۆمەڵایەتی دیاریکراو (پەیوەندییەکانی سەرمایەداری) بەرجەستەترە و ئەمەش بووەتە هۆی ناسازگاربوونی بەڵگەکەی ئەو. لە تیۆری لۆك مرۆڤ لە بنەڕەتدا بوونەوەرێکی ئاوەزمەند و کۆمەڵایەتییە. لەو ڕووەوە ئاوەزمەندە کە دەتوانێ بە عەقڵ پەی بە یاسای سروشتی ببات، کە بۆ خۆی لەسەر بنەمای عەقڵانییەتێکی سروشتی بنیاتنراوە و لەو ڕووە کۆمەڵایەتییە کە بەر لە دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسی واتە دامەزراندنی حکوومەت و دانانی یاسا پابەندراوەکان (مولزەم)، بە گشتی مرۆڤەکان لە بارودۆخێکی ئاشتیانە لەگەڵ یەکتردا دەژیان. تیۆری لۆك لەم خاڵەدا





له تیۆری هۆبز دوور دەکەوێتەوە. تیۆری لۆك لێرەدا درێژەپێدەری ئەو باسە وتاربێژی و تیۆلۆژیانەی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستە کە تێیدا دەسەلاتی ڕەهای خوداوەند و ویستی ئەو بەسەر بوونی سیستەمێکی عەقلانی لە سروشتدا چەسپێندرا بوو.[٩] هەرچەندە لۆکیش وەك هۆبز لەو باوەڕەدایە کە مرۆڤ بە پلەی یەکەم بە حەزو نەفرەت بەرەو پێشەوە دەڕوات، بەلام بانگەشەی ئەوە دەکات کە مرۆڤەکان دەتوانن بە تێگەیشتن لە قازانجی یاسا ئەخلاقییەکان، بەبێ بەرپاکردنی هێزێکی دەسەلاتدار ملکەچی ئەم یاسایانە بن، (ئەم بابەتە لۆك بەرەو لایەنگرانی تیۆری قازانجگەرایی پاڵ پیوەدەنێت).

هەروەکو بینیمان هۆبز یاسا سروشتییەکان تەنیا بە مافی پاراستنی گیان، کە شتێکی سەلمێنراوە، سنووردار دەکات و وێڕای ئەوەی کە گرێبەستی کۆمەلایەتی بە مەرجی پێویست بۆ دەرباز بوون لە ڕەوشی سروشتی دەناسێنێ سەقامگیربوونی هێزێکی دەسەلاتدار بە مەرجی پێویستی ئەم بابەتە لێکدەداتەوە کە بەبێ ئەو، هەر یاسایەك لە کوتە کاغەزێك بەو لاوە هیچی‌تر نییە. بەلام لۆك کە لە جێگایەکدا راکێشان و پالپێوەنان بە پالنەری ڕێنومایکەری مرۆڤ دەناسێنی لە جێگایەکی تردا دەیگوت کە لە ڕەوشی سروشتیدا یاسایەکی سروشتی زاڵە کە عەقلّ ڕێنوماییکەریەتی. لۆك لە وێناکردنی خۆی دەربارەی ڕەوشی سروشتی لە جێگایەکدا (بەشی سێهەمی دوو نامیلکە) لە وەسفەکەی هۆبز نزیك دەبێتەوە و ڕەوشی سروشتی بە ڕەوشی جەنگ لە قەڵەمدەدات. بەم وەسفە ئیدی کێشەی بوونی کەمینەیەکی یاساشکێن لە ئارادانییە بەڵکو هەموو مرۆڤەکان ئەو عەقڵەیان بەلاوەناوە کە لۆك بانگەشەی بۆ دەکات. ئەم وەسفە دژبەیەکانە و خاڵی ناوەندی یەك نەگرتنەوە لە تیۆری سیاسی لۆك بۆ لایەنگری کردنی ئەو لە پەیوەندییەکی کۆمەلایەتی تایبەتی (پەیوەندییەکانی سەرمایەداری) دەگەڕێتەوە. ئەو ئەم وەسفەی بۆ پاساوهێنانەوەی دوو بەشی جیاواز و ناهاوساز لە تیۆری خۆی بەکارهێناوە. لەلایەکەوە مرۆڤەکان ئەوەندە بە ئاوەزمەند پیشان دەدات کە ئیدی



پێویستیان بە دەسەلاتدارێکی ڕەهای لەو جۆرە نەبێت کە وەکو هۆبز دەڵێ و لە لایەکیتریشەوە بەرادەی پێویست تووشی ئەو پارادۆکسە هاتوون کە سەر ئەنجام بەوە رازی بن کە بەشێك لە دەسەلاتی خۆیان بۆ کۆمەڵگای سیاسی بگوێزنەوە.

## بایەخی تیۆری سیاسیی لۆك

بەم حاڵەش تیۆری سیاسیی لۆك کاریگەریی لەسەر چەرخێکی تەواو لە مێژووی رۆژئاوادا داناوە. تیۆرداڕێژەرانی شۆڕشی ئەمەریکا و هەموو رۆشنگەران بەتوندی لە ژێرکاریگەریی هزرەکانی لۆکدا بوون. هزری لۆك رۆحی لیبرالیزمە، هەرچەندە هێشتا کرچ و کاڵ، ناخود ئاگا و نەختێك تێکەڵ و پێکەڵە. ئەو پتر لە هەر بیرمەندێکی دیکەی بەر لە خۆی، ئازادی بە ئامانجی بەرزی حکوومەت دەناسێنێ. ئەو مرۆڤی بە بوونەوەرێکی ئازاد و ئاوەزمەند ناساند کە مافی ئەوەی هەیە ژیانی خۆی لەسەر بنەمای ئەو شتە ڕێکبخات کە بە دروستی دەزانێت. باشترین کاری حکوومەت ئەمەیە کە دەرفەت بە تاکە مرۆییەکان بدات تا بە دوای ئامانجەکانی خۆیان بکەون. ئەم بیرو رایەی لۆك لە قۆناغەکانی پاش ئەو، بووە سەقامگیرترین ڕەهەندی بۆچوونە سیاسییەکانی ئەوروپا.





# یاداشتەکان

1- C.B. Macpherson, The political Theory of possessive Individualism, Oxford, Clarendon press, 1995, p.91.

٢- اندرو وينسنت، نظريه هاى دولت، ترجمه حسين بشريه، تهران، نشرنى، ١٣٦٩، ص ١٨٠.

3- See William Blackston, Commentaries on Low of England, philadelphia, Lippincot, 1959.

4- See Neil wood, the politics of lokes philosophy, Berkley, 1986.

5- See R.H. Cox, Locke, on war and peace, Oxford University press, 1960.

6- Ellen wood, (Against demoracy: Consent, Representation and sufrrage in tow Treaties), History of Political Thought Vol, XIII. No. 4, 1992, pp, 957-686.

7- Locke Tow Treaties, ed. Petter laslett, Cambridge, 1960, second Treatise sect 142.

8- Martin Hughes, Locke on Taxation and suffrage, history of political thought, vol XI, 1990, pp.423-442.

9- C.B Macpherson, opcit, p.222.

10- Francis Oakly, 'Locke, Natural law and god-again' History of Political Thought, Vol XVIII, No.4, 1997, pp. 624-651.







## پاژی -٤-

## گەڕان بەدوای فەلسەفەی مێژوودا

## مۆنتیسکیۆو تۆژینەوە دەربارەی یاسا

### چەرخی رۆشنگەری و تۆژینەوەی ژیانی سیاسی

سەدەی هەژدەهەمی زایینیی لە ئەوروپا بە تایبەتمەندییەکی گرنگ جیادەکرێتەوە. سەدەی هەژدەهەم بە چەرخی رۆشنبیری یان چەرخی رۆشنگەری ناونراوە. ئەورووپای سەدەکانی شازدەهەم و حەڤدەهەم بە حکوومەتە رەهاکان و حکوومەتە سۆلتەگەراکانەوە دیاریدەکرێت. تیۆری هۆبز بە هزری سیاسیی دیاری ئەم سەردەمە دادەنرێت. بەڵام سەدەی هەژدەهەم، سەردەمی سەرهەڵدانی بزاڤ و هزرە ئازادیخواز و خەڵك سالارەکانە. هزرە دیارەکانی ئەم سەدەیە، تیۆری کەسانێکە لە جۆری لۆك، مونتیسکیۆ و بێنتهام. بۆرژوازی، وەك چینێکی سەردەمساز، سەرەتا لە سەدەکانی شازدەهەم و حەڤدەهەم لەگەڵ میرو پاشا رەهاخوازەکاندا یەکی گرت تا بە کەڵك وەرگرتن لە هێزی ئەوان شکست بە فیودالەکان بهێنێ و لەمەیدان دەریانکات کە سومبول و پارێزەری پەراکەندەیی سیاسی بوون، ئینجا پاش گەیشتن بە ئەم ئامانجە هێرشی کردە سەر پاشایەتییە رەهاکان و حکوومەتە سوڵتەخوازەکان تا ئەوانیش لە گۆڕەپانەکە دەربکات و بە تەنیایی بەڕێوبردنی کاروبارەکان بەدەستەوە بگرێت. بۆرژوازی ئێستا هەستی دەکرد ئەوەندە بە هێز بووە کە ئیدی پێویستی بە پاشا سوڵتەخواز و سیستەمە رەهاکان نەبێت. بەم جۆرە بوو کە رۆحی ئازادی لەم سەدەیەدا کەوتە فڕین.



یەکێك لەو پرسانەی کە لەم سەردەمەدا زەینی فەیلەسووفەکانی فەرەنسای بەخۆیەوە خەریککردبوو تێگەیشتنی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی مرۆڤ بوو. لە درێژەی ئەم هەوڵانەدا بوو کە یەکەمین هەنگاو بۆ دامەزراندنی فەلسەفەی مێژوو هەڵگیران. لە قۆناغەکانی پاشتردا مارکس و هیگل توانییان فەلسەفەی مێژوو بەرەو پێگەیەکی گرنگ بەرزبکەنەوە.

هەروەکو لە بەرگی یەکەمدا ئاماژەی پێکرا یۆنانییە کۆنەکان شتێکیان بە ناوی فەلسەفەی مێژوو نەبوو. ئەوان خاوەن مێژوونووسی گەورەی وەك توسیدید (یا توکودیدس) بوون، بەڵام خاوەن فەلسەفەی مێژوو نەبوون. لە راستیدا ئەوان مێژوویان بە زنجیرەیەك رووداوی لاوەکی و خولەکی دەزانی. هەر لەبەر ئەمەش ئەوان گرنگییەکی زۆریان بە مێژوو نەدەدا کە لە روانگەی ئەوانەوە لەگەڵ هەندێك بڕیار و فەرمانی لاوەکی لە پەیوەندیدا بوو. ئەوان لە ناو شتە گشتی و شتە مەعقوولەکاندا (بۆ وێنە لە ئایدیا) بە دوای راستییەکاندا دەگەڕان. هەروەکو گوتمان ئەم هزرە کە مێژوو رێڕەوێك دەپێوێت کە سەرەتا و کۆتایی هەیە لە تایبەتمەندییەکانی هزری جوولەکە و مەسیحین.

بڕوامەندیی جوولەکە و مەسیحییەکان بە دوارۆژ، زەمینەی سەرهەڵدانی جۆرە تیۆرییەکی وەرچەرخان و گەشەکردن بووە لە مێژوودا.

هەروەکو گوتمان بەسەرنجدان بەم تێڕوانینە بوو کە سێنت ئۆگەستین باوەڕی بە جۆرێك لە فەلسەفەی مێژوو هێنا. بەڵام هزری سێنت ئۆگەستین بە رێڕەوی فەلسەفەی مەسیحی دادەڕۆیشت و لە راستیدا راڤەکردنێکی ئایینی بوو بۆ فەلسەفەی مێژوو. راڤەکردنی نائایینی بۆ فەلسەفەی مێژوو لەگەڵ چەرخی نوێ و هزری مۆدێرین لە پێوەندیدایە. لەسەردەمی نوێ سەرەتا بوسوئە (١٦٢٧-١٧٠٤) بیرمەندی فەرەنسی، کە بۆ خۆی ئوسقوف بوو بە تێڕوانینێکی فەلسەفی، مێژووی مرۆڤی دایەبەر سەرنج. بەڵام لێکدانەوەکەی بوسوئە لە فەلسەفەی مێژوو بە گشتی





لێکدانەوەیەکی ئایینیە، کارەکەی ئەو لەم رووەوە جێی بایەخە کە سەرەتایەکی نوێیە بۆ تێڕوانینی پرسە مرۆییەکان لە گۆشە نیگای فەلسەفەی مێژووەوە.

## جامباتیستا ڤیکۆ

جامباتیستا ڤیکۆ (١٦٨٨-١٧٤٤) فەیلەسووفی ئیتالی دیارترین هزرڤانی چەرخی نوێیە کە بۆ شیکردنەوەی پرسە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان رووی کردووەتە فەلسەفەی مێژوو. ڤیکۆ کارەکەی خۆی بەرەخنەگرتن لە شێوازی دیکارت لە شیکردنەوەی پرسە سیاسییەکان دەستپێدەکات. شێوازی دیکارت شێوازێکی بیرکاری-شیکاری بوو. بە پێی ئەم شێوازە ئێمە دەبێ ئەو بابەتەی کە دەیخەینە بەر توێژینەوە ئەوەندە شیبکەینەوە تا دەگەینە بەشە ساکارو سەلماوەکەی. ئینجا بە دەستپێکردن لە بەشە سەلماوەکەی هەنگاو بە هەنگاو بەرەو پێشەوە دەچین تا دەگەینە ئاوێتە ئاڵۆز و گشتیترەکان. دیکارت کە بە هێرشکردنە سەر دۆگماکانی بەر لە خۆی، چەرخێکی نوێی لە زانست کردەوە، خاڵی دەستپێکی خۆی لەسەر بنەمای گومان بنیاتنا. هەروەکو بە ناوبانگەو دەڵێت کە ئەو گومانی لە هەموو شتێك دەکرد و ئەم کارەی وەك تێڕوانینێکی زانستی تا ئەو جێگایە بەرەو پێشەوەبرد کە بە وتەی خۆی گەیشتە پرەنسیپێکی سەلماو. بەڕای ئەو، ئەم پرەنسیپە سەلماوە ئەمەبوو کە ((من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم)). واتای ئەم وتەیە ئەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێ گومان لە هەموو شتێك بکات، بەڵام ناتوانێ گومان لەو راستییە بکات (بیردەکاتەوە) کە گومان دەکات. شێوازی دیکارت لە سەدەی حەڤدەهەم وەك شێوازێکی باو لە لایەن گەلێك لە هزرڤانانەوە پەسندکراو چەرخی نوێ و زانستی نوێی لەگەڵ ناوی دیکارتدا گرێدا. ئێمە بینیمان کە هۆبزیش روویکردە ئەم شێوازە شیکاری-بیرکارییە بۆ راڤەکردنی کۆمەڵگای سیاسی و سیستەمە سیاسییەکان. ئەو کۆمەڵگای سیاسی بە تاك و تاکی بە هەست و ئاوەز و هەستەکانیشی بە ئارەزووەکان و ئارەزووەکانیشی بە گشتیترین،



ساکارترین و سەلماوترین ئارەزوو واتە ئارەزووی پاراستنی خود شیکردەوە، ئینجا لەم خاڵەوە بەرەو چۆنێتی سەرهەڵدان و ناوەڕۆکی کۆمەڵگای سیاسی هەنگاوی هەڵگرت. ڤیکۆ رەخنە لە لایەنگرانی نەریتی دیکارت دەگرێت و دەڵێت ناتوانین ئەم شێوازەی کە بۆ بیرکاری شیاوە، بۆ بەسەرهاتی مرۆیی و سیاسەت و مێژوو بەکاری بهێنین. بابەتە بیرکارییەکان دروستکراوی زەینن و بەم شێوازە دەتوانین لێیان بکۆڵینەوە، بەڵام مێژووی مرۆڤ دروستکراوێکی زەینی نییە کە بە شێوازی بیر شیبکرێتەوە. ڤیکۆ شێوازی هۆبز بەلاوە دەنێت کە لە تاکەوە دەستپێدەکات و جەخت لەسەر تۆژینەوەی کۆمەڵە مرۆییەکان دەکات. ڤیکۆ بە تۆژینەوەی مێژوو لەم روانگەیەوە پەی بە هەندێ پرس دەبات وەك چۆنێتی بزاوتنی کۆمەڵگاکان لە سیستەمە خێڵەکییەکانەوە بۆ سیستەمی کۆیلەداری، دابەشبوونی کۆمەڵگا بەسەر چینەکان، دامەزراندنی حکوومەت و ململانێی چینەکان بۆ پاراستن یا گۆڕینی ئەو دۆخەی کە لە ئارادایە. ئەو مێژووی رۆژئاوا بۆ چەند سەردەمێك دابەشدەکات کە بریتین لە: "چەرخی پاڵەوانان" (چەرخی ئەفسانەکان)، "چەرخی مرۆڤەکان" (سەردەمی کۆن) و "چەرخی خودایان" (سەردەمی مەسیحییەت و سەدەکانی ناوەڕاست). بەم جۆرە ئەو بە شێوازێکی جیاواز لە نەریتی دیکارت و هۆبز (واتە شێوازی شیکاری-بیرکاری) بە پرسەکانی کۆمەڵگای مرۆیی و سیستەمی سیاسییەوە خەریکدەبێت. بەم جۆرە ڤیکۆ شێوازێکی هەڵبژارد کە بە فەلسەفەی مێژوو کۆتایی پێدێت. مونتیسکیۆ. بیرمەندی بە ناوبانگی چەرخی رۆشنگەریش لە فەرەنسا، هەر ئەم شێوازەی گرتەبەر.





# مونتیسکیۆ

## Montesquieu

بارۆن دۆسکوندات مونتیسکیۆ (١٦٨٩-١٧٥٥) لە بنەماڵەیەکی ئاریستۆکراتی دێرین لە دایکبووە. ئەو کە لە قەڵایەکی فیۆدالی لە دایکببوو لە تەمەنی ١١ ساڵییەوە نێردرایە قوتابخانەیەك لە شار و لەوێش بە شێوازی باوی ئەو سەردەمە خەریکی فێربوونی زانستی وتاربێژی بوو. بەر لەمەش مۆنتیسکیۆ لە ماڵەوە فێری زمانی یۆنانی ببوو و لێرەش زمانی لاتینی فێربوو. پاش تێپەڕاندنی قۆناغە سەرەتاییەکان، سەرئەنجام ڕۆیشتە پاریس و خوێندنی زانکۆی لەوێ تەواوکرد و لەگەڵ هزرڤانانی هاوچەرخی خۆیدا ئاشنابوو. مونتیسکیۆ بە کەڵك وەرگرتن لە ئیمتیازی ئاریستۆکراتیەت لە پەرلەمانی هەرێمیدا بەشداریکرد و گەلێك ئەزموونی سیاسی بە دەستهێنا.

نامە ئێرانییەکان بە یەکەمین نووسینی مونتیسکیۆ دادەنرێت. مۆنتیسکیۆ لەم کتێبەدا بە شێوازێکی تەنزئامێز (گاڵتەئامێز) بارودۆخی فەرەنسای سەردەمی خۆی دەخاتە روو. ئەم بەرهەمە جۆرێك لە ڕێژەگەرایی فەرهەنگی تێدا بەدی دەکرێت. ئەو هەروەها ڕەخنە لە شێوازی هۆبز دەگرێت و دەڵێت کە مرۆڤ بەردەوام لە کۆمەڵگادا دەژێت و ناتوانین بە جیا لە کۆمەڵگا بیخەینە بەرتۆژینەوە. یەکێك لە گرنگترین نووسینەکانی مۆنتیسکیۆ، کتێبی ڕۆحی یاساکانە کە خۆی لەراستیدا کۆکراوەی زنجیرە کتێبێکە. نزیکەی بیست ساڵ کاری لەسەرکردووە. ئەو بەم لێکۆڵینەوانە کە ناوەڕۆکی ڕۆحی یاساکان پێکدەهێنێ دەگاتە ئەم ئەنجامە کە مێژووی مرۆڤ و ڕێکخستنی کۆمەڵگا مرۆییەکان شتێکی ڕێکەوت نییە و لە ڕۆحێکی گشتی ناو کۆمەڵگاوە سەرچاوە دەگرێت کە لە داب و نەریت، ئایین و شێوازەکانی حکوومەتەوە هەڵقولاون. مۆنتیسکیۆ بە لێکۆڵینەوە لە مێژووی ڕۆم گەیشتە ئەم ئەنجامانە.



## تۆژینەوە لە یاسا

مونتیسکیۆ لە گرنگترین بەرهەمی خۆی، ڕۆحی یاساکان، تۆژینەوەیەکی بەراوردکاری کۆمەڵگا، یاسا و حکوومەت دەکات. کارەکەی مونتیسکیۆ لە لایەکەوە کۆمەڵناسانەیە، و لە لایەکی ترەوە بەراوردکارییە و لە ئەنجامدا بۆ دۆزینەوەی یاساکانی زاڵ بەسەر کۆمەڵگا مرۆییەکاندا بوو (کە بە فەلسەفەی مێژوو ناومان لێبرد). کاری مۆنتیسکیۆ بە داهێنانێکی نوێ دادەنرێت. هەرچەندە وەك گوتمان ئەرەستۆش ڕوویکردە تۆژینەوەی پشکنەرانە و بەراوردکاری یاساکان، بەڵام ئەو بەدوای ئەوەوە نەبوو کە یاساکانی زاڵ بەسەر مێژووی مرۆڤدا بدۆزێتەوە. هەروەکو گوتمان یۆنانییەکان لە بنەڕەتدا گۆشە نیگایەکی لەو جۆرەیان بۆ مێژوو نەبوو. ئەرەستۆ دەیویست باشترین سیستەم بۆ هەلومەرجە دیارەکان بدۆزینەوە. بەڵام مۆنتیسکیۆ بەسەرنجدان بە ڕۆحی چەرخی مۆدیرن و جۆری تێڕوانینی خۆی دەیویست هەندێ یاسای گشتی بۆ کۆمەڵگا مرۆییەکان بدۆزێتەوە. ئەوەی کە ئایا لەم کارەدا سەرکەتوو بووە یان نا ئەوە بابەتێکی ترە.

هەرچەندە بە لێکدانەوەی هەندێ لە ڕاڤەکاران، مۆنتیسکیۆ لە ئەنجامدا دەگاتە جۆرێك یاسای سروشتی لە پشت هەموو یاساکانەوە و ئێمە لێرەدا بەبێ ئەوەی لەسەر ئەم لێکدانەوەیە مشتومڕ بکەین جەخت لەسەر ئەم بڕیارە دەکەینەوە کە تێڕوانینی مۆنتیسکیۆ لە بەرامبەر تێڕوانینی کۆن و نەریتی سەقامگیربووی هزری ڕۆژئاوادا ڕادەوەستێ کە ئاراستەکەی بەرەو یاسایەکی سروشت بوو و لەو باوەڕەدا بوو کە یاسایەکی ئەزەلی و هەتا هەتایی هەیە کە یاسا مرۆییەکان ڕەنگدانەوەی ئەو یاسایەن. مۆنتیسکیۆ لەو باوەڕەدایە کە زەینی خۆی لەهەر جۆرە دادوەریکردنێکی پێشوەختە سڕیوەتەوە و تەنها لەسەر بنەمای تۆژینەوە ئەزموونییەکان دەیەوێ بنیاتەکان یان پرەنسیپە سەرەتاییەکانی سیستەمە یاساییەکان و بنەماکانی زاڵ بەسەر مێژووی نەتەوەکاندا بدۆزێتەوە.

## جۆرەکانی حکوومەت

مۆنتیسکیۆ کارەکەی خۆی بە توێژبەندی پێکهاتە سیاسییەکان دەست پێدەکات. ئەو حکوومەتەکان بەسەر سێ جۆردا دابەشدەکات. ئەو لەسەر شێوازێکی تایبەتی ئەم دابەشکردنە ئەنجامدەدات. بەپێی شیکردنەوەی مونتیسکیۆ هەریەك لەم سێ جۆرە حکوومەتە بنەما و سروشتێکی تایبەت بە خۆیان هەیە. مەبەست لە بنەما هێزی بزوێنەری کەسە چالاکەکانی حکوومەت و مەبەست لە سروشت ئارایشتی ئەو کەسانەیە کە دەسەڵاتی باڵا یان گرووپی دەسەڵاتدا پێك دەهێنن. یاسادانەر دەبێ بەسەرنجدان بەم دوو گرفتە، یاسا یان سیستەمی کۆمەڵگا ڕێکوپێك بکات و بیپارێزێت. تەنانەت ئەگەر بیەوێت سیستەمی کۆمەڵگاش بگۆڕێت دەبێ ئەم دوو بەشە لەبەرچاو بگرێت. مەبەست لە یاسادانەریش هەر ئەو چەمکەیە کە هزرڤانانی ڕۆژئاوا بەشێوەیەکی کلاسیکی باسیان لێوەکردووە: کەسێکی دەگمەنە کە بانگهێشت کراوە تا دەستووری کۆمەڵگا (یا لە ڕاستیدا بنەماکانی سیستەمی کۆمەڵگایەك) بنیات بنێت، کەسێکی وەك سۆلۆن یا لیکۆرك لە یۆنانی کۆن.

یەکەمین جۆری حکوومەت، حکوومەتی کۆمارییە. کۆماری لە ڕووی سروشتەوە لەسەر بەشداریکردنی هەموو خەڵك یان بەشێکی تایبەت لە کۆمەڵگا (بۆ وێنە ئاریستۆکراتەکان) وەك دەسەڵاتی زاڵ بنیاتنراوە. بەڵام لە ڕووی پرەنسیپ یان ئارەزووی بزوێنەری کەسە چالاکەکانەوە پشت بە بناغەی فەزیلەتی مەدەنی دەبەستێ. دووهەمین جۆری حکوومەت پاشایەتییە. ئەم حکوومەتە لە ڕووی سروشتەوە لەسەر دەسەڵاتداریێتی پاشایەك بنیاتنراوە کە یەکەم بە هۆی یاسا دیاریکراوەکان و دووهەم لە کەناڵی دیاریکراوەوە (پەرلەمان و ئۆرگانەکانی حکوومەتی ئاریستۆکراتی) کۆمەڵگا بەڕێوەدەبات. لە ڕووی پرەنسیپەوە، حکوومەتی پاشایەتی لەسەر شانازی و ئابڕووخوازی بنیاتنراوە. مونتیسکیۆ ئەو پاشایانەی کە بەسەر ئەو وڵاتانەدا حکوومەتایەتی دەکەن کە خاوەن پانتایەکی ناوەنجین، لەوانەش حکوومەتی فەرەنسا لەم ڕیزە دادەنێت. لەم حکوومەتانەدا



گرووپە ناوبژیوان و گرێدەرەکان لە نێوان پاشا لە لایەکەوە و جەماوەری خەڵك لە لایەکی ترەوە جێگیر دەبن. لەم جۆرە حکوومەتانەدا پاشا و ڕەسەنزادەکان بە شێوەیەکی بەرامبەر وابەستەی یەکترن و ڕەسەنزادەکان وەك هێزی گرێدەر و ناوبژیوان سروشتی حکوومەت بەرەو نەرمڕەوی و میانڕەوی پاڵ پێوە دەنێن. جۆری سێهەم حکوومەتی تاکڕەوییە. سروشتی حکوومەتی تاکڕەویی لەسەر دەسەڵاتداریێتی کەسێکی تاکڕەو و بنەماکەشی لەسەر ترس دامەزراوە. لە حکوومەتی تاکڕەوییدا هیچ هێزێکی گرێدەر لە نێوان جەماوەری خەڵك و کەسی تاکڕەو لە ئارادانییە. ڕەنگە بتوانین بڵێین کە ئایین تەنیا هێزی هەموارکەرە. لە حکوومەتی تاکڕەویدا دەسەڵاتی سیاسی داوای ملکەچبوونی بێ مەرج لە خەڵك دەکات. ئەم جۆرە حکوومەتە دەیەوێ خەڵك ترسنۆك و نەزان بن. تاکەکانی خەڵك لەبری ئەوەی بۆ ڕێزگرتنی بەرامبەر پەروەردەبکرێن بە جۆرێك پەروەردە دەکرێن کە تەنیا وەڵامی ترس و توندوتیژی دەدەنەوە. حکوومەتی تاکڕەویی نە پێویستی بە فەزیلەتی شارستانی و نەپێویستی بە شەرەف و ئابڕوو هەیە، بەڵکو تەنیا پێویستی بەشەهوەتە مرۆییەکان هەیە کە لە هەموو جێگایەك زۆر و زەبەندەن. بە گشتی ئیمپراتۆریەتە گەورەکان بەم شێوازە بەڕێوە دەچن. ئێمەی خەڵکی ڕۆژهەڵات بە چاکی شارەزای ئەم جۆرە حکوومەتانەین.

پێویستە ئەوەش بە بیربهێنینەوە کە ئەم سێ جۆرە لە ڕاستیدا سێ جۆری نموونەیین. مونتیسکیۆ (جۆرێکی نموونەیی) یا مۆدیلێکی وای لە حکوومەت دەستەبەندی کردووە کە بۆ خۆشی دەزانێ لە جیهانی دەرەوە جۆراوجۆرییەکان لەوە زیاترن کە ئێمە بتوانین ئەم سێ جۆرە وەك سێ چوارچێوە لەبەرچاو بگرین کە هەر دەبێ حکوومەتەکان لەناو ئەو چوارچێوانەدا دەستەبەندی بکەین. ئاشکرایە کە نموونە ڕاستەقینەکان ڕەنگە بە ئاستێکی جیاواز لەم نموونە دیاریکراوانە دووربن. مونتیسکیۆ لەڕاستیدا ڕۆحی هەریەك لەم سێ جۆرەی دۆزیوەتەوە و لەسەر ئەو بنەمایە سێ جۆری نموونەی دەستەبەندی کردووە. ئەم شێوازە واتە دەستەبەندی





جۆرە نموونەییەکان پاشان، لە کارەکانی ماکس ڤیبەر، کۆمەڵناسی بە ناوبانگی ئەڵمانی، فراوان کرا و ناوبانگی دەرکرد.

## دابەشکردنی دەسەڵاتەکان و هاوسەنگی دەسەڵاتەکان

مونتیسکیۆ یەکێك لە ڕێگاکانی چاکسازیی حکوومەتەکان بەمەبەستی گەرەنتی کردنی ئازادییەکان بە ئامادەکاریی ئەو حکوومەتانە دەزانێ بۆ دابەشکردنی دەسەڵاتەکان. مونتیسکیۆ پرەنسیپی دابەشکردنی دەسەڵاتەکانی بە لێکۆڵینەوە لە ئەزموونی سیستەمە سیاسییەکانی ئینگلتەرا بە دەستهێناوە. ئەو وەکو ئاریستۆکرات ئەندامی پەرلەمانی هەرێمی و وەك بیرمەندێکی ڕۆشنبیر لایەنگیری شێوازی لیبرالی بوو بۆ بەڕێوەبردنی سیاسی. مۆنتیسکیۆ سەرنج دەداتە سەر پرەنسیپی دابەشکردنی دەسەڵاتەکان وەك ئامرازێك بۆ هاوسەنگکردنی دەسەڵات بە هۆی خودی دەسەڵاتەوە. لەسەر ئەم بنچینەیە مۆنتیسکیۆ لەو باوەڕەدایە کە هەرسێ دەسەڵاتی یاسادانان، جێبەجێکردن و دادوەری دەبێ لە یەکتر جیابن با یەکتر هاوسەنگ بکەن و پێش بە دروستبوونی دەسەڵاتی تاکڕەوی بگرن.

ئێستا ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە کە ئەگەر ئەم سێ دەسەڵاتە (یاسادانان، جێبەجێکردن و دادوەری) هەرسێکیان لە دەستی یەك چین یان گرووپدا بن ئایا دیسان دەتوانن یەکتر هاوسەنگ بکەن؟ وەڵامەکە نیگەتیڤە. بەم جۆرە مونتیسکیۆ دەگاتە ئەم ئەنجامە کە بۆ پاراستنی ئازادی لە کۆمەڵگادا دەبێ گرووپی جۆراوجۆر لە کۆمەڵگادا هەبن کە یەکتر هاوسەنگ بکەن. لە ڕاستیدا مونتسکیۆ دەگاتە ئەم ئەنجامە کە فرە گرووپی مەرجی پێشەکییە بۆ بوونی ئازادی. ئەم گرووپانە دەبێت بە لایەنی کەمەوە تارادەیەك لە حکوومەت سەربەخۆبن و لە نێوان تاك و حکوومەتدا ڕابوەستن. ئەم تیۆرییەی مۆنتیسکیۆ ئەمڕۆش گەلێك لایەنگیری لەناو ئەو کەسانەدا هەیە کە بەرگری لە تیۆری دیموکراسی دەکەن بە واتای فرەیی گرووپە سیاسییەکان و ڕکابەری سیاسی.



یەکێك لە بۆچوونە گرنگەکانی ڕۆحی یاساکان ئەوەیە کە پێکهاتەی گرێدەرەکانی نێوان جەماوەری خەڵك و حکوومەت، لەوانەش پەرلەمان و دادگا ناوچەییەکان، سەندیکاکان و ئیمتیازاتی ئاریستۆکراتی ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە بۆ پێشگیری کردن لە دەستدرێژی کردنی حکوومەت بۆ سەر ئازادییەکان. چەمکی (کۆمەڵگای مەدەنی) وەك هێزێکی ناوبژیوان لە نێوان حکوومەت و خەڵك کە ئێمە ئەمڕۆ زۆر بەکاری دەهێنین نزیکایەتییەکی زۆری لەگەڵ ئەم تیۆرییەی مۆنتیسکیۆدا هەیە.

## ئەدگاری نەتەوەیی و فرەیی یاساکان

یەکێك لەو دڵ پەرێشانییەکانی مۆنتیسکیۆ ئەم پرسەیە کە بۆچی هەر نەتەوەیەك خاوەنی زنجیرەیەك یاسای دیاریکراو و تایبەت بە خۆیەتی. مۆنتیسکیۆ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا کە چ ڕاڤەکردنێك بۆ ئەو پێکهاتە و زنجیرە یاسا جیاوازانە لە نێوان نەتەوەکاندا هەیە باس لە دوو جۆر یان دوو دەستە لە هۆکارەکان دەکات. یەکەم هۆکارە فیزیاییەکان و دووهەم هۆکارە ئەخلاقی یان مەعنەوییەکان. لە نێوان هۆکارە فیزیاییەکانی سەرزەوی جێگای سەرەکی هەیە. تایبەتمەندییە جوگرافیاییەکانی سەرزەوی، ئاستی چڕی دانیشتوان و پانتایی خاك لەو هۆکارە فیزیکیانەن کە کاریگەرییان لەسەر سایکۆلۆژیا و زەینی تاکەکاندا هەیە. بەڵام ئەمانە بە شێوەی ڕاستەوخۆ و بەبێ هۆ شێوازی ژیانی کۆمەڵگا دیاری ناکەن. ئەمانە لە ڕێگای هۆکارە ئەخلاقییەکان و لەوانەش کارتێکردنیان لەسەر سایکۆلۆژیای خەڵك کاریگەریی لەسەر ئەدگارە یاساییەکانی وڵاتێك دادەنێن.

بەڵام هۆکارە ئەخلاقییەکان فرەن: لەوانەش دەتوانین ئاماژە بە ئایین، داب، نەریت، ئابووری، بازرگانی و هەڵسوکەتی هزری بکەین. لە کۆی ئەمانە ڕۆحی گشتی یان مەعنەویاتی گشتی وڵات یان نەتەوەیەك شکڵ دەگرێت کە هەوێنی یاساکانی ئەو وڵاتە یان ئەو نەتەوەیە پێکدەهێنێ. دەتوانین بە لێکۆڵینەوەی ئەزموونی ئەم فاکتەرانە بناسین. لە نێوان ئەم هۆکار و فاکتەرانە، ئایین پێگەیەکی گرنگتری





هەیە. لە حکوومەتی تاکڕەویی، ئایین دەتوانێ لە بەرامبەر تاکڕەویدا فاکتەرێکی وەستێنەر بێت، بەڵام لە حکوومەتی جۆری کۆماری دەبێ پێش بە زۆربوونی دەسەڵاتی پیاوانی ئایینی بگیردرێت. پاش ئایین، داب و نەریت دەتوانێ کاریگەری زۆر لەسەر رۆحی گشتی نەتەوە دابنێت.

لەبەر کارتێکردنی ئەم فاکتەرە جۆراوجۆرانەیە کە هەر نەتەوە یان وڵاتێك زنجیرەیەك یاسای تایبەتی هەیە و یاسادانەر لە رێکوپێککردن و چاکسازی کۆمەڵگا دەبێ ئاوڕیان لێبداتەوە.

# پاژی -٥-

## هزرڤانانی سەر بە دیدگای سوودگەرایی

### سوودمەندی وەك بنیاتی كۆمەڵگای سیاسی

### سوودمەندی و سیستەمی سیاسی

تۆماس هۆبز و جۆن لۆك كە لە پاژەكانی رابردوودا باسمان لێوەكردن بە لایەنگرانی گرێبەستی كۆمەڵایەتی لە قەڵەم دەدرێن. هەروەكو بینیمان ئەوان مافی سروشتی و گرێبەستی كۆمەڵایەتیان بە بنیاتی كۆمەڵگای سیاسی و سیستەمی سیاسی لە قەڵەم دەدا بۆ پاراستنی ئەم مافە سروشتییە. تیۆری گرێبەستی كۆمەڵایەتی كە راڤەكردنێكی عەقڵگەرایانە بوو لە لایەن دەستەیەك لە هزرڤانانی هاووڵاتی خۆیانەوە درایە بەر رەخنە كە بزاڤێكی پڕ بایەخی تازەیان لە رەوتی هزری سیاسییدا بنیاتنا. دیڤید هیوم، جێرمی بێنتهام، جەیمز میل و ستیوارت میل لەو بیرمەندانەن كە بە تێڕوانینێكی سوودگەرایانە سەیری سیستەمی سیاسی، دەوڵەت، حكوومەت، دادپەروەری، یاسا، رەزامەندی و بۆچوونی لەم جۆرەیان دەكرد كە تەوەری پرسەكانی پەیوەست بە هزری سیاسی بوون. تێڕوانینی سوودگەراییش هەر لە دەیڤید هیومەوە كە یەكەمین تیۆرداڕێژی ئەم رەوتە هزرییە بوو هەتا ستیوارت میل كە دوا تیۆر داڕێژی ئەم بنیاتە هزرییە بوو رەوتێكی هەوراز ئاسایی بڕی كە لە ئەنجامدا بووە بناغەگەلێكی تیۆری بۆ دیموكراسیی نوێنەرایەتی و رۆڵی خۆشگوزەرانی دەوڵەت. ئێمە بە نەختێك خۆبواردن لە



ریزبەندی مێژوویی (دەربارەی هەندێك لەم بیرمەندانە) لە یەك جێگاو لە چوارچێوەی پاژێكدا هزر و بۆچوونە سەرەكییەكانی ئەوان دەخەینە بەر باس.

خاڵی سەرەكی دەربارەی بنیاتی هزریی ئەم هزرڤانانە ئەوەیە كە بەپێی تێڕوانینی سەرەكی ئەوان خێرو قازانجی كەسی بناغەی رەفتاری تاكە و پرەنسیپی قازانجی گشتی بناغەی سیستەمی سیاسییە. ئەم دەستە هزرانە كە لە زمانی فارسی بە هەندێ زاراوەی وەك (رەسەنایەتی سوودمەندی)، (رەسەنایەتی قازانج) و (بەرژەوەندیگەرایی) ناوبراون پشت بەم بەڵگەیە دەبەستن كە هۆكاری بوونی كۆمەڵگای سیاسی و حكوومەت و سیستەمە پەیوەندیدارەكانیان بۆ سوودمەندبوونی ئەم دامەزراوانە دەگەڕێتەوە. لە بۆچوونی گرێبەستی كۆمەڵایەتی بەو جۆرەی كە هۆبز و لۆك باسیان لێوە كردبوو رەزامەندی تاكەكان لە دامەزراندنی كۆمەڵگای سیاسی و دەوڵەت بە یەكجار و بۆ هەمیشە لە سەرەتای رۆیشتنە ناو گرێبەستی كۆمەڵایەتییەوە رەچاو كرابوو كە ئەمەش كەموورییەكی گرنگ بوو. سوودگەرایی بە پشتبەستن بە پرەنسیپی سوودمەندبوون وەك بنەڕەتی سیستەمی سیاسی، بەشداریكردنی سیاسی وەك پێویستییەكی بەردەوام هێنایە ئاراوە.

تێڕوانینی سوودگەرایی، هەروەكو لە داهاتوودا دەبینین، لە بواری كۆمەڵگای مەدەنی (كۆمەڵگا) و دەوڵەتی (حكوومەت) لە یەكتر جیاكردەوە كە ئەمەش بە یەكێك لە دەستكەوتە مەزنەكانی ئەم رەوتە هزرییە دادەنرێت لە مێژووی هزری سیاسییدا. ئەم هزرڤانانە لەو باوەڕەدا بوون كە مرۆڤەكان بە دوای شادمانی و بەختەوەریدا دەگەڕێن و گەڕان بە دوای چێژ و شادمانیش شتێكی چاكە و دروستترین كرداریش ئەوەیە كە زیاترین شادمانی و بەختەوەری فەراهەم بكات و تاكە پاساوی دەوڵەت ئەمەیە كە گەورەترین بەختەوەری بۆ زیاترین ژمارەی تاكەكان فەراهەم بكات. لە باسەكانی خوارەوە بنەما و رێڕەوی ئەم رەوتە هزرییە دەخەینە روو.





## ١- دەیڤید هیوم

## David Hume

### سوودمەندی گشتی وەك بناغەی سیستەمی سیاسی

دەیڤید هیوم (١٧١١-١٧٧٦) فەیلەسووفی ئەزموونگەرایی ئینگلیزی پتر لە هزرەکانی مەعریفەناسیدا بە ناوبانگە تا ئەوەی کە وەك هزرڤانێکی سیاسی ناسرابێت. هیوم کە هەرگیز خاوەن پلەو پایەیەکی زانکۆیی نەبووە بە دوو کتێبی (لێکۆڵینەوە دەربارەی تێگەیشتنی مرۆڤ) و (نامیلکە دەربارەی سروشتی مرۆڤ) ناوبانگێکی زۆری بە دەستهێناوە. لە هزری سیاسییدا نە پلەو پایەیەکی لە ئاستی هۆبز و لۆك هەیە، کە بە رەخنە لێگرتنیان رەوتێکی نوێ لە هزری سیاسییدا بنیات بنرێت، و نە لە ئاستی بێنتهامیش کە درێژەپێدەری تێڕوانینی ئەو بووە لە فەلسەفەی سیاسییدا. نووسینەکانی هیوم لە بواری سیاسەت نزیکەی (٢٠) وتارێك دەبن. ئەو لەم وتارانەدا دەربارەی ناوەڕۆکی ئەخلاقیات، پەیمان، دادپەروەری و موڵکدارێتی، بەتایبەت سەرچاوەی کۆمەڵگای سیاسی هەندێ تیۆری نوێی خستۆتە روو کە بوونەتە هۆی ئەوە کە لە بواری هزری سیاسییدا پێگەیەکی پێببەخشن.

### سەرچاوەی کۆمەڵگای سیاسی

هیوم تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتی دەداتە بەر رەخنە کە پاش هۆبز تا سەردەمی ئەو لەناو تیۆرداڕێژەرانی سیاسییدا پێگەیەکی گەورەی بە دەستهێنا بوو. هیوم لە وتارێکدا لە ژێر ناونیشانی (دەربارەی سەرچاوەی گرێبەست) رەخنە لەم هزرە دەگرێت کە کۆمەڵگا لەسەر بنەمای گرێبەستی کۆمەڵایەتی بنیات دەنرێت، و بۆ نموونە دەڵێ گەلێك جار حکوومەت لەسەر بنەمای توندوتیژی و تووڕەیی و زاڵبوون بنیات نراوە. هەر حکوومەتێك کە بیەوێت وەفاداربێت بە گرێبەستێکی راستەقینە



پتر لە پێنج خولەك بەردەوام نابێت. ملکەچی بەرامبەر بە حکوومەت بە هۆی ئەو قازانجەیە کە هەیەتی و هەر لەسەر ئەم بنەمایەش دەبێت ملکەچی بێت. ئەو گوتی کە پێویست ناکات بەو جۆرەی کە هۆبز و لۆك گوتوویانە، بنەمای ئەرکی سیاسی لەسەر گرێبەستی کۆمەڵایەتی بنیات بنێین.

رەگ و ریشەی وەفاداربوون بە بەڵێنەکان کە بنچینەی سەقامیگیریی و جێگیریی پەیمانەکانە بۆ سوودمەندییان دەگەڕێتەوە. بە رای هیوم بۆچوونی لۆك دەربارەی سەرچاوەی حکوومەت و ئەخلاق لەگەڵ زنجیرەیەکی پێچەڵپێچ و ناپێویست ئاوێتە کراوە. هیوم دەپرسێت بۆچی لە جیاتی ئەوە راستەوخۆ بۆ پرەنسیپی سوودمەندی نەگەڕێینەوە؟

بەم جۆرە هیوم سەرچاوەی کۆمەڵگای ئۆرگانیزەکراو (دەوڵەت) لە قازانجەکەیدا دەبینێ، و بەم جۆرە بەڵگەی دەهێنایەوە کە تاك بە تەنیایی ناتوانێ هەموو پێداویستییەکانی خۆی وەك بوونەوەرێکی مرۆیی بەدی بهێنێ. کە وابوو بەرژەوەندی تاکەکان وا دەخوازێ کە لە کۆمەڵگایەکی ئۆرگانیزەکراودا بژین. بەڵام هیوم پەیمان و گرێبەستەکانیش بە تەواوی پشتگوێ ناخات. لە وتاری (دەربارەی سەرچاوەی حکوومەت) بە شێوازی تایبەتی خۆی بۆ پەیمانەکانیش دەگەڕێتەوە و دەڵێ ئەو بەرژەوەندییەی کە تاك بە کۆمەڵگاوە گرێدەدات لە هەمانکاتدا وا دەخوازێ کە هەندێ پەیمان لە کۆمەڵگادا سەرهەڵبدەن کە کاروباری مافەکان و موڵکدارێتی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگادا رێك بخەن. ئەم پەیمانانە سەقامگیریی بە موڵکدارێتی داراییەکان و ئاسوودەیی خەیاڵ بە ئەندامانی کۆمەڵگا دەبەخشن.

### سەرچاوەی ئەخلاقیات و دادپەروەری

فەلسەفەی ئەخلاقی هیومیش هەر لەسەر بنەمای ئەم سوودگەراییە دامەزراوە. بە رای هیوم وێناکردنی ستەم و دادپەروەری و بێدادیش هەر لێرەوە سەرچاوەدەگرێت. ئەو شتەی کە وا دەکات کە دادپەروەری وەك (ئیلزامێکی





سروشتی) لێبێت سوودمەند بوون و گونجاوبوونیەتی لەگەڵ بەرژەوەندی تاك. بەم جۆرە دادپەروەریش هەروەك دەوڵەت دیاردەیەکی دەستکرد و دروستکراوی مرۆڤە. هەروەکو پێشینان دەیانگوت دادپەروەری فەزیلەتێکی سروشتی نییە بەڵکو بە هۆی پەیمانی بەردەوامی نێوان تاکەکان سەریهەڵداوە.

بەم حاڵەش دادپەروەری هەرچەندە دەستکردە (نەك سروشتی) بەڵام بە شێوەیەکی خۆڕسك سەرهەڵنادات، بەڵکو بە هۆی پەیوەندی لە نێوان مرۆڤەکان و لەسەر بنەمای بارودۆخ و ڕەوش و بەرژەوەندی گشتی سەرهەڵدەدات. بەوتەیەکی تر دادپەروەری وەك دەزگایەك و سیستەمێك سەرهەڵدەدات.

## سەرچاوەی حکوومەت

ئەگەر ئەم دادپەروەرییەی کە لە پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا و گونجاو لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی سەرهەڵدەدات بۆ بەردەوامبوونی ژیانی کۆمەڵگا بەس بوایە، ئیدی بوونی حکوومەت پێویست نەدەبوو. ئەگەر حکوومەت هیچ قازانجێکی نەبێت ئەوا دەرفەت بۆ بوونی دروست نابێت.

حکوومەت وسیستەمی سیاسی بۆ پاراستن و پەرەپێدانی دادپەروەری بەرپاکراون کە بەبێ بوونی ئەوان ئاشتی و ئارامی و هێمنی مەیسەر نابێت. دامودەزگای بەر بڵاوی حکوومەت بۆ بڵاوکردنەوەی دادپەروەرییە. بەڵام جگە لەمە، حکوومەت قازانجێکی دیکەشی هەیە و ئەویش ئەوەیە کە خەڵك دەتوانن بە هۆیەوە بەرنامە درێژخایەنەکانی خۆیان بۆ چاکە و بەرژەوەندی گشتی ڕێکبخەن. حکوومەت دەتوانێ جادە، پرد، بەندەر، هێزی دەریایی و سوپا دروستبکات. تاك بە ژیانی لەناو بنەماڵەو کۆمەڵگادا پەی بە قازانجی پەیوەندییە سیستماتیکییەکان و چاکەی هاوبەش و ملکەچی بۆ حکوومەت دەبات. هێوم بە پێچەوانەی هۆبز و لۆك کە ئەرکی تاك بۆ ملکەچبوون بەرامبەر بە دەوڵەت لەسەر بنەمای گرێبەستی کۆمەڵایەتی دادەنێن، قازانج بە سەرچاوەی ملکەچبوون دەزانێ. دەوڵەت بوونی



هەیە چونکە تاك لەسەر بنەمای بەرژەوەندی خۆی ملکەچی دەبێت. واتای پێچەوانەی ئەم وتەیە ئەمەیە کە ئەگەر دەوڵەت قازانجێکی نەبێت ئەوا تاك ملکەچی نابێت و ئەو دەرەنجامەی کە دەتوانین لەم بڕیارە وەربیگرین ئەوەیە کە دەوڵەت دەبێ بەرژەوەندی تاکەکان لەبەر چاوبگرێت. شیکردنەوەیەکی لەم جۆرە پێگەی ڕەزامەندی و بەشداری تاکەکان لە کۆمەڵگا بەرز دەکاتەوە. بەم جۆرە بوو کە لایەنگرانی سوودگەرایی لە سەردەمی خۆیاندا دەخرانە ریزی هزرڤانان و چاکسازیخوازانی رادیکال.

## ڕەخنەگرتن لە بانگەشەی مافی خودایی پاشاکان

هیوم لە وتاری (لێکۆڵینەوە دەربارەی گرێبەستی سەرەتایی) ڕەخنە لە تیۆری مافی خودایی پاشاکان دەگرێت. تیۆرداڕێژەرانی مافی خودایی پاشاکان بەم جۆرە بەڵگەیان دەهێنایەوە چونکە خودا سەرچاوەی هەموو دەسەڵاتێکە ئەوا دەسەڵاتی پاشاکانیش پیرۆزە و پێویستە ملکەچی بین. هیوم ئەم بەڵگەیە بە خەوشدار دەزانێ و دەڵێ بە سەرەتایەکی لەو جۆرە ناتوانین بگەینە ئەنجامگیرییەکی لەم جۆرە. ئەم باوەڕە کە هەموو ڕووداوەکانی جیهان لە ژێر ڕێنومایی، گەلاڵە و تەگبیرێکی خوداوەندیدان واتاکەی ناتوانێ ئەمە بێت کە خوداوەند بە دەست تێوەردانێکی تایبەتی دەسەڵاتی بە کەسانێکی تایبەتی بەخشیوە.





## ٢- جێرمی بێنتهام

## Jeremy Bentham

## کۆمەڵگای سیاسی شوێنی هاوسەنگکردنی قازانجەکان

جێرمی بێنتهام (١٧٤٨-١٨٣٢) لەو ئابووریناس و فەیلەسوفە سیاسی و چاکسازیخوازە کۆمەڵایەتییانەیە کە گەلێك کەس بە گەورەترین هزرڤانی تێڕوانینی سوودگەرایی دادەنێن لە فەلسەفەی سیاسییدا. بێنتهام خوێندنی خۆی لە لەندەن و لە قوتابخانەی وێست مینستر و سەر ئەنجام لە زانکۆی ئۆکسفۆرد تەواوکرد. باوکی پارێزەر و خاوەنی نووسینگەیەکی ئابووری بوو. بێنتهام لە بواری جۆراوجۆردا خەریکی خوێندن، لیکۆڵینەوە و پشکنین بوو. تەنانەت ماوەیەکش لە بوارەکانی فیزیاو کیمیادا خەریکی تۆژینەوەی ئەزموونی بوو. یاسا گرنگترین بوار بووە کە ئەو تۆژینەوەی تێداکردووە و هەرچەندە مۆڵەتی پارێزەریشی وەرگرت بەڵام پیشەی پارێزەرایەتی نەگرتەبەر. بێنتهام تۆژینەوەیەکی قووڵی لەسەر فەلسەفەی هاوچەرخەکانی خۆی وەك هیۆم، مونتیسکیۆ و پریستلی ئەنجامدا.

لە گرنگترین دەستکەوتەکانی بێنتهام لە بواری هزری سیاسییدا تیۆری دیموکراسی نوێنەرایەتییە کە لەو سەردەمەدا بە تیۆرییەکی رادیکالی لە بواری حکوومەت لە قەڵەم دەدرا.

### نەخشەی گشتی هزری سیاسیی بێنتهام

بەر لە خستنەڕووی سەرەکیترین بەشەکانی فەلسەفەی سیاسی و یاسایی بێنتهام و ئەو داهێنانە نوێیانەی کە لە بواری رەوتی گەشەکردنی هزری سیاسییدا کردوویەتی جێی خۆیەتی بەو شێوازەی کە هەتا ئێستا کارمان پێکردووە سەرەتا نەخشەیەکی گشتی فەلسەفەی سیاسیی ئەو بخەینە بەرچاو. بێنتهام لەم خاڵەوە دەستپێدەکات کە هێزی پاڵنەری تاك گەڕانە بە دوای چێژ و شادومانی و دوورکەوتنەوەیە لە رەنج



و ئازار. بێنتهام گەڕان بە دوای چێژ و شادمانی و دوورکەوتنەوە لە ئێش و ئازار نە تەنیا بە پاڵنەری رەفتاری مرۆڤ دەزانێ بەڵکو بە پێوەری ئەخلاق و پێوەری دروست و نادروستیشی لەقەڵەمدەدات. ئەو شتەی کە مرۆڤ لەگەڵ کۆمەڵگا و سیستەمی سیاسی گرێدەدات قازانج یا سوودمەندی کۆمەڵگایە لە پەیوەندی لەگەڵ ئەو پاڵنەرەی سەرەوەدا. لە کۆمەڵگادا هەر کەسێك بە دوای قازانجی خۆیدا دەگەڕێت و لە ئەنجامی گەڕان بە دوای قازانجی تایبەتی، قازانجی گشتی کۆمەڵگاش دێتە دی. بەم حاڵە هەروەکو تاك کۆمەڵێك قازانجی هەیە سەرجەم سیستەمی کۆمەڵگاش بۆ خۆی کۆمەڵێك قازانجی هەیە. قازانجی گشتی سیستەمی کۆمەڵگا بریتییە لە زیاترین قازانج بۆ زیاترین ژمارەی تاکەکانی کۆمەڵگا. هاوئاهەنگ کردنی قازانجی تاکەکەسی لەگەڵ زۆرترین قازانجی زیاترین ژمارەی تاکەکانی کۆمەڵگا دەبێ ببێتە بنەمای سیاسەتی گشتی (سیاسەتی دەوڵەت). پێوەری هەڵسەنگاندنی دەوڵەت و شێوازی رێکخستنی کاروبار و ئۆرگانەکانیش دەبێ پشت بەم پرەنسیپە ببەستێ.

### قازانجی تایبەتی و دەسەڵاتی سیاسی

هەروەك بینیمان هۆبز و لۆك سەرەتا لە پرەنسیپی مافی سروشتی یا بە واتایەکی وردتر لە مافی سروشتی پاراستنی گیانەوە دەستیانپێکرد و لە کەناڵی گرێبەستی کۆمەڵایەتییەوە گەیشتنە کۆمەڵگای سیاسی. ئەوان هەر لەسەر ئەم بنەمایە، تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا سیاسییەکانیان لە گرێبەستی کۆمەڵاتی و رەوشتی بەر لە گرێبەستی کۆمەڵایەتی کە بە رەوشی سروشتی ناودەبرا وەرگرتبوو. هۆبز دەیویست لە یەك جێگا و بە یەکەوە هەم رەوایەتی دەوڵەت و هەم سوودمەند بوونی بسەلمێنێ. بەڵام لە بنەڕەتدا رەوایەتی دەوڵەت و عەقڵانی بوونی دەوڵەتی سەلماند. هەروەك بینیمان هیوم بەو جۆرە بەڵگەی دەهێنایەوە کە بۆچوونی





گرێبەستی کۆمەڵایەتی هیچ شتێك روون ناکاتەوە و لە بری ئەو بۆ پاساوهێنانەوەی پرەنسیپی دەوڵەت دەتوانین باس لە قازانج و سوودمەندی بکەین.

هیوم بە دەستپێکردن لە خاڵی قازانج، رەهەندی عەقڵگەرایانەی تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتی بۆ کەمترین ئاستی خۆی دابەزاند و گوتی کە کۆمەڵگای ئۆرگانیزەکراو و حکوومەت لەسەر ئەو قازانجە بنیاتنراوە کە مرۆڤەکان بە ئەزموون هەستی پێدەکەن. گرنگ نییە کە حکوومەت و سیستەمی سیاسی چۆن سەریان هەڵداوە، ئەوەی کە گرنگە ئەوەیە کە قازانجی بەردەوامی بۆ تاکەکان بووەتە هۆی سەقامگیربوونی. بەڵام تیۆری هیوم هێشتا هەموو پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتی نەپچڕاندبوو. هەروەك بینیمان هێشتاش هەندێ رەهەندی هاوسەنگ لە گرێبەست و پەیمانەکان لە لایەن هیومەوە پەسند دەکران.[1] هیوم لەو باوەڕەدا بوو کە رێکخستن و رێکوپێکی مافی دارایی لە نێوان تاکەکان دەبێ هەندێ پەیمان لە ئارادا بێت. ئەم پەیمانە لە بەرگی یاساکاندا سەقامگیریی بە مۆڵکدارێتی دەرەکی دەبەخشن. ئەم پەیمان و گرێبەستانە هەمان هەستی گشتی و هاوبەشن لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵگادا. ئەم هەستە لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵگا بۆ یەکتر دەگوازرێنەوە و ئەوان ناچاردەکات تا بە پێی ئەو رێسایانەی کە لە لای هەمووان پەسندە رەفتارەکانی خۆیان رێك بخەن. بەم جۆرە واتای سوودمەندیی لە تیۆری هیوم لە بنەڕەتدا سوودمەندیی کۆمەڵایەتی و قازانجی هاوبەشە. بەوتەیەکی تر سوودمەندیی لە تیۆری هیوم هاوواتای جۆرێکە لە خێرو چاکەی گشتی و ئۆرگانە سیاسییەکان تەرخان کراون بۆ بەدیهێنانی ئەم خێر و چاکە گشتییە. بەم جۆرە لە تیۆری هیوم هێشتا ئەولەویەتی هەق و دادپەروەری بە تەواوەتی نەچووەتە ژێر نیشانەی پرسیارەوە.

بەڵام بێنتهام سوودمەندیی بە یەکجارەکی بە گەڕان بە دوای شادمانی و دوورکەوتنەوە لە رەنج و ئازار کورت کردەوە. بێنتهام قازانج یا بەرژەوەندی بە واتای رەزامەندیی و چێژ بەخشبوون لێکدایەوە. خێر و چاکە ئەو شتەیە کە خۆشی



و شادمانی دەهێنێ. هەرشتێك کە شادی هێنەر نەبێت باش نییە. بەپێی ئەم پرەنسیپە فەزیلەت تەنیا کاتێك باشە کە کارپێکردنی ببێتە هۆی شادمانی. شەڕیش لەبەر ئەوە خراپە کە دەبێتە سەرچاوەی رەنج و ئێش و ئازار. بەم حاڵەش بێنتهام ئەمە بە بیردەهێنێتەوە کە بەختەوەری بەرهەمی کۆکردنەوەیە. واتە لە کۆکردنەوە و کەم کردنەوە بەدەست دێت. رەنگە شادمانی هەندێ جار وا بخوازێت کە پێویست بە وەلانانی ئەو چێژ و خۆشییانە بکات کە ئەنجامی دەردناکیان هەیە.

## شێوازی هەڵسەنگاندنی خۆشی

لە بۆچوونی سوودگەرایانەی بێنتهامدا چێژەکان لەسەر بنەمای چەندێتی هەڵدەسەنگێندرێت. ئێمە تەنیا دەتوانین بڵێین کە چێژێك گەورەترە یا بچووکترە لە چێژێکی تر. بۆ وێنە کاتێك دەتوانین بڵێین کتێب خوێندنەوە چاکترە لە یاریکردن کە کتێب خوێندنەوە چێژێکی زیاتر ببەخشێت نەك ئەوەی کە جۆرێکی باشتر لە چێژ بە دەستەوە بدات.

بۆچوونی سوودگەرایی دەبێ چۆنیەتی هەڵسەنگاندنی چێژەکانیشمان پێ نیشانبدات. بێنتهام دەڵێ بە گشتی بۆ هەڵسەنگاندنی چێژ دەبێ سەرنج بدرێتە سەر هەندێ فاکتەری وەك توندی و بەردەوامی و دڵنیابوون و دڵنیانەبوون لەو چێژە. چێژ و خوشییەك کە زیاتر لێی دڵنیای بە چێژێکی گەورەتر دادەنرێ لەو چێژەی کە کەمتر لێی دڵنیاییت. پارامیترێکی دیکە کە لەبەرچاو دەگیردرێت دووری و نزیکی دەرفەتی بە دەستهێنانی ئەو چێژەیە. ئەو چێژەی کە بە ئاسانی بەردەستدەکەوێت خوازراوترە لەو چێژەی کە بە دژواری بەدەستدێت. لە هەڵسەنگاندنەکانی ئێمەدا پاك و خاوێنی چێژەکەش لەبەرچاو دەگیردرێت. ئەو چێژەی کە هەستی ناخۆشی کەمتری بە دواوەیە گەورەترە لەو چێژەی کە هەستی ناخۆشی بە دواوەیە.





بەڵام ئەم تێڕوانینەی بەرژەوەندگەراکان بۆ کردار و پاڵنەرەکانی لەناو خۆیدا پارادۆکسێکی تێدا بەدی دەکرێت. چونکە بەرژەوەندگەراکان تەنیا دەتوانن بڵێن کە چ کردارگەلێکی دیاریکراو دەتوانین بە چاك یا خراپ لە قەڵەم بدەین (بەپێی هەڵسەنگاندنی ئەو چێژ و ئازارەی کە بەرهەمی دەهێنێ). بەڵام ناتوانن هیچ پێوەرێکی پێشوەختەمان پێ بناسێنن بۆ دەستەبەندی کردنی کردارە چاك و خراپەکان. ئەو رەخنەیەی کە لەم شێوازە دەگیرێت ئەوەیە کە ئەگەر بڕیاربێت ئێمە تاك تاکی کردەوەکان بە شێوەی جیاواز بخەینە بەر هەڵسەنگاندن و دادوەریکردن ئینجا ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە نکۆڵی لە هەر پێوەرێك بکەین بۆ ئەخلاق و لەم حاڵەتەدا ئەخلاقمان لە چوارچێوەی بەرژوەندیدا شەتەك داوە. ئەمە لە کاتێکدایە کە بەرژەوەندگەراکان بانگەشە بۆ ئەوە دەکەن کە بۆچوونی ئەوان لە هەمانکاتدا بۆچوونێکی ئەخلاقییە و چێژ و ئازاریش (بەرژوەندی) پێوەری ئەخلاقی (دروست و نادروست)ن.

## ناڕوونی لە تیۆری ئەخلاقی بێنتهام

بێنتهام دەیەوێ ئەفسانە لە ئەخلاقی کلاسیکی بسڕێتەوە و بنەما ئەخلاقییەکان لە میتافیزیك رزگاربکات. بە پێی تێگەیشتنی ئەو لە دروست و نادروست و لە ئەخلاق دەبێ مرۆڤ وەك بوونەوەرێك ببینین کە تەنیا بە دوای چێژ و خۆشی و دوورکەوتنەوە لە رەنج و ئازاردا دەگەڕێت. ئەو دەڵێ ئەگەر چێژ و ئازار هەڵگرین نە تەنیا بەختەوەری و دادپەروەری بەڵکو ئەرك و بەڵێنیش دەبێتە شتێکی بێ واتا. بێنتهام هەندێ جار بە جۆرێك قسەدەکات کە دەڵێن (باش) یا (چاکە) تەنیا بە واتای چێژ بەخشینە بەڵام لە زۆربەی حاڵەتەکاندا وا دێتە بەرچاو کە باش یا چاکە ئەو شتەیە کە بە گشتی خوازراوە. بە پێی رێسا دەبێ بێنتهام کرداری دروست بە کردارێك بزانێت کە زیاترین رادەی چێژ و خۆشی لە خۆدەگرێت یا بە وتەیەکی تر دەبێتە هۆی زیادبوونی زۆرترین چێژ بەسەر ئازاردا.



بەڵام گەلێك جار کاتێك کە کردارێك بە کرداری دروست هەڵدەسەنگێنێ تەنیا ئەو واتایەی لەبەرچاو نییە کە ئەو کردارە بە زیاترین چێژی پێویست کۆتایی پێبێت.

دەربارەی ئەرکی سیاسیش لە جێگایەکدا ئەرك بە کردارێك پێناسە دەکات کە ئەنجام نەدانی دەبێتە هۆی سزا و لە جێگایەکی تردا ئەرکی سیاسی بۆ هەموو ئەو کردارانە بە کاردەهێنێ کە پشت بە گەرەنتی جێبەجێکردن دەبەستن. گەرەنتی جێبەجێکردنیش بە گەرەنتی جێبەجێکردنی سروشتی، ئایینی، رەوشتی و یاسایی دەزانێ.

ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنە لە کرداری دروست (کرداری ئەخلاقی) و ئەرك بە پارادۆکسێك (دژایەتی ناوخۆیی) کۆتایی پێدێت. ئەگەر دروستی کردارێك بەو جۆرە بێت کە لە هەلومەرجێکی دیاریکراودا بە گەورەترین چێژ کۆتایی پێبێت و ئەگەر ئەرك بە واتای ئەنجامدانی کردارێك بێت کە وازلێهێنانی ببێتە هۆی سزا لەم حاڵەتەدا رەنگە ئەرکی ئێمە وابخوازێت ئەوەی کە دروستە (واتە دەبێتە هۆی زیاترین چێژ) ئەنجامی نەدەین (چونکە بە سزادان واتە رەنج و ئازار کۆتایی پێدێت).

## تیۆری دەسەڵاتدارێتی بێنتهام

تیۆری دەسەڵاتدارێتی لە هزری سیاسیی بێنتهام بە دەستکەوتێکی نوێ لە پێشکەوتنی فەلسەفەی سیاسی دەژمێردرێت. لە پاژەکانی پێشوودا گوتمان کە هۆبز لە راستیدا دەسەڵاتدار و دەسەڵاتدارێتی بە یەکسان زانیوە و گوتی کە فەرمانڕەوا تەنیا دەتوانێ بە شێوازی رەها بێت. لە تیۆری هۆبزدا یاسا بریتییە لە فەرمانی دەسەڵاتدار و کەس (جگە لە حاڵەتی فەرمانی خۆکوژیدا نەبێ) بۆی نییە فەرمانی فەرمانڕەوا پێشێل بکات. لە راستیدا هۆبز بەم تیۆرییە رەوشت و یاسای لەگەڵ یەکتردا تێکەڵ کردبوو. بەڵام بێنتهام هەوڵیدا کە دەسەڵاتدارێتی لە جغز و بواری سیاسی و یاساییدا سنووردار بکات. بێنتهام بە تیۆرییەکی تۆکمەتر لە تیۆری لۆك





دەسەڵاتدار و دەسەڵاتدارێتی لە یەکتر جیاکردەوە و جەختی کردەوە کە لە نێوان ڕەهابوونی دەسەڵاتدارێتی و ملکەچبوونی ڕەها بۆ دەسەڵاتدار پەیوەندییەکی زەرووری لە ئارادا نییە. مەبەست لە ڕەها بوونی دەسەڵاتدارێتی، دەسەڵاتە تەواوەکانی دەسەڵاتی یاسادانانە کە هیچ پەیمانێك ناتوانێ بە ڕاشکاوی سنووردارییبکات.

بەڵام ئەمە کە دەسەڵاتی یاسادانان خاوەن مافێکی دەسەڵاتدارێتی باڵایە بەو واتایە نییە کە دەبێ بۆخۆشی بڕیارەکانی خۆی جێبەجێ بکات، یاخود لە کاری دادوەری کردنیشدا بەشداری بکات. کەوابوو دانانی دەسەڵاتەکانی یاسادان، جێبەجێکردن و دادوەری لە دەست کەسانی جیاوازدا بە واتای دابەشبوونی دەسەڵاتدارێتی و دەرچوونی لە ڕەهابوون نییە. تیۆری بێنتهام، تیۆری مونتیسکیۆ و هۆبزی دەربارەی دەسەڵاتدارێتی ڕاستکردەوە. مونتیسکیۆ پەسندکردنی دەستوور و دیاریکردنی چوارچێوەی بەرپرسایەتی دوو دەسەڵاتەکەی دیکەی بە دەسەڵاتی یاسادانان نەدەدا. ئەو سیستەمە دەسەڵاتدارێتییەی کە بەلای مونتیسکیۆوە مەبەست بوو لەسەر نەریت (ترادیسیۆن) بنیاتنرابوو. نەریتێك کە هەرسێ دەسەڵاتەکەی لە یەکتر جیادەکردەوە و پەیوەندی بە پێی هاوسەنگکردنی یەکتر دیاریدەکرد.

بێنتهام هەروا بە پێچەوانەی هۆبز دەسەڵاتی باڵای یاسادانان دژ بە پرەنسیپی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان نازانێ. دەسەڵاتی یاسادانان لەو ڕووەوە دەسەڵاتێکی باڵا و خاوەن دەسەڵاتدارێتییە چونکە کەس مافی ئەوەی نییە سەرپێچی لە یاسا پەسندکراوەکانی بکات. ئەم دەسەڵاتە سەروەرییەکی باڵای هەیە چونکە هیچ پەیمانێك لە ئارادا نییە کە بتوانێ ئەم دەسەڵاتە ناچار بکات کە یاسا و بڕیارەکانی خۆی لەگەڵیدا بگونجێنێ. دەسەڵاتی یاسادانان دەتوانێ لە ڕووی یاساییەوە دەسەڵاتی باڵا بێت و لەهەمانکاتیشدا خەڵك خاوەنی ئازادییە سیاسییەکانی خۆیان بن.



## هۆکاری بوونی دەوڵەت

بێنتهام وەکو لایەنگرانی دیکەی سوودگەرایی دەڵێ کە کۆمەڵگای سیاسی یان دەوڵەت بریتییە لە کۆی خەڵکانێك کە بۆ بەرەوپێشبردنی شادی و بەختەوەری لە دەوری یەکتر کۆبوونەتەوە و سیستەمێکیان بۆ خۆیان پێکهێناوە. ملکەچبوون بەرامبەر بە حکوومەتیش هەر لەسەر ئەم بنەمایە واتە سوودمەندبوون پاساوی بۆ دەهێنرێتەوە. ئامانجی دەوڵەت هەمان ئامانجی ژیانی مرۆڤە. ڕەنگە بەو جۆرە ڕەخنە لەم بڕیارە بگیرێت کە هەندێ ئۆرگانی دیکەش کە لە ئاستی دەوڵەتدانین بە دوای هەمان ئامانجدا بگەڕێن. کەوابوو جیاوازی ئەوان لەگەڵ دەوڵەتدا چییە؟ بەوتەیەکیتر دەوڵەت چ کارکردێکی هەیە کە ئۆرگانە خێرخوازە هاوبەشەکانی دیکە نیانە؟ بێنتهام دەڵێ دەوڵەت تاکە ئۆرگانێکە کە سەرچاوەی یاسایە. کەوابوو دەتوانین بڵێین دەوڵەت بریتییە لە کۆمەڵە خەڵکانێك کە بۆ بەرەو پێشەوەبردنی یاسا بەمەبەستی دابینکردنی بەختەوەری کۆمەڵ ڕێکخراون. دەوڵەت پاڵنەری قازانجی تایبەتی و تاکەکەسییە لەگەڵ بەرەوپێشبردنیان و زیاترین بەختەوەری بۆ زیاترین ژمارەی خەڵك هاوئاهەنگ دەکات. دەوڵەت بۆ ئەم مەبەستە هەندێ لەو کردارانەی کە نابنە هۆی بەختەوەری گشتی دەیانخاتە چوارچێوەی ئێش و ئازاری دەستکردەوە. دەوڵەت سەرچاوەی یاسایە، ناتوانی لە بەرامبەر دەوڵەتدا کەڵك لە یاسای سروشتی وەربگریت. لە تیۆری دەوڵەتی بێنتهامدا ئازادی تاکە ئامانجی دەوڵەت نییە. بەختەوەری گشتی بە ئەسڵ دادەنرێت و دەبێ ئازادی لەگەڵیدا بگونجێندرێت.[2] لە تیۆری بێنتهام بە پێچەوانەی تیۆری ئەرەستۆ دەوڵەت لە پێشەوەی تاك نییە بەڵکو لە پشتەوەیەتی.





## دوڵەتی سنووردار

گوتمان کە بەپێی تیۆری بێنتهام دەوڵەت دەبێ سوودمەندیی گشتی بکاتە بەرنامەی کاری خۆی. پرسیارەکە ئەوەیە کە دەوڵەت بۆ بەرەوپێشبردنی بەختەوەری و سوودمەندیی گشتی دەبێ چ کارێك ئەنجام بدات؟ دەوڵەت تا چ سنوورێك دەتوانێ بۆ دابینکردنی ژیانێکی گشتی باشتر دەستتێوەردان بکات؟ بە پێی ئەو شتەی کە بێنتهام دەڵێ دەوڵەت بۆ دابینکردنی سوودمەندیی گشتی دەبێ چوار ئامانجی سەرەکی لە بواری یاساداناندا لە بەرچاوبگرێت:

١- دابینکردنی ئاسایش.

٢- دابینکردنی لانی کەمی گوزەران بۆ هەمووان.

٣ - دروستکردنی فراوانی.

٤- بایەخدان بە یەکسانی.

بەڵام بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانە نابێ حکوومەت بە شێوەی راستەوخۆ و بە دەستێوەردانی بەربلاو لە بواری ئابووریی بجووڵێتەوە. کاری حکوومەت ئەوە نییە کە خەڵك ناچار بکات بۆ بەدەستهێنانی بژێوی یاخود بە هۆی بەرنامەکانی گەشەکردنی ئابوورییەوە هەوڵی دروستکردنی هەلومەرجی فراوانی بدات. کاری حکوومەت تەنیا ئەوەیە کە گەرەنتی ئاسایشی موڵکدارێتی بکات و ئەم دەرفەتە بە هەمووان بڕەخسێنێ کە لە بەرهەمی کاری خۆیان بەهرەمەند بن. هەر ئەوەندە بەسە بۆ بەگەڕکەوتنی پاڵنەرەکانی گەشەکردن و گەیشتن بەو ئامانجانەی سەرەوە.

تیۆری لایەنگرانی سوودگەرایی لەگەڵ تیۆرییەکانی ئابووری کلاسیك لە هاوئاهەنگی تەواودایە کە بەرگری لە لانی کەمی دەستێوەردانی دەوڵەت دەکات لە بواری ئابووریدا. ژیانی باشتر و بەختەوەری وڵات لە ژیانی باشتر و بەختەوەریی تاکەکان پێکهاتووە، بەڵام تەنیا رەهەندێکی بەرتەسکی بەختەوەری تاکەکان



پەیوەندی بە بەرپرسیارێتی تاکەکانەوە هەیە. خەڵك وێڕای ئەوەی کە بە دوای بەختەوەری تاکەکەسی خۆیاندا دەگەڕێن یارمەتی بەختەوەریی گشتیش دەدەن. دابینکردنی مافی دەنگدانی گشتی میکانیزمی پێویست بۆ هەوڵدانی هەمووان و دەربڕینی قازانجەکانی هەمووان فەراهەم دەکات.

## دیموکراسی نوێنەرایەتی

هزرڤانانی سەر بە تیۆری سوودگەرایی، سیستەمی دیموکراسی نوێنەرایەتی بە شێوازی ئیدیالی حکوومەت دەناسێنن. بەپێی شیکردنەوەی ئەوان ئەم سیستەمە باشترین شێوازە بۆ دابینکردنی زیاترین خۆشی بۆ زیاترین ژمارەی خەڵك. بەڵگەهێنانەوەی ئەوان لە ئیدیال و خوازراوبوونی سیستەمی دیموکراسی وێڕای ئەوی کە لەگەڵ دیدگای گشتی ئەواندا دەگونجێ بەڵگە هێنانەوەیەکی نوێ بووە لە بەرگری کردن لە سیستەمی دیموکراسی. لەمەو پێش هزرڤانان بۆ بەرگری کردن لە ئیدیال بوونی دیموکراسی و ئازادییە پەیوەستەکانی بەو جۆرە بەڵگەیان دەهێنایەوە کە مرۆڤ خاوەنی هەندێ مافی بنەڕەتییە و کاتێك کە دەچینە ناو کۆمەڵگای رامیارییەوە بە شێوەیەکی جیانەکراوە هەڵگری ئەو مافانەیە و کۆمەڵگای سیاسی دەبێ پاسەوانی لەم مافانە و لەوانەش ئازادییە تاکە کەسییەکان بکات. ئەم بەڵگەهێنانەوەیە لەگەڵ دیدگای کلاسیکی پەیوەست بە مافە سروشتییەکانی لە پێوەندی دابوو. تێگەیشتنی رادیکاڵی لە دیدگای یاسای سروشتی و مافە سروشتییەکان هەر لە سەردەمی هەیوانییەکانەوە (کە لە بەرگی یەکەمدا باسمان لێوەکرد) ئاراستەی بەرەو ئەم بەڵگەهێنانەوەیە بووە. تێڕوانینی سوودگەرایی وازی لە نەریتی مافە سروشتییەکان هێناو بووە بنیاتنەری رەوتێکی نوێ لە هزری سیاسییدا. بەڵگەی لایەنگرانی سوودگەرایی بۆ بەرگریکردن لە دیموکراسی کە لە دیموکراسی نوێنەرایەتیدا رەنگدەداتەوە ئەوەیە کە مرۆڤەکان خاوەنی هەندێ قازانجن و بۆ خۆیان باشترین دادوەرن لە سەرخۆیان. ئەوان بۆ گەڕان بە دوای قازانجەکانی





خۆیان، خاوەن مافی یەکسانن کەوابوو دەبێ لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای سیاسیشدا پشکی یەکسانیان هەبێت. بەم جۆرە سوودگەرایی لە گریمانەی یەکسانی مرۆڤەکانەوە دەستپێدەکات لە کاتێکدا کە لایەنگرانی مافە سروشتییەکان و لۆك لە مافی ئازادی و ئاوەزمەندبوونی هەموو مرۆڤەکانەوە دەستیان پێدەکرد.

بەرگریکردن لە مافی سروشتی مرۆڤەکان بەرامبەر بە ئازادی مەرج نییە لە ئەنجامدا ببێتە هۆی هەڵێنیێجانی سیستەمی دیموکراسی. تیۆری لۆك لەمەڕ ڕەزامەندی تاك وەك سەرچاوەی ملکەچبوونی ئەو بۆ دەوڵەت ئەگەر لە رووی ناوەڕۆکەوە بەتاڵ نەبوایە دەیتوانی ببێتە هۆی هەڵێنجانی بە ئیلزامی بوونی دیموکراسی. بەڵام لۆك بەخستنەڕووی تیۆری ڕەزامەندی پەنامەکی پەیوەندی زەرووری لە نێوان بنەمای ئازادی ڕەزامەندی لە حکوومەتی دیموکراسیدا خەوشدارکرد. بە پێی واتای ڕەزامەندی لاوەکی کاتێك کە تاك لە وڵاتێکدا دەژێت واتای ئەوەیە کە ڕەزامەندی لەسەر ئەو سیستەمە حکوومیە دەربڕیوە.

بێنتهام بەپشتبەستن بە یەکسانی سروشتی مرۆڤەکان، کە ئەویش لە ڕاستیدا لە مافە سروشتییەکان وەرگیراوە[٣]، گەیشتە ئەو ئەنجامە کە سیستەمی دیموکراسی باشترە. ئەو دوو پێش گریمانەیەی کە لەسەر بنەمای ئەوان بێنتهام گەیشتە باشتربوونی دیموکراسی بریتین لە:

١- بەختەوەریی هەر کەسێك بەقەد بەختەوەریی ئەویتر بایەخدارە.

٢- هەرکەسێك دەربارەی قازانجەکانی خۆی باشترین دادوەرە.

ئەنجامەکەشی ئەوەیە کە هەر کەسێك دەبێ لە دیاریکردنی چارەنووسی هاوبەشدا پشکی هەبێت.



## هەڵسەنگاندنی تیۆری دیموکراسی بێنتهام

هەروەك گوتراوە بێنتهام ئەو دیموکراسییەی کە مەبەستیەتی لە پرەنسیپی سوودگەرایی و لەم بڕیارە هەڵدەهێنجێنێ کە مرۆڤەکان مافێکی یەکسانیان هەیە بۆ گەڕان بە دوای خۆشی یا قازانجەکانی خۆیاندا و هیچ کەسێك باشتر لە خودی تاك ناتوانێ قازانجەکانی ئەو دەستنیشانبکات. بەم جۆرە بێنتهام خوازراو بوونی دیموکراسی لەم دووانە (ئازادی و یەکسانی) هەڵدەهێنجێنێ. دیموکراسی یەکێکە لەشێوازەکانی سیستەمی سیاسی کە تێیدا خەڵك دەتوانن لە خوارەوە ئەو دەسەڵاتدارانە کۆنترۆڵ بکەن کە ئەوانیش وەك هەمووان بە دوای زیادکردنی قازانجەکانی خۆیاندا دەگەڕێن.

بەڵام ئەم بەڵگەیە ئەو ڕەخنەیەی لێگیراوە کە بەم سەرەتایە کە هەر کەس باشترین دادوەری قازانجەکانی خۆیەتی و حکوومەت دەبێ زیاترین قازانج بۆ زیاترین ژمارەی خەڵك فەراهەم بکات ناتوانین زەروورەتی دیموکراسی وەك باشترین شێوازی حکوومەت هەڵێنجێنین. ئەم بەڵگەیە جگە لە ڕەخنەکانی تر ئەم ڕەخنەیەشی لێدەگیرێت کە دەتوانین شێوازەکانی دیکەی نادیموکراسیش بهێنینە پێش چاو کە بتوانێت ئەو مەبەستەی سەرەوە (زیاترین قازانج بۆ زیاترین ژمارەی خەڵك) بەدی بهێنێت.

## ٣. جەیمز میل
## James Mill
## دیموکراسی بازاڕ

جەیمز میل (١٧٧٣-١٨٣٦) بیرمەندێکی دیکەی ئینگلیزییە کە درێژەی بە نەریتی سوودگەرایی دا و هەنگاوێکی دیکە بەرەوپێشەوەی برد. ئەو هەوڵیدا مۆدیلی تیۆری ئابووری کلاسیك لە بواری سیاسەتدا گشتگیر بکات. دەتوانین تیۆری سیاسیی ئەو بە تەواوکەری ئابووری کلاسیك لە بواری سیاسەتدا لە قەڵەم بدەین.

### دەوڵەت وەك ئامادەکارێك بۆ گەرەنتی کردنی ئازادی رکابەری

جەیمز میل وەك لایەنگرانی دیکەی سوودگەرایی لەم پێش گریمانەوە دەستپێدەکات کە ئامانجی سروشتی تاك لە هەر چالاکییەکدا ئەوەیە کە خۆشی و کامەرانی خۆی بگەیەنێتە لوتکە. ئەو جیهانەی کە ئێمە تێیدا دەژین، جیهانی سەرچاوە کەمیابەکانە، کەوابوو دەبێ بۆ دابینکردنی خۆشی و کامەرانی کاربکەین. کارکردنیش رەنج و ئازارە بەڵام رەنجێکە کە بۆ لابردنی رەنجەکانیتر و گەیشتن بە خۆشی و کامەرانی پێویستە. چونکە کارکردن رەنج و ئازارە کەوابوو هەر کەسێك چاوەڕوانی ئەوەی هەیە کە زیاترین بەهرە لە کارەکەی خۆی ببات. بواری سیاسەت ئەو شوێنەیە کە دەبێ هەلومەرجی پێویست بڕەخسێنێ تا هەر هاووڵاتییەك لە رکابەرییەکی تەواو ئازاددا زیاترین بەرهەم لە کارەکەی بەدەستبهێنێ. مرۆڤ بوونەوەرێکی زێدەخوازە و ئەمەش هەڵبەت لەبەر پیسبوونی سروشتی ئەو نییە بەڵکو لەبەر زەروورەتی رکابەری کردنە. تاکەکان بۆ زیاترکردنی قازانجی خۆیان حەز لە کەڵەکەکردنی دەسەڵات دەکەن، ئەمەش دەبێتە بەربەست لەبەردەم جووڵەی بازاڕ و دەبێتە هۆکاری دەستدرێژی کردن بۆ سەرمافی ئەوانیتر. بەم جۆرە پێگەی



سەرەکی سیاسەت و کاری سەرەکی حکوومەت ئەوەیە کە زەمینە بۆ جووڵەی ئازادی بازاڕ و هەلومەرجی رکابەری ساخلەم خۆشبکات.

حکوومەت بۆ رەخساندنی ئەم هەلومەرجە دەبێ رۆڵێك بگێڕێت؟ بە ڕای جەیمز میل گەرەنتی کردنی جووڵەی ئازادی بازاڕ چەند بەشێکی سەرەکی دەگرێتەوە:

١- پێشگیری کردن لە دەستدرێژی تاکەکان بۆ سەرسنووری ئازادی ئەوانیتر.

٢- دابینکردنی گەرەنتی جێبەجێکردنی گرێبەستە تایبەتییەکان.

٣- کۆنترۆڵکردنی ئەو دراوەی کە لە وڵاتەکەدا باوە.

٤- پاراستنی ئۆرگانی موڵکدارێتی تایبەتی.

بەم جۆرە دەوڵەتی ئیدیالیش بەلای جەیمز میلەوە دەوڵەتی بچووککراوەیە، واتە ئەو دەوڵەتەی کە بەپێی ئیمکان کەمترین دەستێوەردان لە کاروباری ئابووریدا بکات. جەیمز میل وەکو گەلێك لە هاوبیرانی خۆی کە سەر بە رێبازی لیبرالین پارێزگاریکردن لە ئۆرگانی موڵکدارێتی تایبەتی بە دەستتێوەردانی ئابووری لە قەڵەم نادات. ئەوان بوون و سوودمەند بوونی ئۆرگانی مەڵکدارێتی تایبەتی بە گریمانەیەکی سەلماو دەزانن، لە کاتێکدا کە پاساوهێنانەوە بۆ رەوایەتی و پەسندبوونی مۆڵکدارێتی بۆ خۆی پرسێکی سەرەکییە لە بواری هزری سیاسییدا.

### دیموکراسی نوێنەرایەتی وەك باشترین شێوازی حکوومەت

دیموکراسی نوێنەرایەتی باشترین شێوازی حکوومەتە بۆ گەرەنتی کردنی جووڵەی ئازادی بازاڕ و ماف و قازانجی تاکەکان، و لەم رێگایەشەوە بەختەوەری گشتی کۆمەڵگا. چونکە دەسەڵاتداران و بەڕێوەبەرانی کۆمەڵگاش وەك تاکەکانی دیکە کەسانێکی زێدەخوازن و رەنگە لە دەسەڵاتی حکوومی کەڵك وەربگرن بۆ دەستدرێژیکردن بۆ سەر دارایی کەسانیتر بۆ قازانجی خۆیان کەوابوو باشتروایە





دەسەڵاتیان لە لایەن ئەو بریکاردارانەوە (موکل) وەربگرن کە لە بەرامبەر ئەواندا بەرپرس بن و لە لایەن ئەوانەوە لە ژێر کۆنترۆڵ دابن. کاتێك کە بەرپرسان نوێنەرانێك بن کە لە لایەن خەڵکەوە هەڵبژێردرێن و لە بەرامبەر خەڵکدا وەڵامگۆبن و خەڵك لەسەر کارەکانیان چاودێربن ناتوانن لە دەسەڵاتی خۆیان بۆ تێکدانی ڕێسای ڕکابەری ئازاد و تالان کردنی ئەوانیتر سوود وەربگرن.

جەیمز میل نە تەنیا شێوازی دەوڵەت بەڵکو بەشداریکردنی سیاسییش هەر بەم شێوەیە ڕاڤە دەکات. بەشداریکردن لە کاروباری سیاسی، لە وانەش دەنگدان وەك هەر مامەڵەیەکی دیکەی ناو بازاڕ پێویستی بە بەکارهێنانی کات (کار)ە. ئاشکرایە کە مرۆڤ بۆ پشتگیریکردن لە زیانێکی گەورەتر مل بۆ ئەم خەرجییە دەدات. بۆیە ئەو ئامادەی بەشداریکردن دەبێت تا بەرگری لە قازانجەکانی خۆی بکات. ڕوویەکی تری ئەم وتەیە ئەوەیە کە ئەگەر بێت و بەشداریکردن لە کاری جۆراوجۆری سیاسی هیچ قازانجێکی بۆ مرۆڤ نەبێت ئەوا هیچ هۆکارێك بۆ ئەوە نابینێ کە لە ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی بەشداری سیاسییدا (کە بۆ خۆی وەك هەر کارێکی دیکە هەڵگری ڕەنج و ئازارە) کار بکات. هەر بۆیە جەیمز میل هیچ هۆکارێك بۆ بەشداری ژنان لە سیاسەتدا (و مافی ئەوان لەم بەشداریکردنەدا) نابینێ.

بەم جۆرە جەیمز میل لە پرەنسیپ و پێش گریمانەکانی سوودگەرایی گەیشتە توندڕەوانەترین ئەنجام. ئەو هەوڵیدا کە مۆدیلی تیۆری ئابووری کلاسیك لە گۆرەپانی سیاسییدا بە کاربهێنێ.



## ٤. ستیوارت میل

## John Stuart Mill

## (1806-1873)

### لە پێشەوەبوونی شادمانی و بەختەوەریی مەعنەوی

جەیمز میل لۆژیکی سوودگەرایی تا توندڕەوانەترین ئاستی خۆی لە هەڵێنجانی سیاسییدا بەرەو پێشەوە برد. بەڵام ستیوارت میلی کوڕی هەوڵیدا تا هەموارکردنێك لە تێگەیشتنەکانی سوودگەرایی لە بواری تیۆرییە سیاسییەکاندا دروستبکات. بەم جۆرە هزری ستیوارت میل بەوەرچەرخانێکی نوێ لە تێڕوانینی سوودگەرایی بۆ سیاسەت دادەنرێت.

جۆن ستیوارت میل (١٨٠٦-١٨٧٦) هەر لە منداڵییەوە خرایە بەر پەروەردە و فێرکردنێکی قورس. لە سێ ساڵاندا ناچاریان کرد فێری زمانی لاتینی ببێت و لە تەمەنی هەشت ساڵاندا دیالۆگەکانی ئەفلاتۆنیان خستە ناو بەرنامەی خوێندنەکانی ئەو. هەوڵێکی زۆردرا تا ئەو ببێتە میراتگر و درێژەپێدەری هزرەکانی بێنتهام و جەیمز میلی باوکی. بەڵام ئەو سەرەتا زۆر سەرەنجی نەدەدایە سەر هزرەکانی بێنتهام و گەلێك درەنگتر و لە ڕێگایەکی ترەوە بەرەو هزرەکانی بێنتهام ڕاکێشرا. ئەو لە چالاکی بە کردەوەی سیاسیشیدا بەشداری کرد و بە نوێنەرایەتی پەرلەمان هەڵبژێردرا. لە سەردەمی چالاکی سیاسییدا لە بەرگریکارانی پرەنسیپی مافی دەنگدانی گشتی (بۆ پیاوان) بوو. جەختکردنەوە لەسەر فەرهەنگ، پاکبوونەوە لە کەموکووڕی و گەشەکردنی کەسایەتی تاکە کەسی لەو خاڵانەن کە ئەو بۆ سەر تێڕوانینی سوودگەرایی زیادیکردن کە لە مەوپێش تەنها پشتی بە چێژگەرایی دەبەست.





## چاكسازی لە تێڕوانینی سوودگەرایی

ئەو رەخنانەی كە لە هزری سوودگەرایی گیرا پاڵی بە ستیوارت میلەوە نا تا هەندێ چاكسازی لەم دیدگایەدا بكات. لە روانگەی بێنتهام و جەیمز میلەوە سەرەكیترین بەها لە بواری سیاسییدا شادمانی تاكەكان بوو و چێژ و شادمانی ژمارەیەكی هەرچی زیاتری تاكەكان بە ئامانجی بەرزی كۆمەڵگایەكی سیاسی لە قەڵەم دەدرا. لە روانگەی ئەوانەوە پەرەسەندنی فێركردنی گشتی و بە دیهاتنی بەشداریكردنی خەڵك تەنیا رێگاگەلێكی سوودمەندبوون بۆ دابینكردنی خۆشی گشتی نەك پتر.[٤] بەپێی لۆژیكی بەڵگە هێنانەوەی ئەوان ئەگەر جگە لە دیموكراسی و فێركردنی گشتی رێگایەكی تر هەبێت بۆ دابینكردنی خۆشی بۆ زیاترین ژمارەی خەڵك لە روانگەی ئەوانەوە چاوپۆشی كردن لەم دوو بەها گرنگە جێی رەخنە نییە. بە وتەیەكی تر لە روانگەی ئەمانەوە دیموكراسی و بەرزكردنەوەی فێركردن و فەرهەنگی گشتی لە ناخی خۆیدا گرنگییەكی تایبەتی نەبوو.

بەڵام ستیوارت میل بەهایەكی تری بۆ دیموكراسی دادەنا. لە كاتێكدا كە جەیمز میلی باوكی لەسەر بنەمای پرەنسیپی سوودگەرایی، دیموكراسی بە رێسایەك بۆ حكوومەتی باش لە قەڵەم دەدا، بەڵام ئەو -ستیوارت میل- لەبەر ئەو توانایییەی كە دیموكراسی هەیەتی لەبەرەوپێشبردنی چۆنیەتی ژیانی هاووڵاتیان ستایشی دیموكراسی دەكرد. لە روانگەی ستیوارت میلەوە چۆنیەتی سەرەكی دیموكراسی بریتییە لە پەروەردەكردنی هاووڵاتیانی ئازادیخواز كە روو لە خێر و چاكەی گشتی دەكەن.

## خۆشییەكانی چەندایەتی و خۆشییەكانی چۆنایەتی

لە رواڵەتدا ستیوارت میل لەهەمان بنەما و گریمانەكانی بێنتهامەوە دەستپێدەكات و دەڵێ هەروەك چۆن خۆشی تاك بۆ تاك باشە ئەوهاش خۆشی زیاترین ژمارەی تاكەكانیش بۆ كۆمەڵگا باشە. بەڵام تێگەیشتنی ئەو لە خۆشی



گۆڕان لە بنەماكانی سوودگەرایی بێنتهامیدا دروستدەكات. لە تیۆری بێنتهامدا چێژە مادی و مەعنەوییەكان جیاوازییان لەگەڵ یەكتردا نییە. بێنتهام تەنیا لەو رووەوە چێژە مەعنەوییەكان لەسەرووی چێژە مادییەكانەوە دادەنێت كە سەقامگیرتر، دڵنیاتر و بەردەست ترن. بەم جۆرە ئەو تەنیا لە رووی ئیمتیازاتی دەرەكییەوە چێژە مەعنەوییەكان لە چێژە مادییەكان جیادەكاتەوە، نەك لە رووی جیاوازی چۆنایەتی و خۆیییەوە. بەڵام ستیوارت میل لەو باوەڕەدا نەبوو كە هەندێك لە چێژەكان لە رووی چۆنایەتی و لە ناخی خۆیاندا لە چێژەكانیتر باشترن.[٥] بەم حاڵەش، ئەم تیۆرییە، چ دروستتربێت یا نەبێت، بەهەرحاڵ لەگەڵ بنەماكانی سوودگەراییدا كەمتر دەگونجێ. ستیوارت میل بە هێنانە ئارای ئەم بابەتە كە دەبێ سوودگەرایی بە واتای بەرژەوەندی درێژخایەنی مرۆڤ وەك بوونەوەرێكی پێشكەوتنخواز لەبەرچاو بگرین لە راستیدا لە بنەماكانی قازانج دووركەوتەوە.[٦] هەروەك بینیمان پێوەری بێنتهام بۆ هەڵسەنگاندن و جیاكردنەوەی چێژەكان، پێوەری چەندایەتی بوو (تەوژم، بەردەوامی، ئەگەر) بەڵام ستیوارت میل بۆ هەڵسەنگاندن و جیاكردنەوەی چێژەكان پێوەری چۆنایەتیش دەهێنێتە ئاراوە و دەڵێ (باشتروایە سوكرات بیت و چارەڕەش نەك بەرازبیت و خۆش بەخت).

## گەورەیی مرۆڤ وەك دوا ئامانجی ژیان

هێنانە ئارای پرەنسیپی چۆنایەتی بۆ هەڵسەنگاندنی چێژو بەختەوەری پاڵی بە ستیوارت میلەوە نا كە نەك گەڕان بە دوای قازانج بەڵكو شەرەف و گەورەیی مرۆڤ وەك دوا ئامانجی ژیان رابگەیەنێت. ئەو ئازادیشی وەك پێگەیەك هەڵسەنگاند بۆ هەوڵدان لە پێناو خۆبەرزكردنەوە و خۆ-پەروەردەكردن. لە روانگەی بێنتهام و جەیمزمیلەوە ئازادی بە ئامراز لە قەڵەم دەدرێت نەك ئامانج و ئەنجامێكی سەربەخۆ. بەڵام لە تیۆری ستیوارت میلدا ئازادی پەیوەندییەكی راستەوخۆی لەگەڵ خۆگەشاندنەوەدا هەیە. جەیمز میل ئازادی بە واتا نێگەتیڤەكەی هەڵدەسەنگێنێ،





واتە هەڵگرتنی بەربەستەکان لە بەردەم تاکدا بۆ ئاسانکردنی هەوڵی ئەو بۆ گەیشتن بە شادمانی تاکەکەسی. بەڵام ستیوارت میل بە واتایەکی پۆزەتیڤ لە قەڵەمی دەدات واتە بەشتێکی پێویستی دەزانی بۆ بە دیهێنانی بەرزبوونەوەی تاك.

بەرای ستیوارت میل بەهای دیموکراسی بە پلەی یەکەم لەبەر ئەوە نییە کە بە هۆیەوە دەتوانرێت بەرژەوەندی خۆپەرستانەی تاکەکان هاوئاهەنگ بکرێت بەڵکو لەو رووەوە بە بەهادار لە قەڵەم دەدرێت کە لە سیستەمێکی لەم جۆرەدا خەسڵەتەکانی مرۆڤ بەرەو باشتر بوون هەنگاو دەنێن.

دیموکراسی، خەڵك بە لێپرسراوتر، چالاکتر و خاوەن رۆحیەتێکی گرووپگەرایانەی زیاتر پەروەردە دەکات. خەڵکێك کە خۆیان بەسەر خۆیاندا فەرمانڕەوایی ناکەن، بەڵکو ئەوانیتر بەسەریاندا فەرمانڕەوایی دەکەن لە رووی ئەخلاقی و عەقڵییەوە بەرەو لەناوچوون دەڕۆن.

## پێگەی دەوڵەت

بەسەرنجدان بەو شتانەی کە گوترا تیۆری دەوڵەتی ستیوارت میل لەگەڵ پێشینانی ئەو لە تیۆری سوودگەراییدا جیاوازییەکی گرنگی هەیە. لە تیۆری ئەودا رۆڵی دەوڵەت تەنیا ئەوە نییە کە شادمانی تاك بگەیەنێتە لوتکە و شادمانی گرووپ زیاتر بکات، بەڵکو چاکترکردنی بەردەوامی چۆنیەتی ژیانی ئەوە. بێنتهام و جەیمز میل بەدەستپێکردن لەم گریمانەیەوە کە مرۆڤەکان بە گشتی باشترین دادوەرن لەسەر بەرژوەندییەکانی خۆیان گەیشتنە ئەم ئەنجامە کە دیموکراسی نوێنەرایەتی باشترین شێوازی حکوومەتە. ئەوان بەسەرنجدان بە بنەماکانی دیدگای خۆیان ناگەنە ئەم ئەنجامگیرییە کە مرۆڤەکان لە هەموو جێگاو لە هەموو کاتێکدا بە بەهرەمەند بوون لە سیستەمی دیموکراسی نوێنەرایەتی دەبنە خاوەن بارودۆخێکی باشتر. ئەوان هەروا کارێکیان بەم پرسەوە نییە کە چ شتێك خەڵك بۆ دیموکراسی شایستە دەکات. ئەوان تەنیا بەو جۆرە



بەڵگەیان دەهێنایەوە کە دیموکراسی باشترین شێوازی حکوومەتە چونکە باشتر لە شێوازەکانی تر دەتوانێ گەرەنتی ئەوە بکات کە دەسەڵاتداران وەك مرۆڤگەلێکی خۆپەرست بە ئاراستەی خوێنی خۆیان بە چ شێوازێك فەرمانڕەوایی بکەن کە خۆشی زیاترین ژمارەی تاکەکانیش دابینبکەن.[٧]

بەڵام ستیوارت میل بۆ ئەوە ستایشی سیستەمی دیموکراسی دەکرد چونکە هەلومەرجی بەرزبوونەوەی ئەخلاقی، عەقڵانی و خۆ-پەروەردە کردن بۆ هاووڵاتیان دەڕخسێنێ. کەوابوو هەرچەندە ستیوارت میلیش سیستەمی دیموکراسی نوێنەرایەتی بە باشترین شێوازی بەڕێوەبردنی سیاسی کۆمەڵگا لە قەڵەم دەدات، بەڵام جەوهەری ئەم دیموکراسییە لە بەدی هێنانی بەرزبوونەوەی تاکدا دەبینێ.

## بەشداری سیاسی

تێڕوانینی ستیوارت میل بۆ بەشداری سیاسیش لەگەڵ تێڕوانینی بێنتهام و جەیمز میلدا جیاوازە. لە روانگەی جەیمز میلەوە دەنگدان بۆ بەرگریکردنە لەو قازانجانەی کە لە حاڵەتی بەشداری نەکردن لە دەنگداندا مەترسی لەدەستچوونیان لێدەکرێت. بەڵام بۆ ستیوارت میل بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و دەنگدان هەوڵێکە لە پێناو بەرەوپێشبردنی تێگەیشتنەکانی خود بەرامبەر بە کۆمەڵگا و پرس و بەهاکانی کۆمەڵگا و هەروا هەوڵدانە بۆ بەدەستهێنانی توانایی تازەکان. هەروەك ئاماژەمان پێکرد بەپێی بنەما گریمانە کراوەکانی جەیمز میل کاتێك کە تاك بەبێ بەشداریکردنی سیاسی قازانجەکانی خۆی بە دابینکراو دەبینێ، ئیدی هیچ هۆیەکی نییە بۆ ئەوەی کە رەنج و ئازاری بەشداریکردن لە هەڵبژاردن بداتە بەرخۆی.

ستیوارت میل بەنرخی ناکۆکی لە تیۆری سیاسی خۆی و سوورانەوە لە گریمانەکانی قوتابخانەی سوودگەرایی بەشداری سیاسی وەك کۆڵەکەیەکی پێویست لە ژیانی کۆمەڵایەتی رادەگەیەنێ کە شتێکی تر ناتوانێ جێگای بگرێتەوە.





## ٥- هەڵسەنگاندنی تیۆروانینی سوودگەرایی

لە تیۆرداڕێژیی سیاسیدا تێڕوانینی سوودگەرایی تووشی پارادۆکسێکی گرنگ هاتووە. لایەنگرانی سوودگەرایی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە لە ئابووریدا قازانجی تاکەکان بەشێوەیەکی سروشتی هاوئاهەنگ دەبێت و ئەگەر هەر کەسێك بە دوای خۆشی و قازانجەکانی خۆیەوە بێت ئەوا قازانجەکانی سەرجەم کۆمەڵگاش دابیندەبێت. بەڵام لە بواری سیاسیدا وەهانییە و هاوئاهەنگی قازانجەکان بە یارمەتی گوشاری دەستکرد (نەك سروشت) دێتە دی. سوودگەرایی بۆ شیکردنەوەی چۆنێتی هاوئاهەنگی قازانجەکان لە نێوان خۆشیخوازانی خودپەرست ناچار بوو پەنا بۆ (دەستی نادیار) ببات، بەم جۆرە بە پێچەوانەی بانگەشەکەی خۆی کە دەیگوت بۆ دژایەتیکردنی میتافیزیك هاتۆتە مەیدان بۆ خۆشی کەوتە ناوداوی میتافیزیکێکی نوێ واتە (دەستی نادیار). ئەوان بە پشتبەستن بە (دەستی نادیاری) ئادام سیمت گوتیان کە هەرچەندە لە کۆمەڵگادا هەرکەسێك بە دوای قازانجەکانی خۆیدا دەگەڕێ، بەڵام دەڵێی رکابەری و بازاڕ دەستێکی نادیاریان هەیە کە قازانجە دژبەیەکەکان لەگەڵ یەکتر هاوئاهەنگ دەکەن و لە ئەنجامدا بەختەوەریی گشتی بە دیاری دەهێنن. تەنیا هێزێك کە دەتوانێ مرۆڤەکان بخاتە ناو پەیوندی لەگەڵ یەکتردا گەڕانە بە دوای قازانجە تایبەتییەکانی خۆیانداو رێك هەر بەم هۆیەشە کە ئەم مرۆڤە خۆپەرستانە بە پێی هاوئاهەنگییەکی لە چارەنووسراو بۆ قازانجی بەرامبەر دەجوولێنەوە.

پارادۆکسی ئەم فەرمانە لەمەدایە کە لە بواری سیاسی لە جیاتی نادیار دەبێ پشت بە دەستی دیار ببەسترێت. لێرەدا دەبێ حکوومەتێك هەبێ کە پێش بە دەستدرێژی تاکەکان بۆ سەر ئازادی یەکتر بگرێت و هەلومەرجێکی وابڕەخسێنێ کە هەر کەسێك زیاترین سوود لە کارەکەی خۆی وەربگرێت. پرسیارێکیتر کە لەم بارەیەوە سەردەردێنێ ئەمەیە کە چۆن سەرەڕای هەبوونی موڵکدارێتی تایبەتی، کە بە رێکەوت پاراستنیشی یەکێکە لە رۆڵە سەرەکییەکانی حکوومەت، دەتوانرێت



گەرەنتی ئەوە بکرێت کە هەر کەسێك لە کاری خۆی زیاترین سوود وەربگرێت. هەروەك لە داهاتوودا دەبینین مارکس رەخنەیەکی وێرانکەری لەم گریمانەیە گرتووە.

جگە لەمەش، هەروەك بێنتهام دەڵێ ئەگەر کاری حکوومەت دابینکردنی زیاترین قازانج بۆ زیاترین ژمارە بێت دەتوانین وێنای ئەوە بکەین کە شێوازی دیکەی حکوومەتیش جگە لە سیستەمی دیموکراسی دەتوانن ئەم مەبەستە بەرەوپێشەوە ببەن. بەم جۆرە بەم بەڵگەهێنانەوەیە ناتوانین زەروورەتی حکوومەتی دیموکراتی بسەلمێنین.

## یادداشتەکان


1- Brian Barry, “Warender and His critics”, philosophy, Vol 43, 1968.

2- C.L. Wayper, Political Thought, English University ptress ltd, 1943, p.95.

3- Ross Harison, Bentham, London, Rout Ledge and Kegan Paul, 1983, p.150.

٤- ایزایابرلین، "جان استوارت میل و غایات حیات"، درچهار مقاله درباره آزادی، ترجمه علی موحد، انتشارات خوارزمی، ص ٣١٠.

٥- فردریك کاپلستون، پیشین، ص ٤٣.

6- J.S. Mill, Utilitarianism, Liberty and Representative Government, London, Every man Edition, p. 74.

7- Alan Rayan, “Two concepts of politics and Demo cracy, James and John Stuart Mill” in Jack Lively and Andrew Reeve, eds.

Modern Political Thought, London, Newyork, Rout ledge, 1989, p. 237.

## پاژی -٦-

## ژان ژاك رۆسۆ

## Jean Jacques Rousseau

### ویستی گشتی وەك سەرچاوەی سیستەمی سیاسی و ئازادی

**ژیان و بەرهەمەکانی**

ژان ژاك رۆسۆ (١٧١٢-١٧٧٨) لە جنێف کە یەکێکە لە شارەکانی سویسرا لە دایکبووە، بەڵام زۆربەی تەمەنی چالاکی خۆی لە فەرەنسا بردە سەر. دایکی رۆسۆ ماوەیەکی کورت پاش لە دایکبوونی ئەو، کۆچی دوایی کرد و رۆسۆ لە لایەن باوکییەوە بەخێوکرا کە بەپیشەی چاککردنەوەی کاتژمێرەوە خەریکبوو و مرۆڤێکی بەدخوو بوو. رۆسۆ خوێندن و فێرکردنێکی رەسمی نەبوو. بەڵام باوکی وەك کتێب خوێنێکی چالاك پەروەردەی کرد. رۆسۆ هەر لە تەمەنی منداڵییەوە گەلێك کتێبی چیرۆك و مێژوویی خوێندەوە. لە تەمەنی ١٣ ساڵی وەکو شاگرد رۆیشتە لای مۆرسازێك کە پیاوێکی بەد رەفتار بوو و لە رۆسۆی دەدا. رۆسۆ لەساڵی ١٧٢٩ لە لایەن ژنێکی خێرخوازەوە پارێزگاریی لێکراو ١٣ ساڵ لە لای ئەو ژنە (کە ناوی ڤارن بوو) ژیا و خەریکی خوێندنەوە بوو. پاشان لە ساڵی ١٧٤٢ ئەم ژنەی بەجێهێشت و رۆیشت بۆ پاریس. لە پاریس لەگەڵ ژنێکی خزمەتکار و رەشۆکی ئاشنابوو و ژیانێکی هاوبەشی لەگەڵ ئەودا دەستپێکرد. چەند منداڵێك بەهۆی ئەم



ژیانە هاوبەشە هاتنە دنیاوە کە رۆسۆ هەم بەهۆی رەوشت و بیروباوەڕی تایبەتی خۆی و هەم بە هۆی هەژاری نەیتوانی گەورەیان بکات و بە هەتیوخانەی سپاردن. رۆسۆ لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا هەر لە کیمیاوە بگرە هەتا مۆسیقا، بە تایبەت لە ئەدەبیات خەریکی تۆژینەوە و راهێنان بوو. لە ساڵی ١٧٤٩، رۆسۆ بە نووسینی وتارێك بە مەبەستی بەشداریکردن لە پێشبڕکێیەکی وتارنووسین لەسەر راسپاردەی ئاکادیمیای دیپۆژن یەکەمین سەرکەوتنی لە بواری نووسەریدا بە دەستهێنا. لەم نووسینەدا کە ناونیشانەکەی بریتییە لە (وتار دەربارەی زانستەکان و هونەرەکان)، رۆسۆ چاکبوونی سروشتی مرۆڤ لە بەرامبەر گەندەڵی سەرچاوەگرتوو لە شارستانیەت دادەنێت. لە ساڵی ١٧٥٢ تا ١٧٦٢، رۆسۆ بەکارێکی چڕوپڕ گرنگترین نووسینەکانی خۆی دەنووسێ کە بریتین لە (وتار دەربارەی سەرچاوەی نایەکسانی)، (ئیمیل) و (گرێبەستی کۆمەڵایەتی).

لە کتێبی (وتار دەربارەی سەرچاوەی نایەکسانی)، رۆسۆ یەکسانی سروشتی لە بەرامبەر ئەو نایەکسانییە دادەنێت کە لە دامەزراوەکانی مرۆڤی کۆمەڵایەتییەوە سەرچاوەیان گرتووە. لە (وتاری دووهەم) هەموو خراپەکانی کۆمەڵگای مرۆیی لە موڵکدارێتی و نایەکسانیدا دەبینێ. کتێبی (ئیمیل) تیۆری پەروەردەیی رۆسۆ دەگرێتەوە. لێرەشدا رۆسۆ داهێنانێکی نوێی هەیە و دەڵێ کە منداڵ خاوەن زەین، سۆز و تێگەیشتنێکی تایبەتییە کە لەگەڵ گەورە ساڵاندا جیاوازە و نابێ زەینی منداڵ و گەورە ساڵ وەکو یەك سەیر بکرێن.

سەرەنجام (گرێبەستی کۆمەڵایەتی) پرۆژەیەکە بۆ سەر لە نوێ دروستکردنەوەی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی مرۆڤ بە جۆرێك کە مرۆڤ ئەو سەربەخۆیی و ئازادییەی خۆی بە دەستبهێنێتەوە کە لە رەوشی سروشتدا هەیبوو. لە ئیمیلدا رۆسۆ بایەخ بە تاکی مرۆڤ و لە گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا بایەخ بە کۆمەڵگای مرۆیی دەدات.

## بەرەو جۆرێکی تازە لە تیۆرییە سیاسییەکان

پاش لێکۆڵینەوە لە هزری سیاسیی هزرڤانانی پەیوەندیدار بە تێڕوانینی سوودگەرایی لە پاژێکی جیاوازدا ئێستا لە رووی مێژووییەوە هەندێك بۆ دواتر دەگەڕێینەوە و بە هزری سیاسیی رۆسۆوە خەریکدەبین کە تیۆرییە سیاسییەکەی لە جۆرێکیترە و لە یەکڕووەوە لە بەرامبەر تیۆری بیرمەندانی سوودگەراییدا رادەوستێ. ئەو هزرڤانانەی کە تا ئێستا لە تیۆرییەکانیان کۆڵینەوە لە هۆبزەوە تا ستیوارت میل ئۆرگانێکی سەرەکی کلاسیکیان دارِشت کە بە نەریتی لیبرالیزم لە هزری سیاسیدا ناودەبرێت. لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ئەم نەریتە لە هزری سیاسیدا ئەوەیە کە کۆمەڵگای سیاسی بە خاوەن سەرچاوەیەکی دەستکرد لە قەڵەم دەدرێت. هەروا دەوڵەت وەك دەزگایەك لێك دەدرێتەوە کە بۆ پاراستنی ئاسایش دروستکراوە یا وەك ماشینێك لە قەڵەم دەدرێت کە بۆ پێکەوە گونجاندنی قازانجەکان دانراوە. هەروەك بینیمان هۆبز و لۆك دەوڵەتیان بە دەزگا و ئامرازێك دەزانی بۆ پاراستنی ئاسایش و بێنتهام و میل بە ماشینێك بۆ پێکەوە گونجاندنی دژبەیەکان راڤەیان دەکرد. لە تێروانینێکی وەها بۆ کۆمەڵگای سیاسی و دەوڵەت، لە نێوان ئازادی تاك و دەسەڵاتی دەوڵەتدا دژایەتییەکی ریشەیی بە دی دەکرێت و دەوڵەت بە تەنیا خراپەیەکی پێویست لە قەڵەم دەدرێت کە دەبێ تاکەکان لە دەستدرێژیکردن بۆ سەر ئازادی یەکتر دووربخاتەوە. بەشداریکردنی سیاسی بۆ بەرگریکردنە لە قازانجەکان و گۆڕەپانی تاکە کەسی.

ئەگەر ستیوارت میل سەبارەت بە پێگەی دەوڵەت و بەشداریکردنی سیاسی بۆچوونێکی جیاواز و بەرچاو روونییەکی نوێی بە دەستهێنا بوو ئەمە بە بەهای بەلاوەنانی بنەماو گریمانە سەرەکییەکانی سوودگەرایی بوو.

رۆسۆ، تارادەیەکیش کانت، و لە ئاستێکی بەرزتردا هیگل کە لەم پاژە و لە پاژەکانی دواتردا باسیان لێوەدەکەین سەبارەت بە کۆمەڵگای سیاسی، دەوڵەت،



بەشداریکردن و ئازادی شیکردنەوەیەکی تر و دیدگایەکی تریان هەیە. رۆسۆ و هیگل کۆمەڵگای سیاسی بە پەیکەرێکی ئۆرگانێك و زیندوو لە قەڵەم دەدەن نەك ماشینێکی دەستکرد بۆ پاراستنی ئاسایش و پێکەوە گونجاندنی قازانجە دژبەیەکەکان. وێنەی ئۆرگانیك لە کۆمەڵگای سیاسی بۆ سەردەمی بیرمەندانی یۆنانی کۆن دەگەڕێتەوە بەڵام ئەو شیکردنەوەیەی کە رۆسۆ و هیگل لەم بوونەوەرە ئۆرگانیکەوە دەیخەنە روو لەگەڵ وێناکردنی بیرمەندانی کلاسیکدا جیاوازە. تێڕوانینی رۆسۆ و هیگل و تا رادەیەکی زۆریش کانت بۆ بەشداریکردنی سیاسی لەگەڵ هزرڤانانی سەر بە رێبازی گرێبەستی کۆمەڵایەتی (هۆبز و لۆك) و سوودگەراییش (هیوم، بێنتهام و جەیمز میل) جیاوازە. رۆسۆ، کانت و هیگل بەشداریکردنی سیاسی وەك چالاکی و پرۆسەیەك بۆ خۆ-گەشاندنەوە و خۆ-پەروەردەکرنی تاك لە قەڵەم دەدەن نەك بۆ بەرگریکردن لە شادمانی و قازانجی تاکەکەسی. بۆ ئەوان بەشداری کردنی سیاسی و ئازادی تاك بەهایەکی ناوەڕۆکی هەیە نەك ئامرازی. لە دیدگای ئۆرگانیکی، تاك و دەوڵەت لە بەرامبەر یەکتردا دانانرێت و دەوڵەت (بەو واتایەی کە لەم دیدگایەدا مەبەستە، نەك بە واتای حکوومەت) بۆ بەدیهێنان و کاملکردنی ئازادی بەشتێکی پێویست لە قەڵەم دەدرێت. لە دیدگای ئۆرگانیستیدا دەوڵەت رێکخراوێکی جیا لە کۆمەڵگای مرۆڤ نییە. رۆسۆ رەخنە لەم تێڕوانینە دەگرێت کە تاك و دەوڵەت لە بەرامبەر یەکتردا دادەنێت و نەتەنها دژایەتییەکی لۆژیکی لە نێوانیاندا بەدیدەکات، بەڵکو ئەو دەوڵەتی بەشێوازی دەسەڵاتدارێتی (ویستی گشتی) بەکەسایەتییەکی گرووپی لێکدایەوە کە مرۆڤ لەو رێگایەوە دەگاتە ئازادی.

## نەخشەی گشتی سیستەمی هزریی رۆسۆ

رۆسۆ لە کتێبی (گرێبەستی کۆمەڵایەتی) کە کتێبی سەرەکی ئەوە دەربارەی کۆمەڵگای سیاسی و سەر لە نوێ سازکردنەوەی هەر لەهەمان بنەماکانی هۆبزەوە





واتە ڕەوشی سروشتی دەستپێدەکات. بەڵام ئەو، ڕەوشی سروشتی بە شێوازێکی جیاواز لێکدەداتەوە و دەگاتە ئەنجامگەلێکی جیاواز. بەپێی بۆچوونی ڕۆسۆ لە ڕەوشی سروشتی مرۆڤەکان لێك تەریك کەوتوونەتەوە و لێکتر جیاوازن. ئەو خۆپەرستی و زێدەخوازییەی کە هۆبز باسی لێوە کردووە لە ڕەوشی سروشتیدا بوونی نییە بەڵکو لە ڕەوشی کۆمەڵایەتییدا سەری هەڵداوە. لە ڕاستیدا لە ڕەوشی سروشتی مرۆڤ لە خوارەوەی چاك و خراپدایە چونکە چاکە و خراپە لە ڕەوشی کۆمەڵایەتییدا سەریهەڵداوە. مرۆڤ لە ڕەوشی سروشتی سەربەخۆ و ئازادە. لە ڕەوشی سروشتی (کە هەم ڕەوشێکی مێژوویی و هەم شیکارییە) مرۆڤە تەریك کەوتوو و پەراگەندەکان بە ڕێکەوت بە یەکتردەگەن. بەڵام هەر ئەم بەیەك گەیشتنە دەگمەنانە قازانجی هاوکاری و ژیانی هاوبەشیان فێردەکات. ئینجا هاوکاری و ژیانی بە کۆمەڵ دەستپێدەکات. ژیان لە هەلومەرجی هاوکاری و لە ڕەوشی گرووپیدا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی پسپۆریی و دابەشکردنی کار. هاوکات لەگەڵ گەشەکردنی پسپۆڕی و دابەشکردنی کار مۆڵکدارێتی تایبەتی پەیدادەبێت و بەفراوانکردنی ئۆرگانی موڵکدارێتی تایبەتی زاڵبوونی هەندێك لە مرۆڤەکان بەسەر هەندێکی تردا دەستپێدەکات. بۆ پاراستنی ئەم دەسەڵات و نایەکسانییە پێویست بە بوونی حکوومەت دەکات و مرۆڤ لە ڕەوشی سروشتی دەردەچێت و ڕەوشی مەدەنی دەستپێدەکات. لێرەوە مرۆڤ بەسەر بەرەو کۆت و زنجیرەکانی خۆی دەڕوات. سەردەمی سەربەخۆیی، ئازادی و یەکسانی کۆتایی پێدێت. ئەمە ناوەڕۆکی ئەو وتە بەناوبانگەی ڕۆسۆیە کە دەڵێ ((مرۆڤ ئازاد لە دایکبووە بەڵام بەردەوام لە زنجیردایە.))

بەڵام ئایا مرۆڤ بەردەوام لە زنجیردا دەمێنێتەوە؟ ڕۆسۆ لە کتێبی (وتار لەمەڕ زانستەکان و هونەرەکان) گەندەڵی سەرچاوەگرتوو لە شارستانیەت لە بەرامبەر چاکبوونی سروشتی مرۆڤدا دادەنێ. لە کتێبی (وتار لەمەڕ سەرچاوەی نایەکسانی) نایەکسانی سەرچاوەی گرتووە لە دامەزراوەکانی دروستکراوی کۆمەڵگا لە



بەرامبەر یەکسانی لە ڕەوشی سروشتیدا دادەنێت و نایەکسانی و موڵکدارێتی بە سەرچاوەی هەموو خراپەکان لە قەڵەم دەدات. وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرەوە ئەمەیە کە نەخێر، مرۆڤ جارێکی‌تر دەتوانێ ئەو سەربەخۆیی، ئازادی و یەکسانییە بە دەستبهێنەوە کە لەمەو پێش لە ڕەوشی سروشتیدا هەیبوو. ئەم کارە نەك بە گەڕانەوە بۆ ڕەوشی سروشت بەڵکو بەسەرووتر چوون لەم ڕەوشەی ئێستا دێتەدی. لێرەدایە کە پێگەی سیاسەت بۆ سەر لە نوێ دروست کردنەوەی کۆمەڵگا دێتە ئاراوە. بە دروستکردنی کۆمەڵگای عەقڵانی کە تێیدا هەموو کەسێك ویستی خۆی لەگەڵ (ویستی گشتی)دا گرێبدات و لە کاتی ملکەچبوون بۆ ویستی گشتی تەنیا ملکەچی ویستی خۆی بێت، ئەو سەربەخۆیی، ئازادی و یەکسانییە بە دەستدەهێنێتەوە کە لە ڕەوشی سروشتیدا هەیبووە. ئەم موعجیزەیە بە دەسەڵاتدارێتی ویستی گشتی لە سیستەمی کۆمەڵگادا دێتەدی.

## هەڵسەنگاندنی گرێبەستی کۆمەڵایەتی هۆبز و لۆك و تێڕوانینی سوودگەرایی

تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتی بە پێی تێڕوانینی هۆبز و لۆك لەسەر ئەم گریمانەیە بنیاتنراوە کە ڕەوشی سروشتی ڕەوشێکی ناخۆشە. کەوابوو مرۆڤەکان بڕیاردەدەن کە بەشێك لە ئازادییە بێ سنوورەکانی خۆیان بە کەسێکی سروشتی یا مەعنەوی بسپێرن کە لە ڕەوشی سروشتیدا لێی بەهرەمەند بوون و بەم جۆرە دەسەڵاتێکی هاوبەش بنیات بنێن کە لە بەرامبەر زێدەخوازی و خۆپەرستیدا ئاسایشی تاکەکان بپارێزێت. لە ڕاستیدا ئەو ئەنجامانەی کە لەم تیۆرییە پێیدەگەین بەم جۆرەی خوارەوە هەڵدەسەنگێندرێن:

١- ئەو ڕەوشە مەدەنی، یا کۆمەڵایەتییەی کە بە هۆی گرێبەستەوە دێتە دی لە ڕووی پاراستنی مافەکانی تاکەوە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ڕەوشی سروشتیدا نییە جگە لەوەی کە ئەو مافانە ئێستا لە لایەن ئەوانیتر بە فەرمی ناسراوە و بە هۆی یاسا دانراوە پابەندراوەکانەوە (مولزەم) پەسند و جێگیرکراون. کەوابوو هەر





کاتێك کە دەوڵەت دەستدرێژی بکاتە سەر مافەکانی بواری تایبەتی بە شێوەیەکی لۆژیکی گرێبەستی پێشێل کردووە و ڕەوایەتی خۆی لە دەستداوە.

٢- ئەم گرێبەستە کۆمەڵگایەك ناخولقێنێ بەڵکو دەوڵەتێك، واتە کۆمەڵگایەکی فەرمی و یاسایی دەخولقێنێ. ئەم کۆمەڵگایە گۆڕەپانێکە بۆ ڕکابەری لە نێوان قازانجە تایبەتییەکاندا. لە ڕاستیدا هەر کەسێك لە چوارچێوەی گرێبەستدا ڕەزامەندی لەسەر ئەم پرەنسیپە دەربڕیوە کە دەبێ بە دوای بەرژەوەندییەکانی خۆیدا بگەڕێت. خاڵی پێکەوە گرێدانی نێوان تاکەکانیش هەر ئەم خاڵەیە. کەوابوو خاڵی هاوبەش ویستی گشتی شتێکی نیگەتیڤە. واتایەکی دیکەی ئەم وتەیە ئەوەیە کە بوونی کۆمەڵگا پشت بە سەقامگیربوونی حکوومەت دەبەستێ.

٣- بناغەی ئەو پەیکەرەی کە بەم جۆرە دروستدەکرێت لەسەر موڵکدارێتی تایبەتی بنیاتنراوە. موڵکدارێتی تایبەتی لەگەڵ ئازادیدا پەیوەندییەکی نەپچراویان هەیە. کەوابوو یەکسانی مرۆڤەکان تەنیا دەتوانێ یەکسانییەکی رواڵەتی بێت.

ڕۆسۆ ئەم بنەمایانە پەسند ناکات کە لەسەر گرێبەستی کۆمەڵایەتی بە پێی لێکدانەوەی هۆبز و تاڕادەیەك لۆك و سوودگەرایی بنیاتنراون و دەڵێ کە ئەگەر قازانجی هاوبەش بەوە سنووردار بکرێت کە هەموو لایەنەکانی گرێبەست ڕەزامەندی لەسەر ئەوە دەربڕن کە هەر کەس بە ڕێگای خۆیدا بڕوات لە ڕاستیدا ئیدی کۆمەڵگایەك بوونی نییە بەڵکو تەنیا کۆمەڵێکی رواڵەتی لە ئارادایە. لە ڕاستیدا مرۆڤەکان هەر لە ڕەوشی سروشتیدا ماونەتەوە، لە کاتێکدا کە بەپێی لۆژیك گرێبەست بۆ پاراستنی مرۆڤی سروشتی نییە بەڵکو بۆ دابڕانی ئەوە لە ڕەوشی سروشتی و دروستکردنی بوونەوەرێکی نوێیە لە ئەو: ((بوونەوەرێکی سروشتی)) و بوونێکی ئەخلاقی لەباتی بوونێکی فیزیایی. ئەم بەکۆمەڵایەتیکردنەش لە بنەڕەتدا لە بواری ئەخلاق و سیاسەت دێتەدی نەك لە بواری ئابووری.[1]



## دیدگای ئۆرگانیکی بۆ کۆمەڵگای سیاسی و سیستەمی سیاسی

بەم جۆرە بەپێی بۆچوونی ڕۆسۆ تێڕوانینی ئامرازیی و ماشێنی بۆ کۆمەڵگای سیاسی و دەوڵەت ناتوانێ ڕاڤەکردنێکی دروست لە کۆمەڵگای سیاسی بە دەستەوە بدات. ڕۆسۆ لەو باوەڕەدایە کە ئەم تێڕوانینە ناتوانێ وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە کە دەوڵەت بۆچی بوونی هەیە و بۆچی دەبێت ملکەچی بیت. ڕۆسۆ بۆ نەهێشتنی ئەم کەموکووڕییە و دۆزینەوەی وەڵامێکی دروست بۆ چۆنیەتی و بۆچییەتی کۆمەڵگای سیاسی و سیستەمی سیاسی رووی کردە دیدگای ئۆرگانیکی دەوڵەت. لەم دیدگایەدا دەوڵەت نەك وەکو ماشێن بەڵکو وەك ئۆرگانیزمێکی زیندوو دەخرێتە بەر شیکردنەوە. بەسەرنجدان بەپێشکەوتنەکانی زانستی بایۆلۆژی، لایەنگرانی تیۆری ئۆرگانیکی دەوڵەت لێك چوونێکی بەرچاویان لە نێوان گەشەکردن و کامڵبوونی بوونەوەری زیندوو وەك نمایشێکی بەرزی ژیان لەگەڵ گەشەکردن و کامڵبوونی ئۆرگانە سیاسیەکاندا بەدی دەکرد. هەروەك چۆن بە پێشکەوتنی شارستانیەت پێداویستی و چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان گەشە دەکەن هەر بەم جۆرەش پێکهاتەی کۆمەڵگای سیاسیش بەرەو ئاڵۆز بوون دەڕوات و دەوڵەت دەسەڵاتێکی زیاتر بەدەستدەهێنێ. لە تێڕوانینی ئۆرگانێکی بۆ کۆمەڵگا، دەوڵەت وەك گشتێك سەیر دەکرێت کە تەنیا کۆکردنەوەی ژمارەیی بەشەکانی خۆی (تاکەکان) نییە بەڵکو چۆنێتییەکی جیاوازە. لە دیدگای ئۆرگانیزمیدا دەوڵەت بەشێکی جیاکراوە لە کۆمەڵگا نییە، بەڵکو بەشێکی جەوهەرییەتی کە لەگەڵ ئەودا گەشەدەکات و کامڵدەبێت و لەسەر ئەم بنەمایەش لە رووی ئاستی تێکەڵبوون بە پێی دواکەوتووتر بوون یا پێشکەوتووتر بوون هەڵدەسەنگێندرێت.

ڕۆسۆ کە دەستپێکەری تێڕوانینی ئۆرگانیستی دەوڵەت بوو هێشتاش لە هەندێ حاڵەتدا زاراوەکانی دیدگای میکانستی (ئامرازی) بەکاردەهێنا و هەندێك لە پاشماوەکانی ئەم دیدگایەی لە ڕاڤەکردنەکانی خۆیدا هەبوو. بەڵام هیگل ئەم





دیدگایەی بۆ بەرزترین ئاستی خۆی گەشە پێدا. دوای ئەم پێشەکییە لە باسەکانی خوارەوەدا سەیرێکی گرنگترین بەش و رەهەندەکانی هزری سیاسیی رۆسۆ دەکرین.

## ١- کۆمەڵگا و رەوشی سروشتی

بەپێی بۆچوونی رۆسۆ هەردوو غەریزەی خۆشەویستیی خود و هەستی هاودەردی، سروشتی مرۆڤ دروستدەکەن. چونکە ئەم دووە زیاد لەوەی زیانبەخش بن سوودمەندن، بۆیە دەبێت بڵێین کە سروشتی مرۆڤ چاکە. بە زۆری ئەم دوو غەریزەیە دەکەونە رووبەڕووی یەکتر. کەواتە پرسیارەکە ئەوەیە کە مرۆڤ چۆن رێگەی خۆی هەڵدەبژێرێت؟ هەستێکی تر هەیە بەناوی ویژدان کە هاندەری مرۆڤە بۆ کاری دروست. ویژدان پێویستی بە رێبەرێك هەیە کە ئەویش عەقڵە. عەقڵ مرۆڤ فێردەکات کە دەبێت چ کارێك ئەنجامبدات و ویژدانیش هانی دەدات بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە. مرۆڤی سروشتی مرۆڤێکە کە لە ناخیدا هەماهەنگی هەیە لە نێوان ویژدانی بە هێز و عەقڵی دروستدا. عەقڵ نەك تەنها غەریزەکانی مرۆڤ رێکدەخات بەڵکو پەرەشیان پێدەدات و بۆ ئەم کارەیش پێویستی بە کەلتوورو کۆمەڵگا دێتە کایەوە. کۆمەڵگا واتا بە ئازادی دەبەخشێت و ئەو سەربەخۆییەی کە مرۆڤ لە رەوشی سروشتیدا هەیەتی دەیگۆرێت بۆ ئازادی راستەقینە. مرۆڤ لە کۆمەڵگادا شتگەلێك بە دەست دەهێنێت کە سەربەخۆیەتی و خود رێسای رەوشی سروشتی ناتوانێت پێی ببەخشێت: مرۆڤ لە کۆمەڵگادا کۆمەڵە مافێك بە دەستدەهێنێت کە بە پیشتیوانی هێزێکی گەورەتر لە هێزی خۆی زامنکراوە.

## گرێبەستی کۆمەڵایەتی

رۆسۆ لە کتێبی ئەمیلدا دەیەوێت پیشانی بدات کە چۆن دەتوانرێت لە کۆمەڵگایەکی گەندەڵدا مرۆڤی تەندروست پەروەردە بکرێت. بەڵام لە کتێبی گرێبەستی کۆمەڵایەتییدا باس لە کۆمەڵگای عەقڵانی دەکات و دەڵێت کە



پێویستە بونیادبنرێت تا وەکو مرۆڤ تیایدا بەخود رێسایی و ئازادی بگات. ئەو خودرێساییەی کە لەبارەی سروشتیدا هەیبووە و باری شارستانی و کۆمەڵایەتی ئەوی لێ بێبەش کردووە. گرێبەستی کۆمەڵایەتی وەسفی کۆمەڵگایەك دەکات کە دەبێت پێی بگەین. بەواتایەکی تر کۆمەڵگایەکی ئایدیالییە کە لە ئایندەدا دروستدەبێت. رۆسۆ روونی دەکاتەوە کە پێویستە ئەم کۆمەڵگایە چۆن بێت بەڵام روونی ناکاتەوە کە پێویستە چۆن دەست پێبکرێت بۆ هەنگاونان بەرەو ئەو کۆمەڵگایە. لە (وتاری پەیدابوونی زانست و هونەرەکان) و لە (وتاری نایەکسانی) و (وتاری دووەم) زیانەکانی کۆمەڵگای سەردەمی خۆی و شارستانییەتی سەردەمی خۆی دەخاتە روو و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بنەمای هەموو ئەم زیانانە بریتییە لە نایەکسانی کە دروستکەری ئۆرگانەکانی کۆمەڵگای مرۆییە و لەوانە مۆڵکداری تایبەتی. هەروەها لە گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا روونی دەکاتەوە کە کۆمەڵگای دروست (کە لەم زیانانە بەدوورە) چۆن کۆمەڵگایەکە. بەڵام روونی ناکاتەوە کە پێویستە چۆن لەم کۆمەڵگایەوە بەرەو ئەو کۆمەڵگایە برۆین.

تێپەڕبوون لەو کۆمەڵگا گەندەڵەی کە هەیە بەرەو کۆمەڵگای ئایدیالی رۆسۆ بۆ خۆی شۆڕشێکی گەورەیە کە رۆسۆ باسی لێوەناکات.

هەندێ جار گرێبەستی کۆمەڵایەتی لە تێڕوانینی رۆسۆدا گرێبەستێك نییە کە مرۆڤەکان لەگەڵ دەسەڵاتداراندا دەیبەستن و کەس یا خود چەند کەسێکی پێ دیاری دەکەن بۆ دەسەڵاتداری خۆیان. وەها گرێبەستێك بە گشتی جیاوازە لەگەڵ تێڕوانینەکەی رۆسۆدا. چونکە بە بۆچوونی رۆسۆ وەها گرێبەسێك بەو واتایە کە مرۆڤەکان پلەو پایەیەك دەدەنە دەسەڵاتداران کە نابێت بدرێ و کارێك دەکەن کە نابێت بیکەن، چونکە ئەم کارە بەو واتایەیە کە خۆیان بکەنە کوێلەی کەسانێکی تر. وەها گرێبەستێك پێچەوانەی ئەو مەبەستەیە کە مرۆڤەکان لە پێناویدا کۆبوونەتەوە و کۆمەڵگایەکیان دروستکردووە. مرۆڤەکان بۆ کرانەوە و گەشانەوەی سروشتی خۆیان کۆبوونەتەوە وەها گرێبەستێك (هاوشێوەی ئەو گرێبەستەی کە

هۆبز و لۆك باسی دەكەن) بەرەو كۆیلایەتیان دەبات و مەبەستەكەیان لەناودەبات. مرۆڤ پێویستی بە كۆمەڵگایەكە كە تیایدا گەشە بكات و ببوژێتەوە و بەبێ ئازادی وەها شتێك نایەتەدی.

كۆمەڵگایەك دەتوانێت جێ مەبەستی كۆبوونەوەی مرۆڤەكان بێت كە تیایدا هەر كەسەو سەرەرای ئەوەی كە لەگەڵ هەمووواندا یەكیگرتووە لە لایەن هیچ خواستێكی تری جگە لە خواستی خۆی فەرمانی بە سەردا نەدرێت و وەكو بەر لە پەیوەندی كردن بە كۆمەڵگاوە ئازاد بێت.

## كۆمەڵگای ئایدیالی

شتێكی وەها چۆن دێتە دی؟ چۆن دەكرێت كەسێك هەم لە كۆمەڵگادا یەكگرتوو بێت لەگەڵ هەمووواندا و هەم شوێنكەوتووی رێكی بێت و لەهەمانكاتیشدا جگە لە خواستی خۆی لە ژێر فەرمانی كەسی تردا نەبێت؟ ئەمە پارادۆكسێك بوو كە تەواوی هزری سیاسی مۆدێرنی بەر لە رۆسۆ دەستەویەخەی بوون، هزری مۆدێرن لەو كاتەوەی كە نكۆڵی لە هەموو جۆرە پێگەیەك كرد بۆ هێزە میتافیزیكی و گەردوونییەكان لەناو كۆمەڵگای مرۆیی و سیستەمی سیاسیدا و بانگەشەی ئەوەی كرد كە مرۆڤ ئازادە پێویستە شوێن خواستی خۆی بكەوێت نەك خواستی كەسانی تر، ئەم پارادۆكسەی لە بەرامبەر خۆیدا بینییەوە. ئەم پارادۆكسە هەروەك ئاماژەی پێكرا بەم جۆرەیە كە چۆن ئێمە دەتوانین لە كۆمەڵگادا هەم فەرمانبەربین (واتە جێبەجێ كردنی فەرمانی كەسانی تر) و لەهەمانكاتیشدا ئازاد بین. فەرمانبردن بە واتای شوێنكەوتنی ویستی ئەوانیترە و وەك ناخودرێسایی (نەبوونی سەربەخۆیی) و ئازاد نەبوونە. چۆن دەتوانین هەم فەرمانبەریین و هەم ئازاد.

گرێبەستی كۆمەڵایەتی هۆبز و لۆك هەروەك بینیمان بە فەرمانبردنی كەسەكان لە بەرامبەر فەرمانڕەوادا (چ فەمانڕەوایی رەهای تیۆرەكەی هۆبز یان فەرمانڕەوای سنووورداری تیۆرییەكەی لۆك) كۆتایی دێت. وەها گرێبەستێك هەروەك رۆسۆ



دەڵێت دژی مەبەستی كۆبوونەوەی مرۆڤەكانە و گرێبەستی كۆیلەییە، چونكە پایەیەك دەبەخشێتە دەسەڵاتدار كە بەرزتری دەكاتەوە لە چاو كەسەكانی تر. لە لایەكی ترەوە بۆچوونی سوودگەراییش دەبێتە مایەی كەم كردنەوەی خواست لە بەرامبەر حەزو ئارەزووەكاندا و بە چەمكێكی نێگەتیڤانە تەماشای ئازادی دەكات (نەبوونی سەربەخۆیی) و دەوڵەتیش بە (خراپەی پێویست) دادەنێت. بەم جۆرە لەم دوو بۆچوونەدا هێشتا دژایەتی هەیە لە نێوان تاك و حكوومەت و دەوڵەت و تاك بەفەرمان وەرگرتن لە دەسەڵاتداران بە شێوەیەكی تەواو فەرمان لەخۆی وەرناگرێت، بۆیە فەرمانبەرە نەك ئازاد. بە شێوەیەكی گشتی كاتێك كە دەوڵەت بە ئامرازێكی دەستكرد یان ماشێنی دابنێین بۆ رێكخستنی خواستە ناكۆكەكان، بە شێوەیەكی رەها ناتوانین ئەوە بڵێین كە تاك پەیڕەوی لە سیستەمی دەوڵەت بە تەواوی شوێن وێستی خۆی كەوتووە.

یەكێك لە لایەنە سەرەكییەكانی هزری سیاسی لای رۆسۆ و تیۆری دەوڵەتەكەی چارەسەركردنی ئەم پارادۆكسەیە (پارادۆكسی فەمانبردن و ئازادبوون).

## دەسەڵاتداری یاسا و رێگا چارەی پارادۆكسی ئازادی و فەرمانبردن

رۆسۆ لە بەرامبەر ئەو پرسیارەی كە دەڵێت چۆن دەكرێت كەسێك لەگەڵ ئەوەی كە لەگەڵ خەڵكیدا یەكگرتووە لە كۆمەڵگایەكی سیاسیدا. لەهەمانكاتیشدا پەیڕەوی لە ویستی خۆی بكات و وەكو قۆناغی بەر لەپەیوەندیكردنی بە كۆمەڵگا ئازادبێت، دەڵێت كە ئەمە لە كاتێكدا دەكرێت كە یاسا دەسەڵاتدار بێت. كاتێك كە تاك پەیڕەوی یاسا دەكات وەكو رەنگدانەوەی ویستی گشتی، لە راستیدا پەیڕەوی خواستی خۆی دەكات و ئازادە. رۆسۆ ئەم كێشە سەختە فەلسەفییە بەم شێوەیە دەخاتە روو و وەڵامی دەداتەوە:

ئەو دەپرسێت: (چۆن دەكرێت كە مرۆڤ بێ ئەوەی كەسێكی هەبێت لەسەرووی خۆیەوە تاوەكو فەرمانی پێبدات بتوانیت فەرمان جێبەجێ بكات. بێ ئەوەی





گەورەیەکی هەبێت خزمەت بکات و کاتێك کە بەشێوەیەکی رواڵەتی لە ژێر فەرماندا کاردەکات لە هەموو کاتێکی تر ئازادتر بێت و تەنها ئەو بەشەی ئازادی خۆی لەدەستبدات کە تەنها دەتوانێت ئازاری کەسانی تری پێبدات؟) و وەڵام دەداتەوە کە: (ئەمە سەیری کاری یاسایە. تەنها لە سایەی یاسادایە کە مرۆڤ دەگاتە داد پەروەری و ئازادی.... ئەمە هەر ئەو دەنگە ئاسمانییە کە وانەی فەرمانڕەوایی عەقڵی گرووپی بە هەموو هاوولاتیەك دەڵێتەوە و فێریدەکات کە بە پرەنسیپی بەڵگە نەویستی دادوەریکردنی خۆی کاربکات و نەکەوێتە ناکۆکییەوە لەگەڵ خۆیدا.)[٢]

## ٢- ویستی گشتی

کۆمەڵگا مرۆییەکان هەمیشە بۆخۆیان یاساگەلێکیان هەبووە. ئایا هەر یاسایەك وەها پەرجوویەکی تیادایە کە رۆسۆ لە سەرەوە باسی دەکات؟ ئایا لە راستیدا ئێمە بە پەیڕەوی کردنی هەموو یاسایەك پەیڕەوییمان لە خۆمان کردووە و سەربەخۆی و ئازادی خۆمان پاراستووە؟ بێگومان وەڵامی رۆسۆ نەخێرە. رۆسۆ باس لە یاسایەك دەکات کە هەڵقوڵاوی ویستی گشتی یان لە راستیدا خودی ویستی گشتییە. کەواتە پێویستە بزانین کە ویستی گشتی چییە؟

ویستی گشتی یەکێکە لە دوکترینە سەرەکییەکانی هزری سیاسی و تیۆری سیاسی رۆسۆ. ئەم چەمکە لە تیۆری رۆسۆدا لە تەم و مژ و ئاڵۆزی بە دوور نییە. ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین بە روونکردنەوەیەکی کورت ئەم چەمکە پێناسە بکەین، هەڵبەتە وا نازانین کە روونکردنەوەکەی ئێمە بەس بێت بۆ خستنەڕوویەکی سادەی ئەم چەمکە. لە پێناسەیەکی سادەدا دەتوانین بڵێین کە ویستی گشتی ویستی هەموو ئەو هاوولاتییانەیە کە قازانجی تایبەتی خۆیان ناوێت، بەڵکو خوازیاری قازانج و باشەی گشتین. بە واتایەکی تر ویستی گشتی ویستی هەمووانە بۆ چاکەی گشتی. کاتێك کە تۆ پەیوەندی بە کۆمەڵێکەوە دەکەیت و لەگەڵیاندا بە دوای



مەبەستێکی هاوبەشدا دەگەڕێیت، گومانی تیادانییە کە قازانجە تایبەتییەکانی خۆیشت لە بەرچاوگرتووە. بەڵام ئەگەر بڕیار وابێت کە تەنها بیر لە قازانجە خۆپەرستانەکانی خۆیان بکەیتەوە و کەسانی تریش بە هەمان شێوە بیر لە قازانجە خۆپەرستانەکانی خۆیان بکەنەوە ئیدی هیچ شوێنێك بۆ وەها کۆمەڵێك نامێنێتەوە، کەواتە ناچاریت تەنها بیر لە قازانجە خۆپەرستانەکانی خۆت نەکەیتەوە بەڵکو چاوت لە قازانجی گشتیش بێت. ئەگەر تۆ بەم جۆرە کاربکەیت و کەسەکانی تریش بە هەمان شێوە، ئەو کۆمەڵە دەگەشێتەوە و گەشەدەکات. لەم کاتەدا گیانێکی گشتی یان ویستێکی گشتی دروست دەبێت. بەم جۆرە ویستی گشتی ویستی کۆی ئەو هاوولاتیانەیە کە قازانجی تایبەتی خۆیان ناوێت، بەڵکو خوازیاری چاکە و قازانجی هاوبەشن.

هەندێ کاتیش واهەستدەکەیت کە رۆسۆ لە ویستی گشتییەوە (عەقڵی گرووپ) و عەقڵی کۆمەڵی بە دەستهێناوە. عەقڵی گرووپ یان عەقڵی کۆمەڵ پێکهاتووە لە باشترین ویستی هەموو هاوولاتییان کە خوازیاری باشترین قازانجی کۆمەڵ یان دەوڵەتن.

بەم جۆرە تاکەکانی ناو کۆمەڵگا کاتێك ملکەچی یاسا دەبن کە یاسا دەربڕی ویستی گشتییە و ویستی گشتیش کردووە، واتە ویستی راستەقینەی خۆی. لێرەدا تەم و مژێکی دیکە دروست دەبێت: چۆن کاتێك کە من پەیڕەوی ویستی گشتی دەکەم، پەیڕەوی ویستی راستەقینەی خۆمم کردووە؟ ئایا لێرەدا شوێن ویستی تر نەکەوتوم؟ وا هەست پێدەکرێت کە ئەگەر من پەیڕەوی ئەم یاسایە بکەم، ئازادی خۆم لە دەستداوە (چونکە شوێن ویستی ترکەوتووم) بەڵام رۆسۆ دەڵێت من ئازادی خۆمم لەدەستنەداوە بەڵکو (ناچار کراوم بە ئازادی).

## ناچارکردن بە ئازادی

(ناچارکردن بە ئازادی) روویەکی تری دیکترینی ویستی گشتی رۆسۆیە. (ناچارکردن بە ئازادی) لە خودی زاراوەکەیشەوە بە دیار دەکەوێت چەمکێکی ناکۆك و (بۆ





خۆی پارادۆکسێکی تر)ـە. روونکردنەوەی تەواو بۆ لابردنی تەم و مژ لەسەر تیۆرەکەی رۆسۆ پێویستی بە باسێکی تێر و تەسەلە کە لە توانای ئەم کتێبەدا نییە، لەگەڵ ئەمەیشدا ئەم روونکردنەوە کورتەی خوارەوە تارادیەك مەبەستی رۆسۆ لەم بارییەوە روون دەکاتەوە و هاوکاریمان دەکات لە رەواندنەوەی تەم و مژەکان.

رۆسۆ وتوویەتی ئازادی بریتییە لە پەیرەوکردنی ئەو یاسایەی کە ئێمە بۆ خۆمانمان داناوە. پرسیارەکە ئەوەبوو کە چۆن ویستی گشتی بۆ نموونە یاسایەك دەخاتە روو کە من بۆ خۆمم داناوە؟ ئەگەر من دەنگی پێچەوانەم بەم یاسایە دابێت لە رواڵەتدا بە و واتایەیە کە نەمویستوە ئەو یاسایە کرداری من رێك بخات. وەڵامەکە ئەوەیە کە ئەگەر من ئازادانە بەشداریی دەنگدانم کردبێت، ئەگەر ئەو ئۆرگانانەی کە لە ویستە لاوەکییەکانەوە جیادەبنەوە بۆچۆنی خۆیان بە سەرمدا نەسەپاند بێت، ئەگەر من مافی ئەوەم هەبێت کە جارێکی تر بە جۆرێکی گونجاو ئەو پرسە بخەمە روو کە لە یاسادا رەنگی داوەتەوە و گفتوگۆی لەسەر بکرێت، لەم حاڵەتەدا من ویستوومە کە یاسا جێبەجێ بکرێت تەنانەت ئەگەر دەنگی پێچەوانەیشم هەبووبێت لە بەرامبەریدا. من خوازیاری وەها یاسایەکم، نەك تەنها لەبەر ئەوەی کە ئاسایشی من دابین دەکات، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە من ویستوومە دادپەروەری جێبەجێ بکرێت. من لەسایەی عەقڵی گشتی و دادپەروەری کۆمەڵگادا ئارامی و ئاسوودەیی زیاتر بەدەستدێنم تا وەکو لە عەقڵی تاك و دادپەروەری تاکدا. کەواتە کاتێك کە من بۆچوونی خۆم بە جیاواز دەبینم لە بۆچوونی گشتی، ئەگەری ئەوە هەیە کە من هەڵەبم. نەك لە بەرئەوەی کە کۆمەڵگا بە هێزترە لە من بەڵکو لە بەرئەوەی کە کۆمەڵگا شوێنگەیەکی یەکسان و ئازادی یاسادانانی بە من و بە هەموان بەخشیووە.

رەنگە هەندێ کات من راڕابم لەوەی کە دژی یاسایەکی تایبەتی بم بەڵام بە شێوەیەکی گشتی وەکو رێسایەك راستی لەبەرچاو دەگرم. ئەوانە یاساکانی خودی منن. رەنگە ئەو یاسایانەی کە بە راستیان دەزانم پەسندیان نەکەم بەڵام پێم وانییە



کە ئەم یاسایانە بەبێ پەیرەویکردنی خەڵك بتوانن ببنە ئەو یاسایانەی کە پێویستە پەیرەو بکرێن. بە واتایەکی تر تەنانەت کاتێك کە مرۆڤێکی دروستکاریش نیم بە باشی دەزانم کە دروستکاربم.

بەڵام ئەگەر من هاوبەش نەبم لە دانانی یاساکان و ناچاربم بە پەیرەوکردنی یاساگەلێك کە کەسانی تر دایانناوە، یاخود لە بەرامبەر نەریتێکدا خۆبەدەستەوە بدەم کە بێتوانام لە گۆڕینیدا ئەوکات رەنگە ئەم یاسایانە بە ناڕەوا بزانم، نەك ئازاد بەڵکو ناچاربم لە پەیرەوکردنییان. بە بۆچوونی رۆسۆ تاکاتێك مرۆڤ بەشداری نەکات لە دانانی یاسادا ویستێکی سەقامگیری بە دەست نەهێناوە و ناتوانێت ئازاد بێت. بەڵام کاتێك کە بەشداریکرد لە دروستکردنی یاسادا تەنانەت کاتێك کە دژی یاسایەکی دیاریکراویشە هەر ئازادە. لێرەدا ئەو (ناچار کراوە بە ئازادی).

## دەسەڵاتداریتی خەڵك

رۆسۆ لەو بیرمەندانەیە کە تیۆری دەسەڵاتداریتی خەڵکی داناوە کە ئێستا بەشێکە لە بنەماکانی سیستەمی دیموکراسی. ئەگەر وای دابنێین کە کاتێك تاك خودرێسایە (یان سەربەخۆیە) و شوێنکەوتووی خواستی کەس یان کەسانێکی تر نەبێت ئەوا چەمکی گرێبەستی کۆمەڵایەتی لە تیۆری رۆسۆدا بەم جۆرەی لێدێت کە دەبێت تاك بگۆڕێت بۆ (تاکێکی دەسەڵاتدار لە نێوان یەکسانەکان)دا و دەبێت (دەسەڵاتداریتی ویستی گشتی) لە کۆمەڵگا وابچەسپێت. دەسەڵاتداریتی ویستی گشتی بەم جۆرە دێتەدی کە هەر کەسێك بە راستی هاووڵاتی، واتە دەسەڵاتدار، یاسادانەر و مەرجعی دانانی یاسایە کە بە یەکەوە لەگەڵ دەسەڵاتدارانی تردا بە شێوەیەکی یەکسان ملکەچی دەبن. یاسا لە لایەن هەموانەوە بە شێوەیەکی یەکسان دادەنرێت و لە لایەن هەموانیشەوە بە شێوەیەکی یەکسان کاری پێدەکرێت.

لە تیۆریی گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا بەشێوەیەکی کلاسیکی باس لەدوو جۆر گرێبەست دەکرا: یەکەم گرێبەستێك کە خەڵکی لەگەڵ یەکتردا دەیبەستن و

رێکدەکەون کە یەکبگرن لەگەڵ یەکتردا و بەرەزامەندی هاوبەش پارێزگاری لە ئاسایشی خۆیان بکەن. دووەم ئەو گرێبەستەیە کە ئەو خەڵکە لەگەڵ دەسەڵاتدارێکدا دەیبەستن و حکوومەتی پێ دەسپێرن. گرێبەستی یەکەم بە گرێبەستی کۆمەڵگا وPactum Societatis و گرێبەستی دووەم بە گرێبەستی شوێنکەوتوویی Pactum Subjectionis ناودەبرێت. هۆبز لە تیۆریەکەی خۆیدا گرێبەستی یەکەم لادەبات و بەرازی بوون بەیەك گرێبەست ئەویش گرێبەستی جۆری دووەم گەیشتە حکوومەتی رەها، چونکە بەم گرێبەستە تاکەکان لە کاتی پێکهێنانی کۆمەڵگای مەدەنیدا (پەیدابوونی دەوڵەت) دەگۆڕین بۆ هاووڵاتی و ویستی ئەوان لە ویستی دەسەڵاتداردا دەتوێتەوە.

لۆك تیۆرەکەی خۆی لەسەر هەردوو گرێبەستەکە دامەزراند و گەیشتە حکوومەتی دەستووری. چونکە لە گرێبەستی یەکەمدا خەڵکی لەگەڵ یەکتردا دەکەونە پێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسی، ئەوکات بە گرێبەستی دووەم بە شێوەیەکی مەرجدار کاری حوکمڕانی بە دەسەڵاتدار دەسپێرن. رۆسۆش وەکو هۆبز یەك گرێبەستی پەسندکرد بەڵام بە پێچەوانەی هۆبز بەرەو گرێبەستی جۆری یەکەم رۆیشت. بۆیە تەواوی حوکمڕانی گواسترایەوە بۆ خەڵکی و لەیەك کاتدا خەڵکی هەم بوونە حاکم و هەم شوێنکەوتوو. بەم جۆرە ئیدی حکوومەت شتێك نییە جگە لە کۆمیسیۆنێکی جێبەجێکار. لە تیۆریەکەی رۆسۆدا حکومەت شوێنی گواستنەوەی حوکمڕانی نییە، بەڵکو بە تەواوی دەستەیەکی جێبەجێکارە. نوێنەرانی خەڵکیش بە تەواوی جگە لە چەند نێردراوێك شتێکی تر نین و لەو کاتانەی کە خەڵکی خەریکی کۆبوونەوەنین ئەوان کاروبارەکان تاوتوێ دەکەن.

رۆسۆ بەم تیۆریە شۆڕشێکی لە هزری سیاسیدا دروستکرد. بەم روانگەیە ئیدی بە پێچەوانەی ئەو تیۆریانەی کە تا ئەو کاتە باوبوون حکوومەت پایەی حوکمڕانی نییە. خەڵکی حوکمڕانی خۆیان ناگوازنەوە (چونکە لەم کاتەدا ئازادی، خودڕێسایی



و یەکسانی خۆیان لە دەست دەدەن). خەڵکی تەنها کومیسیۆنێکی جێبەجێکار (وەکو دەسەڵاتی یاسادانان و دەسەڵاتی جێبەجێکار) هەڵدەبژێرن.

## فۆرمی ئایدیالی حکوومەت

بە لە بەرچاوگرتنی ئەوەی کە مافی حوکمڕانی لەگەڵ ویستی گشتیدایە و حکوومەت تەنها نوێنەرێکی جێبەجێکارە، فۆرمی حکوومەتی گرنگییەکی نییە. حکوومەت دەتوانێت دیموکراسی یان ئەریستوکراسی یان پاشایەتی بێت. هەریەك لەم فۆرمانە کە لە هەلومەرجێکی دیاریکراودا بە گونجاو زانران دەتوانرێت وەکو فۆرمی حکوومەت هەڵبژێردرێن.

## ئازادی و موڵکداری تایبەتی

بەپێی ناوەڕۆکی تیۆریی سیاسیی رۆسۆ لەوانە دوکترینی ویستی گشتی، کۆمەڵگا دەتوانێت سەبارەت بە هەموو شتێك (لەوانە جۆری موڵکداری) بڕیاربدات. تیۆریی حوکمڕانی خەڵکی و ویستی گشتی رۆسۆ وەکو قبوولکردنی شۆڕشێکی هەمیشەییە. بەڵام کە لەم خاڵە بنەڕەتییە تێدەپەڕین، خودی رۆسۆش هاوڕایە لەگەڵ موڵکداری تایبەتیدا و دەڵێت بۆ ئەوەی دەوڵەمەندەکان بە پارە یاسا نەکڕن، هەژارانیش بۆ نان ئازادی نەفرۆشن، سنوورێك لە یەکسانی پێویستە بۆ موڵکداری تایبەتی. رەنگە موڵکداری پیرۆزبێت بەڵام بەرزتر نییە لە یاسا. کاتێك کە موڵکداری دەستدرێژی دەکاتە سەر سنووری دەسەڵاتی سیاسی و نفوزی سیاسی بەدەستدەهێنێت و رەوایی سیاسی لەکەداردەکات و زیان بە ئامانجی کۆتایی یاساو دادپەروەری دەگەیەنێت. بۆیە نابێت هیچ هاووڵاتییەك هێندە دەوڵەمەند بێت کە کەسی تر بکڕێت، یان هێندەیش هەژار کە ناچار بێت بە فرۆشتنی خۆی. ئەگەر دەسەڵاتی یاسایی و رێزداری مرۆیی وەکو شتومەك لە بازاڕدا کڕین و فرۆشتنی پێبکرێت بە تەواوی واتای خۆی لەدەستدەدات.[۳]

ڕۆسۆ هاوڕایە لەگەڵ سۆسیالیستەکاندا کە نایەکسانی خراپەیەکە و کۆمەڵگا بەرەو گەندەڵی دەبات. بەڵام لە چۆنیەتی چارەسەرکردنی ئەم خراپەیەدا هاوبۆچوون نییە لەگەڵیاندا و باس لە هەڵوەشاندنەوەی موڵکداری تایبەتی لەسەر ئامێرەکانی بەرهەمهێنان و دابەشکردن و ئاڵوگۆڕ ناکات.[٤] تەنها بەوە کۆتایی دێنێت کە بڵێت پێویستە یاسا هەلومەرجێك فەراهەمبکات کە تیایدا هەموو هاووڵاتیان ئاستێکی هاوسەنگیان هەبێت لە موڵکداری تایبەتیدا.

### ٣- ڕەخنە و هەڵسەنگاندن

#### دیموکراسی ڕاستەوخۆ و دیموکراسی ناڕاستەوخۆ

ڕۆسۆ بە لەبەرچاوگرتنی بنەما و بنەڕەتەکان و ناوەڕۆکی سەرەکی تیۆریی سیاسی خۆی و بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە سەرەوە سەبارەت بە گرێبەستی کۆمەڵایەتی و دوکترینی ویستی گشتی ئەو خستمانەروو لایەنگری لە دیموکراسی ڕاستەوخۆ دەکات. ئەوەی کە ئەم جۆرە دیموکراسییە ناگونجێت لەگەڵ ئەو وڵاتە گەورانەی کە ئێمە تیایاندا دەژین لە گرنگی تیۆریەکەی ئەو بۆ کۆمەڵگای ئێمە کەم دەکاتەوە. بەڵام هەندێك لەڕەخنەگران لەو بڕوایەدان کە هیچ ناکۆکی و جیاوازیەك نییە لە نێوان جەوهەری تیۆری ویستی گشتی ڕۆسۆ و دیموکراتی ناڕاستەوخۆ کە بۆ کۆمەڵگای ئەمڕۆ گونجاوترە. ڕەخنەگرەکان بەم جۆرەی خوارەوە بەڵگەکانی خۆیان دەخەنەڕوو:

ئەگەرێکی کەم هەیە کە ئەو مرۆڤانەی بیر لە بابەتە هاوبەشە سیاسییەکان دەکەنەوە بۆچوونێکی هاوبەشیان هەبێت سەبارەت بەوەی کە بە دادپەروەرانە دادەنرێت. هەرکەسێك کە (هەروەکو ڕۆسۆ دەڵێت) ویستی ئەخلاقی هەیە (واتە نیگەرانی دادپەروەرییە) چەند ئاستەنگێك لە بەردەم خۆیدا دەبینێتەوە (تەنانەت لە لایەن یاسای چەسپاویشەوە) جا چ بەشداربێت لە دروستکردنی یاسادا یان بەشدار نەبێت. بەڵام ئەو هاووڵاتیانەی کە دەنگ بە نەچەسپاندنی یاسایەك دەدەن





لە کاتی چەسپاندنی ئەو یاسایەدا پەسەندیدەکەن و بە ئارەزووی خۆیان جێبەجێ دەکەن، نەك لە بەرئەوەی کە ڕازی بوونە بەوەی کە ئەو یاسایە دروستە بەڵکو لەبەر ئەوەی کە پێیان وایە بڕیاردانی دانانی ئەو یاسایە بە شێوەیەکی دروست ئەنجامدراوە. ئەوان نەك لەبەر ئەوەی کە کەمینەن بۆچوونەکەی خۆیان {ڕەنگە} بە نادروست دادەنێن و پەیرەوی یاسادەکەن، بەڵکو تەنانەت لە کاتێکیشدا کە بۆچوونی خۆشیان بە دروست بزانن پەیڕەویکردنی یاسا بە کارێکی دادپەروەرانە دادەنێن. ئەوان ملکەچ دەبن چونکە بۆچوونی ئەوانیان وەرگرتووە و گفتوگۆیان لەگەڵداکراوە و گوێ لە بۆچوونیان گیراوە. و زیاد لەوەی کە ناوەڕۆکی یاساکە بە دادپەروەرانە بزانن شێوازی دانانی یاساکە بەدادپەروەرانە دەزانن.

ئەگەر ئەمە پەسەند بکەین لەم حاڵەتەدا دەتوانین بڵێین کە دیموکراسی ناڕاستەوخۆیش دەتوانێت هێندەی دیموکراسی ڕاستەوخۆ هاووێنەی دادپەروەری بێت. دیموکراسی پێویستی بەوەنییە کە هەموو بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەشداریبکەن لە یاسادانانداا، بەڵکو پێویستی بەوەیە کە لێکۆڵینەوەو تاوتوێکردنی دانانی یاساو شێوازی گفتوگۆکردنی دانانی یاسا بە دروستی ئەنجامبدرێت و هەموو بەو ئەنجامە بگەن کە هەموو قازانجەکان و بیروڕاکانیان لە کاری یاسادانانداا بە جۆرێکی گونجاو ڕەنگی داوەتەوە.

## نوێنەرایەتی و ویستی گشتی

هەروەك وتمان ڕۆسۆ حوکمڕانی دەداتە پاڵ ویستی گشتی و دەڵێت کە ناتوانێت حوکمڕانی بخرێتە شێوەی نوێنەرایەتی، چونکە حوکمرانی ویستی گشتی لەخۆ دەگرێت و ویستی گشتی ناتوانێت بچێتە سەر شێوەی نوێنەرایەتی. لێرەوە ڕۆسۆ دەگاتە، دیموکراسی ڕاستەوخۆ و دەیخاتە بەرامبەر دیموکراسی ناڕاستەوخۆ (دیموکراسی نوێنەرایەتی). بەم جۆرە ڕۆسۆ دووپاتی دەکاتەوە کە دەبێت هاووڵاتیان خۆیان یاسا دابنێن نەك ئەوەی کە چەند نوێنەرێك هەڵبژێرن تاوەکو یاسایان بۆ دابنێن.

هەندێك لە رەخنەگران سووربوونی رۆسۆ لەسەر ئەم كارە بە دوور دەزانن لە بنەمایەكی لۆژیكی. ئەوان دەڵێن ناتوانین لەو حوكمە دروستە كە پێی وایە ناتوانرێت ویست بە نوێنەرایەتی بسپێردرێت بگەینە ئەو ئەنجامە كە هیچ كەسێك ناتوانێت ئەو مافە بە كەسێكی تر بدات كە لە بری ئەو بەشداری لە چەند بڕیاردانێكی دیاریكراودا بكات. لێرەدا ئەوە ویست نییە كە دراوە بە نوێنەرایەتی، بەڵكو كەسێك بووەتە نوێنەری كەسێكی تر. بۆیە ناتوانرێت سووربوونی رۆسۆ لەسەر دیموكراسی راستەوخۆ كە بە لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی كۆمەڵگای ئەمڕۆ مەحاڵە بە كارێكی گونجاو دابنرێت.

## یاساو ویستی گشتی

هەندێك لە رەخنەگران رەخنەیان لەوە گرتووە كە رۆسۆ لە تیۆریەكەی خۆیدا لە شوێنێكدا رەوایی داوەتە ویستی گشتی و لە شوێنێكی تر بە یاسا. راستە كە یاسا لە لایەن ویستی گشتییەوە دادەنرێت، بەڵام رۆسۆ دەڵێت كە یاسا پاش چەسپاندنی دەگۆڕێت بۆ دەسەڵاتی باڵا. ئەگەر یاسا بەرهەمی ویستی بە كۆمەڵی خەڵكییە، كەواتە ئەوەی دەسەڵاتی باڵایە، كرداری سیاسیی خەڵكە نەك یاسا. ئەم رەخنەگرانە دەڵێن كە لە راستیدا رۆسۆ بەڕازی بوونی بەرامبەر بە دانانی دەسەڵاتی باڵا بۆ یاسای تیۆرەكەی خۆی بەرەو رەوایەتییەكی دوولایەنە هەنگاوی ناوە.

## چارەسەركردنی پارادۆكسی ئازادی و ملكەچی

دەستكەوتەكانی رۆسۆ بۆ هزری سیاسی گەلێك زۆرن، بەڵام یەكێك لە گرنگترینیان چارەسەركردنی ئەم كێشەیەی فەلسەفەی سیاسی بوو كە چۆن دەتوانین باسی ئازادی و خود رێسایی تاك لەگەڵ كۆتی ملكەچی دەوڵەتدا كۆبكەینەوە. تیۆریی ویستی گشتی رۆسۆ ئەم كێشەیەی چارەسەركرد. بەپێی تیۆریەكە هەموو كەسێك بە ملكەچبوونی بەرامبەر ویستی گشتی لە راستیدا ملكەچی ویستی خۆی بوو نەك



ویستی كەسێكی تر. هەروەك وتمان تیۆریی گرێبەستی كۆمەڵایەتی (بەرلە رۆسۆ) و تیۆریی سوودگەرایی هیۆم و بێنتهام ئەم كێشەیەیان تیادا هەیە، چونكە لەو تیۆریانەدا ئازادی و سیستمی كۆمەڵایەتی رووبەڕووی یەكتردەبنەوە.

رۆسۆ بەم تیۆریە كێشەی تیۆری دیموكراسی جۆن لۆكی سەبارەت بە ملكەچبوونی كەمینە بۆ زۆرینە چارەسەركرد. لە تیۆریەكەی لۆكدا كاتێك كە كەمینە ملكەچی زۆرینە دەبن لە راستیدا ئازادی و خود رێسایی خۆیان لە دەست دەدەن. وەها تێڕوانینێك ئەم كۆكییەی تیادایە كە تاك بە پەیوەستبوونی بە كۆمەڵگاوە ئازادی خۆی لە دەستدەدات. لە تیۆریی لۆكدا ناتوانرێت وەڵامی دروست بۆ ئەم كێشەیە بدۆزرێتەوە.

### پەراوێزەكان:


1- Lucio Collette, Form Rousseau to Lenin, Engl. Trans. John Merrington and Judith white, Norfold, low and Brydone, p. 174.

2- C.L wayper, Political thought, English University Press LTd. 1943, p. 133-134.

3- F.M. Barnard, will and political Rationality. In Roussen in jack lively and Andrew Reeve, Mondem Political theory From Hobbes to Marx, London, Routledge, 1968, p.131.

4- John Palmenatz, Man and Socity, Vol 2, London, NewYork, Longman, 1992, p.426.






## پاژی -٧-

## ئیمانۆیل كانت:

## Immanuel Kant

### پرەنسیپی گشتی خۆ- یاسادانەری وەكو بناغەی ئۆرگانە رامیارییەكان

#### كورتەیەك لە ژیانی كانت

ئیمانۆیل كانت (١٧٢٤-١٨٠٤) لە شارێكی شانشینی پرۆس لە دایكبووە. لە بنەڕەتدا خێزانەكەی لە كۆچەرەكانی سكۆتلەندا بوون كە چەند نەوەیەك پێشتر چووبوونە پرۆس. كانت خوێندنی خۆی لە نێوان ساڵەكانی ١٧٣٤و ١٧٤٠ لە كۆلێژێك كە فردریكی پاشای پرۆس دایمەزراند بوو تەواوكرد. ئەوكات لە زانكۆی كۆنیگزبرگ خوێندن و خوێندنەوەی خۆی لە بواری فیزیك و ماتماتیك و فەلسەفە و وتاربێژی درێژە پێدا و پاش وەرگرتنی بڕوانامەی دكتۆرا (ساڵی ١٧٥٥) لە كۆنیگزبرگ لەهەمان زانكۆ خەریكی وانە وتنەوە بوو. كانت هەموو تەمەنی خۆی لە شاری كۆنیگزبرگ واتە شوێنی لە دایكبوونی خۆی بردە سەر و ژیانی رووداوێكی تایبەتی بە خۆیەوە نەدی. هەروەها تەمەنی خۆی بۆ نووسین و خوێندنەوە تەرخانكرد.

كتێبەكانی رەخنەگری عەقڵی پەتی (١٧٨١) و رەخنەگری عەقڵی زانستی (١٧٨٨) و رەخنەگری توانای دادوەری (١٨٧٥) و متیافیزیكی ئەخلاق و ئاشتی سەقامگیر (١٧٩٥) بە نووسینە سەرەكییەكانی كانت لە قەڵەم دەدرێن.



### نەخشەی گشتی تیۆریی سیاسیی كانت

بە شێوەیەكی گشتی كانت وەكو تیۆرزانێكی سیاسی تەماشاناكرێت. ئەو زیاتر سەرگەرمی فەلسەفەی زانست و فەلسەفەی ئەخلاق و فەلسەفەی ماف بوو، بەڵام لێكۆڵینەوەی قووڵی دەربارەی ناوەڕۆكی ئەركی ئەخلاقی ماف و ئازادی ئەویان خستووەتە ریزی بیرمەندانی گەورەی سیاسی و تیۆریەكانیشی لە ریزی تیۆریە گرنگە سیاسییەكان دانراوە. كانت تیۆریی خۆی لە ژێركاریگەری رۆسۆدا داناوە. "ویستی گشتی" رۆسۆی لە روخسارێكی تازەدا بە كاربردووە و فراوانی كردووە و دوكترینێكی نۆیی لێدروستكردووە بە ناوی "خۆ-یاسادانەری" كە بناغەی تێگەیشتنی ئەوە لە ئەخلاق و ماف و سیاسەت. لە تیۆرەكەی كانتیشدا وەكو تیۆریەكەی رۆسۆ ویستی گشتی بنەما و سەرچاوەی یاسادانانی سیاسیە. خەڵكی لەسەر بنەمای یەكسانی لە ئازادیدا رێسا یاساییەكان دروستدەكەن. یاسادانان لە كۆمەڵگای سیاسیدا هەمان مافی گشتی ئازادی ئەبستراكتە كە لە كۆمەڵگادا فۆرمی پاشكۆیی وەردەگرێ.

فەلسەفەی سیاسیی كانت لەگەڵ میتافیزیك و زانستی ئەخلاقی ئەودا پەیوەندییەكی ئۆرگانیكی هەیە. خاڵی دەستپێكی كانت لە ئەخلاقدا رازی نەبوونیەتی بەرامبەر بە تیۆریی چێژگەرایی هیوم و بەرژەوەندیخوازی. هیوم بناغەی دادپەروەری لەسەر بنەمای بەرژەوەندی گشتی و پاڵنەری گەڕان بە دوای چێژ و دووركەوتنەوە لە ئازار دانابوو. كانت لەبری بەرژەوندی و سوودمەندی، عەقڵی كردە بناغەی ئەخلاق و سیاسەت. لە فەلسەفەی ئەخلاق و مافی كانتدا تاكی خود-رێسا (یاخود-بنیات) بە خاڵی دەستپێك دادەنرێ تاكی خورێسا بە پێی "فەرمانی رەها" كاردەكات. "فەرمانی رەها" بەخستنە رووی یاسای گشتی لەسەر ویست بە دەستدێت. شێوازی كاری فەرمانی رەها بەم جۆرەیە:((وەهابە كە بخوازی رێسای ویستی تۆ ببێتە یاسای گشتی)). كانت كۆمەڵگای سیاسی و دەوڵەت لەسەر ئەم بنەمایە لە "عەقڵی پەتی"ەوە بە دەستدێنێت.





"عەقڵی پەتی" وا دەخوازێت کە خەڵك وەکو ئەفرێنراوانی خاوەن عەقڵ شوێنکەوتووی سیستەمی یاساکان بن. مرۆڤەکان وەکو بکەرانی عاقڵ و خود ڕێسا بە یەکگرتن و بە هۆی یاسا هاوبەشەکانەوە "سەر زەمینی ئامانجەکان" دروستدەکەن کە کۆمەڵگای مەدەنی ڕەهەندی یاسای ئەو سەرزەمینەیە. یاسا هاوبەشەکانی کۆمەڵگا بەرهەمی خۆیاسادانەری هەموو ئەندامەکانە. بیری دەوڵەتیش "بیرێکی پێشینە"یە. دەوڵەتی دەرەکیش (دەوڵەتی ڕاستەقینە) ڕەنگدانەوەی ئەم دەوڵەتە دەرکییەیە. دەوڵەت و سیستەمی سیاسی لە پلەی یەکەمدا بارێکی ڕێسایی هەیە. واتە لەسەر بنەمای ڕێسا و شێوازە گشتییەکان دامەزراوە. کەواتە بە پێچەوانەی ئەو تیۆریانەیە کە لەسەر بنەمای چێژگەرایین (وەکو گرێبەستی کۆمەڵایەتی هۆبز و لۆك و بەرژەوەندیخوازی هیوم و بێنتهام) و لایەنی ئامرازی نییە (بەڵکو لەسەر بنەمای ڕێساو شێوازە گشتییەکانە). ویستی گشتی سەرچاوەی یاسادانانی سیاسیە و کانت دەڵێت بە پێچەوانەی بۆچوونی ڕۆسۆ دەکرێت ویستی گشتی بسپێردرێت بە نوێنەرەکان (ئەنجوومەنی نوێنەران). نوێنەرایەتی ویستی گشتی لەسەر بنەمای ویستی یەکگرتووی هەموو خەڵك کاری یاسادانان ئەنجامدەدات بۆ کۆمەڵگای سیاسی.

ئومێدەوارین ئەم خستنەڕووە گشتییەی تیۆریی سیاسیی کانت کە بەم دەربڕینە چڕە تەمومژێکی زۆر لە خۆدەگرێت بۆ خوێنەر لە بەشەکانی خوارەوەدا ڕوونتربیێتەوە.

## ١- فەلسەفەی ئەخلاق و تیۆری سیاسی

### وەبیرهێنانەوە

ئەو بیرمەندانەی کە تا ئێرە لەم بەرگەدا دەربارەیان دواوین بناغەی تیۆریی سیاسی خۆیان لەسەر دەروونناسی تاك بونیادناوە وەك هۆبز و هیوم و بێنتهام و میل یان لەسەر بنەمای سیاسی و شیکاری سیاسی وەك ڕۆسۆ. کانت لەو بیرمەندانەیە کە



تیۆرە سیاسیەکەی لەسەر فەلسەفە یان بە واتایەکی تر لەسەر میتافیزیك دامەزراوە. فەلسەفە یان میتافیزیکی کانتیش فەلسەفەی مەعریفە (یان فەلسەفەی زانست) و فەلسەفەی ئەخلاق و فەلسەفەی یاسا لەخۆدەگرێت. تیۆریی سیاسیی کانت لە لایەکەوە پەیوەندییەکی ئۆرگانی لەگەڵ فەلسەفەی زانست و لە بنەڕەتدا لەگەڵ فەلسەفەی ئەخلاق و فەلسەفەی یاسادا هەیە. بۆیە بۆ لێکۆڵینەوە لە بنەماکانی تیۆریی سیاسیی کانت پێویستە لە فەلسەفەی ئەخلاقی ناوبراوەوە دەستپێبکەین و تا ئەو جێیەی کە دەکرێ لەگەڵ تیۆرییە ئەخلاقییەکەیدا ئاشنابین.

### سەرچاوەی ئەخلاق

کانت زەینی مرۆڤ بە خاوەنی سێ هێز دەزانێت:

١- هەست (هەستەکان).

٢- تێگەیشتن.

٣- عەقڵ.

هەست مامەڵە لەگەڵ کات و شوێن و ئەو پێشهاتانەدا دەکات کە پەیوەستن بە کات و شوێنەوە، تێگەیشتنیش لەگەڵ قاڵب و بابەتەکان و عەقڵیش لەگەڵ فۆرمە مەعقووڵەکان یان هزرە پەتییەکان. ئەو عەقڵەی کە کانت بە عەقڵی پەتی ناوی دەبات دابەش دەبێت بۆ دوو، عەقڵی پەتی تیۆری و عەقڵی پەتی کردەیی. عەقڵی پەتی تیۆری، مامەڵە لەگەڵ زانست و عەقڵی پەتی کردەیی مامەڵە لەگەڵ ئەخلاقدا دەکات. دنیای سیاسی پەیوەندی لەگەڵ ئەم حەوزەیە (عەقڵی کردەیی) هەیە. عەقڵی کردەیی بریتییە لەو لایەنەی عەقڵ کە ویستی مرۆڤ هان دەدات بەرەو کاری چاکە. ئەم عەقڵە ڕێسا گشتییەکان دروستدەکات، ڕێساگەلێك کە تەنها گشتی و ڕواڵەتین، چونکە گشتی و ڕواڵەتین بۆیە پێویستن. کانت ئەم ڕێسا گشتییانە بە پێشوەخت یان پێش ئەزموونی لەقەڵەمدەدات. بە واتایەکی تر ئەمانە

ڕێساگەلێکن کە لەناو خودی عەقڵدا هەن و لە ئەزموونی مرۆڤ و کردەی مرۆڤ لە دنیای هەستی و دەرەکیدا بە دەستنایەن.

کانت دەڵێت ئێمە ناتوانین زانست یان مەعریفەمان هەبێت مەگەر ئەوەی کە بە شێوەی پێشوەخت پەیوەندی هۆکاریمان لەناو زەیندا هەبێت. ئێمە بە شێوەی پێشوەخت پەیوەندی هۆکاریمان لەناو زەیندا هەیە و لەکاتی ئەزموونی هەستی و دەرەکیدا زانیاری بەدەستهاتوو دەخەینە ناو ئەم قاڵبە پێشتر ئامادەکراوەی زەین. سەبارەت بە ئەخلاقیش بەهەمان جۆرە. ئێمە ناتوانین فەرمانگەلێکی ئەخلاقیمان هەبێت مەگەر ئەوەی کە سەرەتا ڕێساگەلێکی گشتیمان هەبێت. ئێمە تەنها لەسەر بنەمای چەمکی ڕێسای گشتی دەتوانین کاری ئەخلاقیمان هەبێت.

بەم جۆرە کانت لە زانستی ئەخلاقدا لە ڕیزی عەقلانییەکانە. عەقلانییەکان لە عەقڵدا بە دوای بناغەی مەعریفەی ئەخلاقیدا دەگەڕێن. لە بەرامبەر ئەواندا ئەزمونگەراکان هەن کە لەناو هەست و ئەزمووندا بە دوای بناغەی ئەخلاقدا دەگەڕێن.

## جێبەجێکردنی ئەرك بناغەی ڕێسای گشتی ئەخلاق

کانت بەچەمکی "ویستی چاك" دەست بە بناغەی میتافیزیکی (فەلسەفە) ئەخلاق دەکات. ویستی چاك ویستێکە کە بەبێ هەموو کۆت و مەرجێك چاکە. هیچ شتێکی تر جگە لە ویستی چاك بەبێ کۆت و مەرج چاك نییە. هەموو ویستێکی تر ئاراستەی بەرەو ئامانجێکی ترە، ئامانجێك بە دەر لە ویست. کاتێك کە خەریکی خوێندنەوەیت، یان کار دەکەیت و یاخود شت دەکڕیت و تەنانەت کاتێکیش کە دەتەوێت چاك بیت تاوەکو خەڵکی ڕێزت لێبگرن یان ناوی چاك لە دوای خۆت بە جێبێڵی، ویستی تۆ پەیوەستە بە شتێکی ترەوە، ئەو شتەی کە ویستی تۆ پێوەی پەیوەستە چۆنیەتی کاری تۆ دیاریدەکات. ئەگەر فرۆشیارێك دورستکاربێت بۆ ئەوەی کڕیار بەرەو لای خۆی رابکێشێت دیسانەوە دروستکارییەکەی ئەو، واتە



ئەو شتەی کە ویستی ئەوی پێوە بەندە لە ناخی خۆیدا ویستی چاك نییە. ویستی چاك ویستێکە تەنها بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە بەپێی ڕێسایەکی گشتی و جیهانی.

ویستی چاك تەنیا کارکردنە بۆ جێبەجێکردنی ئەرك. ئەم جێبەجێکردنی ئەرکە لە پێناو هیچ ئارەزوویەکی دەروونیدا نییە. بەڵام بابزانین جێبەجێکردنی ئەرك چ واتایەك دەگەیەنێت. جێبەجێکردنی ئەرك واتە کارکردن بەپێی ڕێسای گشتی یان یاسای گشتی تەنها لەبەر خودی ئەم ڕێسایە. یاسا ئەخلاقییەکانیش وەکو یاسا سروشتییەکان گشتین. کاتێك کە دەڵێین ئاو لەسەد پلەدا دەبێتە هەڵم ڕێسا یان یاسایەکی گشتیمان خستووەتە روو کە هەموو کات راستە و هیچ ریز پەڕێك لە خۆ ناگرێت.

پرسیارەکە ئەوەیە کە ئێمە چۆن دەتوانین سەبارەت بە یاسا یان ڕێسای ئەخلاقی بنەما گشتییەکان بە دەستبێنین؟ بە واتایەکی تر پێویستە چۆن کار بکەین بۆ ئەوەی ویستی ئێمە ببێتە ویستێکی چاك واتە بەبێ هەموو مەبەستێکی دەرەکی چاك بێت؟ کانت دەڵێت بۆ ئەوەی کە بزانین ویستی ئێمە چاکە دەبێت لە خۆمان بپرسین ئایا دەتوانین بخوازین ئەو ڕێسایەی کە بەو پێیە کاردەکەین بگۆڕێت بۆ یاسایەکی گشتی. وای دابنەێین کە ئێمە دەمانەوێت درۆبکەین یان دەستدرێژی بکەینە سەر ماڵی کەسێك یاخود دەستدرێژی بکەینە سەر ئابڕووی کەسێك، ئایا دەتوانین بخوازین کە ئەم ڕێسایە بگۆڕێت بۆ ڕێسایەکی گشتی. واتە هەمووان بەم جۆرە کاربکەن؟ ئەگەر درۆکردن و دزیکردن و دەستدرێژیکردنە سەر ئابڕووی خەڵکی بگۆڕێت بۆ ڕێسایەکی گشتی ئەو کاتە چی ڕوودەدات. کە واتە ئەگەر ئێمە ناتوانین کە بخوازین ئەم ویستانە بکرێنە شتێکی گشتی، ئەوا دەبێت وازیان لێ بێنین و دووریان نخەینەوە.

شیاوی وەیادهێنانەوەیە کە کانت ناڵێت لە دنیای دەرەوەدا کاری نابەجێ و ویستی خراپ بوونی نییە. بەڵکو دەیەوێت بڵێت کە بۆ ئەخلاقیش پێویستە یاسایەکی گشتی هەبێت (هەروەك چۆن سەبارەت بە مەعریفەی سروشتیش هەیە). بەم جۆرە





دەیەوێت ئەم بۆچوونە بخاتە روو کە دەبێت ئەم یاسایە بە گشتی بکرێت. و لەو بڕوایەدایە کە ئەم یاسایە پێشینە یاخود بەر لە ئەزموونیە(apriori).

## فەرمانی رەها وەك پێوەری حوکمی ئەخلاقی

بەم جۆرە کانت دەگاتە بنەڕەتی بابەتیی ئەخلاق. ئەم بنەڕەتە بابەتییە تا ئەو جێیەی کە بۆ ویست پێویست و پابەندراوە بە حوکم ناودەبرێت و شێوازبەندی ئەم حوکمەیش پێی دەوترێت "فەرمان". فەرمانی پەتی یان فەرمانی رەها واتە فەرمانێك کە هیچ بەرامبەرێکی دەرەکی نییە، بەگشتی بریتییە لە ملکەچبوون بۆ یاسا. تەنها یەك فەرمانی رەها هەیە و ئەویش ئەوەیە کە تەنها بەپێی رێسایەك کاربکە کە بتوانێ لەهەمانکاتدا بخوازێ ئەو رێسایە بگۆڕێت بۆ یاسایەکی گشتی. بۆ نموونە ئەگەر بخوازێ کە بەپێی رێسایی "نابێت دزی بکەیت" کاربکەیت دەتوانیت کە بتەوێت رێسای کرداری تۆ لەم بارەیەوە بگۆڕێت بۆ یاسایەکی گشتی. بەم جۆرە "فەرمانی رەها" یان فەرمانی پەتی دەتوانێت ببێتە بنەمای بڕیاردان سەبارەت بە کرداری دەرەکی یان پاشکۆیی (راستەقینە) ئێمە.

## مرۆڤ وەکو خودمەبەست

"فەرمانی رەها" پێمان دەڵێت کە دەبێ تەنها بە پێی ئەم چەمك و تێگەیشتنە بجووڵێینەوە کە یاسایەکی گشتی هەیە. گشتی ترین چەمکی ئەم حوکمە ئەوەیە کە ئێمە دەبێت وەکو خود مەبەست لەگەڵ خەڵکدا مامەڵە بکەین نەك تەنها وەك ئامرازێك. کاتێك کە من دەچمە سەرتاشخانە وەکو قژم رێك دەکەم لەم رووەوە وەکو ئامرازێك سوودم لە سەرتاشەکە وەرگرتووە بۆ مەبەستی خۆم. بەڵام دەبێ وەك بوونەوەرێکی عاقڵ، بوونەوەرێك هەروەك خۆم و ئەوانیتر سەیری بکەم نەك تەنها وەك ئامرازێکی پەتی.



کانت بە سوودوەرگرتن لەم بنەمایە لە نامەی ئاشتی بەردەوامدا دەڵێت پاشایەك کە بۆ ناوبانگی خۆی یاخود بۆ گەورەیی و شکۆمەندی وڵاتەکەی دەستدەداتە شەڕێکی هێرش-بەرانە، مرۆڤگەلێکی تر یان بوونەوەرانێکی خاوەن عەقڵی تری وەکو ئامرازێك بۆ ئامانجی خۆی بە کارهێناوە. واتە ئەم مرۆڤ و بوونەوەرانە کە خاوەن عەقڵن لەبەرچاونەگرێت (حسێبیان بۆ ناکات) کە لە ناخی خۆیاندا مەبەستن. هەر بەم بۆنەیەوە کانت لە نامەی ئاشتی بەردەوامدا داوای هەڵوەشاندنەوەی سوپا رێکوپێکەکان دەکات چونکە ئەمانە بۆ مەبەستی کوشتن و کوژران (ئەوان تەنانەت کاتێك کە دەشکوژرێن جەستەی خۆیان کردوەتە ئامراز) لەلایەن دەوڵەتەوە بەکاردەبرێن.

دەتوانرێت هەمان شتیش سەبارەت بە دەسەڵاتدارانی ستەمکار بوترێت. کاتێك ئەوان ئازادی خەڵکی دەبەزێنن بوونەوەرانێکی خاوەن عەقڵی تریان وەکو ئامراز لەبەر چاوگرتووە نەك وەك خود مەبەست.

## خودڕێسایی ویست

رێزگرتن لە هەموو بوونەوەرە خاوەن عەقڵەکان و هەموو ویستە عاقڵەکان وەکو خود مەبەست بەو ئەنجامە دەگات کە بڵێین ویستی هەر بوونەوەرێکی عاقڵ یاسای گشتی دروستدەکات. کاتێك ویست خودڕێسایە (یان بەواتایەکی تر خود بوونیادە) کە تەنها پەیڕەوی لە فەرمانی رەها یان بە وتەی کانت فەرمانی ((بێ مەرج)) بکات. هەروەکو وتمان ئەمە واتە کارکردن بەپێی رێسا گشتییەکان نەك بەپێی خواستە دەروونی و بەرژەوەندییە کەسییەکان. کاتێك ویستی ئێمە خود رێسایەکە بەپێی "فەرمانی رەها" کار بکات. لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێش کە ئایا بەردەوام ویستی ئێمە بەپێی فەرمانی رەها کاردەکات؟ وەڵامەکە نەخێرە. زۆر کات ئێمە بەپێی فەرمانی رەها یان رێسای گشتی یاخود جێبەجێکردنی





ئەرك كارناكەین. ئایا ئازادی پێویستی بەوەیە کە ئێمە بەپێی خواست و ئارەزووی خۆمان کاربکەین؟

وەڵامی کانت ئەوەیە کە لە کاتی ئەنجامدانی کارێك (ئەگەر بەپێی ڕێسای گشتی و فەرمانی ڕەها و جێبەجێکردنی ئەرك نەبێت) بەناخود ڕێسایی (بەرامبەر بەخود ڕێسایی) فیڵمان لە ئارەزووی خۆمان کردووە و لە ئەنجامدا ئازادنین. ئازادی بەو چەمکەی کە کانت لە تیۆریەکەی خۆیدا فۆرمبەندی دەکات واتە خود ڕێسایی. خودڕێساییش پێویستی بە دورکەوتنەوەیە لە هەموو حەزێکی دەروونی، واتە لە هەرکارێك کە ئێمە بە هۆیەوە تەنها وەکو ئامرازێك تەماشای خەڵکی ترمان کردبێت نەك وەکو مەبەستی تەواو. ئێمە بە ڕێژە و ئاستی ئەو کارانەی کە بەپێی حەزی دەروونی یان بەپێی خواستی دڵمان ئەنجامی دەدەین ئازادنین، بەڵکو بەڕێژە و ئاستی ئەو کارانەی کە بەپێی خودڕێسایی ویست (پەیڕەوکردنی ڕێسا گشتییەکان و جێبەجێکردنی ئەرك- فەرمانی ڕەها) ئەنجامی دەدەین ئازادین.

## ٢- ویستی ئەخلاقی و کۆمەڵگای سیاسی

### تێپەڕین لە ڕەوشی سروشتییەوە بۆ ڕەوشی مەدەنی

ئێمە لە تیۆریەکەی هۆبز و لۆکدا ئاماژەمان بە چەمکی ڕەوشی سروشتی و ڕەوشی مەدەنی و گرێبەستی کۆمەڵایەتی کرد وەکو چەمك و دوکترینە بنەڕەتییەکانی تیۆریی سیاسی و جۆری شیکردنەوەیان لە تیۆریزەکردندا. خراپ نییە لێرەشدا لە درێژەی باسەکەی سەرەوە سەبارەت بە بەشە سەرەکییەکانی تیۆریی سیاسی کانت جارێکی تر لە هەمان خاڵی دەستپێکەوە (واتە خاڵی دەسپێکی هاوەڵانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی) بکەوینە شیکردنەوەی تیۆرەکەی کانت. کانتیش سەر بەنەریتی تێڕوانینی گرێبەستی کۆمەڵایەتییە. ئەویش بەپێی ئەو نەریتەی کە هۆبز دایمەزراند لە ڕوانگەی ڕەوشی سروشتی و ڕەوشی مەدەنییەوە دەستپێدەکات. بەڵام



وێنەکەی ئەو بۆ ڕەوشی سروشتی و پاش ئەویش ڕەوشی مەدەنی کەمێك جیاوازە لە وێنەکەی هۆبز. هۆبز دەڵێت ڕەوشی سروشتی ڕەوشێکە کە مرۆڤ بە هۆی نەبوونی دەسەڵاتێکی گشتی یان حکوومەت بە ترسێکی بەردەوامەوە لە یەکتر ژیان بەسەر دەبەن. بەڵام کانت بەپێی بنەما فەلسەفییەکانی خۆی کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد دەڵێت کە ڕەوشی سروشتی ڕەوشێکی "داماڵراوە لە دادپەروەری" لەسەر بنەمای ویستێکی هاوبەش یان ویستێکی گشتی.

کانت دەڵێت تەنانەت لە ڕەوشی سروشتیدا تاك خاوەن داوایەکی یاساییە. کەواتە ململانێ لە ڕەوشی سروشتیدا هەروەك هۆبز دەڵێت ململانێ نییە بۆ مانەوە بەڵکو "ململانێیە بۆ ماف"[١]. لەم بارەیەوە ماف بە جۆرێك کە جێ پەسەندی هەمووان بێت بوونی نییە، بەڵام مافی تایبەتی هەیە و ئەویش بریتییە لەوەی کە کاتێك کەسێك مافی موڵکداری سامانی تایبەتی بەخۆی دەدات لە ڕاستییدا بەو واتایەیە کە مافی خەڵکانی تریشی پێ پەسندە بۆ موڵکداری و کۆکردنەوەی سامان. پێویستە ئەو دەست لە داواکەی خۆی هەڵبگرێت یان بە پەسندکردنی مافی موڵکداری بۆ خۆی لە هەمانکاتدا خۆی پابەند کردووە بە پەسەندکردنی هەمان ماف بۆ خەڵکانی دیکەش.

کەواتە لە ڕەوشی سروشتیدا ماف وەکو ڕێسا بوونی هەیە. بەڵام ئەم مافە لە سنووری گشتیدا بە فەرمی دانی پیانەنراوە. بۆیە لەم ڕەوشەدا (ڕەوشی سروشتی) بێ متمانەیی و زەبر و توندوتیژیش بە دیاردەکەون. هەنگاونان بەرەو ڕەوشی مەدەنی و دامەزراندنی ڕەوشی مەدەنی بۆ بە فەرمی ئەو مافانەیە کە لە ڕەوشی سروشتیدا پشتیوانی پەسندکردنی گشتییان بە دەستنەهێناوە و بەرگری لێکردنیشیان لە ڕێگەی هێزی هاوبەشی گشتییەوەیە. لە ڕەوشی سروشتییدا خاوەندارێتی لایەنێکی کاتیی هەیە، بەڵام هەر ئەم خاوەندارێتییە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا فۆرمێکی یەکلاکەرەوە لە خۆدەگرێ و دەگۆڕێت بۆ موڵکداری.





## مولّكداری تایبەتی و كۆمەڵگای مەدەنی

كانت لەو باوەڕەدایە كە مولّكداری تایبەتی خاڵی سەرەكیی مامەڵە كردنمانە لەگەڵ ئەوانیتر (یان هەروەكو كانت دەڵێت لەگەڵ زاتە ئەخلاقییەكانی تر).[٢] پێویستە تاك لە بە دواداچوونی مەبەستە تایبەتییەكانی خۆیەوە بگاتە شتە دەرەكییەكان. خەڵكانی تریش بەهەمان شێوە. كەواتە مرۆڤەكان لەم هەوڵدانەدا رووبەڕووی یەكتردەبنەوە. دەبێت ئەم رووبەڕووبوونەوەیە (مامەڵەیە) بە جۆرێك یەكلابێتەوە كە رێزی خودڕێسایی زاتە ئەخلاقییە (مرۆڤەكان) جیاوازەكان بە پارێزراوی بمێنێتەوە. كانت دەڵێت وەها مەبەستێك تەنها بە دامەزراندنی كۆمەڵگای مەدەنی دێتەدی. لە كاتێكدا شتێك بە مۆڵكی كەسێك دادەنرێت كە بەكارهێنانی ئەو شتە لە لایەن كەسانی ترەوە بەبێ مۆڵەتی ئەو كەسە بەسوكایەتی كردنێك دابنرێت بەرامبەر بە كەسێتی ئەو كەسە.[٣] ئەمە لەكاتێكدا دێتەدی كە نەك تەنها كەسەكە شتێكی لە بەردەستدا بێت بەڵكو دەبێت یاسایەك و سەرچاوەیەك یان دەسەڵاتێكی گشتی هەبێت كە مافی ئەو كەسە (و خەڵكانی تر) بە فەرمی بناسێت. بە كارهێنانی شتێك لە لایەن منەوە پێویستی بەوەیە كە هەموو خەڵكی دەست هەڵبگرن لە بانگەشەی بەكارهێنانی ئەو شتە. ئەمەیش لە كۆمەڵگای مەدەنیدا دێتەدی. كەواتە دەبێت ویستی تایبەتی خۆم یەكبخەم لەگەڵ ویستی هەموو تاكەكانی تردا. بەم جۆرە من مافی مولّكداری ئەوان و ئەوانیش مافی مولّكداری من بە فەرمی دەناسن.

وەها تێڕوانینێك پەیوەستە بە بۆچوونی كانت و دوكترینی خۆ یاسادانانی ئەوەوە كە پێشتر ئاماژەمان پێكرد. كاتێك كە تۆ دەڵێیت شتێك هی تۆیە لە لایەكەوە خەڵكت ناچار كردووە بەرێزگرتنی مولّكداری خۆت و لە لایەكی ترەوە خۆیشت پابەندكردووە بە رێزگرتنی مولّكداری ئەوان. لە راستیدا تۆ بەم كارە یاسات داناوە بۆ هەموو زاتە ئەخلاقییەكان (یاسادانانی گشتی). بەڵام یاسادانانی یەك كەس لەم بارەیەوە ناتوانێت گشتی بێت، چونكە پێچەوانەی خودڕێسایی خەڵكی ترە. كەواتە





دەبێت چی بكرێت تاوەكو مولّكداری دەرەكی پێچەوانەی خودڕێسایی خەڵكی تر نەبێت؟ تەنها بەیەك شێواز ئەم كارە دەگونجێت و ئەویش ئەوەیە كە من بەشداری بكەم لە ویستی گشتی بە كۆمەڵ كە هەموو زاتە ئەخلاقییەكان لە خۆدەگرێت. كاتێك كە هەموو زاتە ئەخلاقییەكان بەشداری دەكەن لە ویستی گشتی (ویستی هاوبەش) لەم حاڵەتەدا هەموو پەیڕەوی لەو یاسایانە دەكەن كە خۆیان دایانناوە.

لەم خاڵەدا كانت و رۆسۆ یەكدەگرنەوە: لەوەی كە لە كاتی پێكهێنانی ویستی گشتی و شوێنكەوتنی ویستی گشتی (لە راستیدا) هەر كەسە و شوێن ویستی خۆی كەوتووە و شوێنكەوتووی كەسی تر نییە. وەها تیۆرێك ئاستەنگی فەلسەفیی تیۆریی گرێبەستی كۆمەڵایەتی هۆبز و لۆك و بەرژەوەندیگەرایی هیوم و بێنتهامی لە بەردەمدا نییە. (لە دەستەی دواتر لە تیۆرییە سیاسیەكان كاتێك كە تاك پەیرەوی لە دەسەڵاتی دەرەكی دەكات، پەیڕەوی لە خۆی ناكات).

بەڵام كانت بە شێوەیەكی جیاواز لە رۆسۆ گەیشتووەتە دوكترینی ویستی گشتی. هەر وەك بینیمان كانت لە بنەڕەتی خۆیاسادانەری تاكەوە گەیشتووەتە چەمكی ویستی گشتی. چەمكی ویستی گشتی و گرێبەستی كۆمەڵایەتی لای كانت چەمكێكی پێشینە یان پێش ئەزمونییە، بەڵام لە تیۆریەكەی رۆسۆدا كارێكی ئەزموونی یان پاشینەیە.

## كانت و هزری حكوومەتی نوێنەرایەتی

هەروەك بینیمان لە تیۆریەكەی كانتیشدا وەكو تیۆریەكەی رۆسۆ ویستی گشتی سەرچاوەی یاسادانانی سیاسییە. خەڵكی لەسەر بنەمای خودڕێسایی و مافی یەكسانی ئازادی رێسا یاساییەكان بونیاد دەنێن.[٤] لێرەدا مافی گشتی خۆ-یاسادانەری (كە مافێكی پەتییە) لە كۆمەڵگایەكی سیاسی دیاریكراودا فۆرمێكی پەیوەستەیی (رەنگدانەوەیەكی ئۆبژكتیڤ-و دەرەكی) وەردەگرێ. بەڵام كانت بە پێچەوانەی رۆسۆ لەو باوەڕەدانییە كە ویست ناتوانرێت بەشێوازی

نوێنەرایەتی دابنرێت و دەبێت کاری یاسادانان بە شێوەیەکی راستەوخۆ بێت. رێك بە پێچەوانەی رۆسۆ، لەو بڕوایەدایە کە ناتوانین چاوەڕانی ئەوەبین کە کاری یاسادانان بە شێوەیەکی راستەوخۆ لە لایەن خودی خەڵکییەوە ئەنجامبدرێت. نوێنەرایەتی ویستی گشتی دەتوانێت لەسەر بنەمای ویستی یەکگرتووی هەموو خەڵك کاری یاسادانان بۆ کۆمەڵگای سیاسی ئەنجامبدات.

## دەوڵەت مەرجی کامڵبوونی ئەخلاقی

تیۆریەکەی کانت دەربارەی دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنی (یان بە واتایەکی باوتر دەوڵەت بە واتا گشتییەکەی) لە هەمانکاتدا لەگەڵ دیدگای مەبەستناسانەی ئەو لە پەیوەندیدایە. کانتیش وەکو ئەرەستۆ و رۆسۆ و بیرمەندانی دیکەی مەبەستگەرا بڕوای وایە کە بە لەبەرچاوگرتنی مەبەست و رەوتی مەبەستداری شتێك دەتوانین باشتر ئەو شتە بناسین. مەبەستی ناوەکی سروشت کەلتوری مرۆڤە. بە واتایەکی تر مەبەستی سروشت سیستەمی ئەخلاقی و عەقڵانی کۆمەڵگایە و مەبەستی سروشت لە کۆمەڵگای سیاسی و دەوڵەتدا دێتەدی. تاکاتێك کە خەڵك لە رەوشی سروشتیدا دەژین مەبەستی سروشت نایەتەدی، چونکە تاکێك کە خەڵك لەم رەوشەدان ئەخلاق کاریگەری نییە. تەنها بە دامەزراندنی دەوڵەتە (کۆمەڵگای مەدەنی) کە بە ئەنجام گەیاندنی ئەرکی تاکەکان لە بەرامبەر یەکتردا دەکەوێتە شێوازێکی سیستەماتیك.

بە یادی دێنینەوە کە کانت دەوڵەت لە مافی ئازادی دەرەکییەوە (بەهرەمەند بوونی کردەیی لە مافی ئازادی و خود-رێسایی ناوەکی) هەڵدەهێنجێنێ. مافی ئازادی دەرەکی وادەخوازێت کە خەڵك ویستەکانیان لەگەڵ یەکتردا یەکگرتوو بکەن بۆ ئەوەی ئەو کاتەی کە پەیڕەوی لە یاساکان دەکەن پەیڕەوییان لە ویستی خۆیان کردبێت و هەروەکو کانت دەڵێت تووشی ناخود رێسایی نەبن. کانت حەق دەداتە ئەو ویستە یەکگرتوو و ئەو ویستە گشتییەی کە بەم جۆرە دروستبووە، ئەو



کەسانەی کە دەیانەوێت بکەونە دەرەوەی ئەم سیستەمە ئەخلاقی و عەقڵانییە ناچاریان دەکات بگەڕێنەوە ناو ئەم سیستەمە. ناچارکردنی خەڵك بۆ پەیوەست بوون بە دەوڵەتەوە ئەو بۆچوونەی رۆسۆ بە یاددێنێتەوە سەبارەت بە ناچارکردن بە ئازادبوون. بە بۆچوونی کانت ئەم سیستەمە سیستەمی دادپەروەرییە و ئەم سیستەمی دادپەروەریەش پێویستە بۆ کامڵبوون. هەر کەسێك کە بکەوێتە دەرەوەی ئەم سیستەمە بەکۆمەڵە هەڕەشەیەکە بۆ سەردادپەروەری و دژ بە بنەڕەتی گشتی خۆ-یاسادانەرییە.

## ئەخلاق و یاسا

بەم جۆرە کانت خودرێسایی ئەخلاقی دەخاتە دەرەوەی سنووری چاودێریی یاسای دەرەکی و دوپاتی دەکاتەوە کە دەبێت یاسا (لە سنووری دەرەکی کرداردا) بمێنێتەوە. کەواتە کانت پەیوەندی خۆیاسادانەری ناوەکی (ئەخلاق) و یاسادانەریی دەرەکی (دادوەری) هەڵدەوەشێنێتەوەو نەك تەنها دەستێوەردانی دادوەری لە سنووری ئەخلاقی بە ناکۆك دادەنێت لەگەڵ بنەمای رێزگرتن لە رێزداری مرۆڤ بەڵکو بە هۆکاری تێکچوون و گەندەڵی دادەنێت لە ناو سیستەمی سیاسیدا. رەنگە لێرەدا کانت لە رووی دەزگای تیۆرییەوە تووشی نەگونجان و ناسازگاری هاتبێت بەڵام لایەنێکی دیکەی ئەم کارە ئەوەیە کە بە پێچەوانەی بیردۆزانی سەردەمی پێش مۆدێرن و جیهانی کۆن (لەوانە بە پێچەوانەی ئەفلاتۆن و ئەرەستۆ و تەواوی سیستەمی هزریی کلاسیك) کاری دەوڵەت بە برەوپێدانی فەزیلەت دانانێت لەنێوان خەڵکیدا. بەم جۆرە کانت لە ریزی بیرمەندانی لیبراڵ و هزری مۆدێرن دادەنرێ.

## دژایەتی کردن لەگەڵ مافی بەرهەڵستکاری

بە پێی بنەماو گریمانەکانی سەرەوە دەبوو کانت مافی بەهەڵستکاری لە بەرامبەر یاسادانانی نارەوا بە دروست بزانێت. بەڵام خۆی بە دووردەگرێت لە ئەرکە





پێویستەکانی تیۆریەکەی خۆی و بە ئاشکراو و دڵنیاییەوە هەموو جۆرە بەرهەڵستییەك نادروست دەزانێت لە بەرامبەر ئەو حکوومەتانەی کە یاسای ستەمکارانە بە رەوا دادەنێن. ئەمە لە پارادۆکسەکانی تیۆریەکەی کانتە، چونکە لە لایەکەوە ئەو گرنگی بە دەوڵەت دەدات بە هۆی ئەو شوێنگەیەی کە هەیەتی لە کامڵبوونی ئەخلاقیدا و لە لایەکی ترەوە بەرهەڵستکاری دژ بەو حکوومەتەی کە خود رێسایی ئەخلاقی تاك خەوشدار دەکات بەناڕەوا دادەنێت.[٥]

لە ڕواڵەتدا هۆکاری ئەم کارە ئەوەیە کە کانت وادەزانێت مافی بەرهەڵستیکردن بە پێی سیستەمی تیۆریی ئەو، بەواتای بەڕەوا زانینی رێسایەکە کە ئەگەر گشتگیربێت ئەوا تەواوی ئۆرگانی مەدەنی لەناو دەبات و لە راستیدا بەم کارەش تەنها حاڵەتێك کە تیایدا حەق بە شێوەیەکی دەرەکی دێتەدی لە دەستدەچێت.

### ٣- رەخنە و هەڵسەنگاندنی تیۆری سیاسیی کانت

### نەناسراوبوونی ناوەڕۆکی ئەرکی ئەخلاقی

هەرەکو وتمان کانت ویست دەگەرێنێتەوە بۆسەر بناغەی عەقڵی پەتی کردەیی. گەڕاندنەوەی ویست بۆ سەر عەقڵی پەتی واتە داماڵینی لە هەموو ناوەڕۆکێکی دەرەکی. وادیارە کە گریمانەی سەرەکی ئەم تێڕوانینەی کانت ئەوەیە کە "ویژدانێکی ئەخلاقی" هەیە کە بەردەوام خوازیاری ئەنجامدانی ئەرکی پەتییە، واتە ئەرك بە واتای خودی ئەرك. بەڵام ئەم ئەرکە رووت و پەتییە دەکەوێتە بەرامبەر دنیای پاشکۆ و بابەتی، چونکە دنیای پاشکۆ و بابەتی پەیڕەوی لە بنەماو یاساگەلێکی تر دەکات کە لە جۆر و رەگەزێکی ترە، جۆر و رەگەزێکی جیا لە ویژدانی ئەخلاقی.

بەم پێیە ئێمە ناتوانین بگەینە ئەوەی کە چۆن سەرچاوەی ناوەکی ئەخلاق کاردانەوەی دەرەکی دروست دەکات، واتە دەبێتە سەرچاوەی کاریگەری لە دنیای



دەرکیدا. بەڵام کاتێك نەتوانین بزانین و بڵێین کە رێسای ئەبستراکتی ئەخلاق چۆن دەگۆڕێت بۆ کردەی دیاریکراوی دەرەکی ناتوانین بزانین کە چۆن خودرێسایی ویست دروستدەبێت. لە کۆتاییدا دەگەینە ناتێگەیشتوویی ئەرکی ئەخلاقی. وادیارە لێرەشدا کانت ویستوویەتی وەکو بابەتی عەقڵی پەتی تیۆریی (سنووری زانستی سروشتی) نەشیاوبوونی پەڕینەوە بەرەو سنووری بوون نیشانبدات. ئێمە تەنها دەتوانین بچینە نێو سنووری سومبول و نیشانەکانەوە و لە ئاست سنووری (بوون)دا دەستمان کورتە.

### بەتاڵبوون و ڕواڵەتی بنەما ئەخلاقییەکانی کانت

هەروەك بینیمان کانت، ئەخلاقی لە چەمکی پەتی عەقڵانیەتەوە هەڵێنجا. ئەو دەڵێت کە ویست و خوازەکانی بنەمای ئەخلاق لەناو خودی چەمکی عەقڵ و عەقڵانیەت دایە. دەبێت هەر بوونەوەرێکی خاوەن عەقڵ بە شێوەیەکی پێشینە و جیا لە هەر ئەزموونێك پێویست بوونی ئەم ویست و خوازانە پەسندبکات. کانت لە سیستەمی هزری خۆیدا دەیویست خۆی لە هەر پشت بەستنێك بە سروشت و جیهانی دەرەوە بەدوور بگرێت و ئەرکی ئەخلاقی تەنیا لە ویست هەڵێنجێنێ. ئەو ئەم کارەی بە دانانی پێوەرێکی ڕواڵەتی یان قاڵبێکی تەواو بەتاڵ و تەواو ڕواڵەتی بۆ کرداری مرۆڤ ئەنجام دا. بەڵگەشی بۆ ئەم کارە ئەوە بوو کە عەقڵانیەت هزری گشتی و گونجاو لە خۆدەگرێت. بۆیە دەبێت رێسای هەرکاتێك وەها رێکبخەین کە بتوانین بەبێ ناکۆکی بگوازینەوە بۆ هەمووان و بیکەینە رێسایەکی گشتی. تەنها ویستێك شایستەی وەها و تایبەتمەندییەکی وەهای هەیە کە لە دەرەوە و لە سروشتدا بە دوور لە هەموو جۆرە پەیوەست بوونێك. بکەری ئەخلاقی بەخۆ ئامادەکردن بەم شێوازە بە واتایەکی تەواو دەبێتە خودرێسایان سەربەخۆ، چونکە تەنها ملکەچی فەرمانی ویستی خۆی دەبێت. لە راستیدا لێرە عەقڵ بەواتای ویستی عەقڵانی تەنها پێوەری کارەکانە.[٦]





ڕێسای ڕواڵەتی ئەخلاقی کانت کارێکی ڕەهایە، هەروەکو وتمان بەم جۆرە شێواز بەندی دەکرێت:" تەنها لەسەر بناغەی ئەو ڕێسایە ڕەفتار بکە کە لەهەمانکاتدا بتەوێت کە ئەو ڕێسایە یاسایەکی گشتی بێت"[٧] کانت لەو بڕوایەدایە کە بەهەمان شێوە کە بنەما ڕواڵەتییەکانی بەڵگە هێنانەوەی ئەندازەیی (قیاسی) تەواوی ئەندازەکان دابەشدەکات بۆ بەرهەمدار و بێ بەرهەم، بنەما ڕواڵەتییەکانی ئەخلاقیش تەواوی کردارەکان بۆ دوو دەستەی ئەخلاقی و نائەخلاقی دابەشدەکات. مرۆڤ بۆ ئەوەی بزانێت کە کارەکەی ئەخلاقییە یان نا دەبێت بزانێت کە ئایا دەتوانێت بخوازێت ڕێسای کردارەکەی ببێتە شتێکی گشتی یان نا. ئەگەر وەڵامەکە بەڵێ بوو ئەوا کارەکەی ئەخلاقیە و بە پێچەوانەشەوە نائەخلاقییە.

هیگل ڕەخنەی لە ڕواڵەتی بوون و بەتاڵبوونی عەقڵ و ویستی ئەخلاقی کانت دەگرێت و دەڵێت کە فەرمانی ڕەهای کانت (فۆرمۆڵەکەی سەرەوە) ڕێسایەکی بێناوەرۆك و پەتیمان دەداتێ کە ڕەنگە ویستی ئێمە سنووردار بکات، بەڵام لە بەرامبەر دنیای دەرەکیدا بێ توێشوو و بێ توانایە. دنیای دەرەکی هیچ نیگەرانی ئەوە نییە کە ڕازی بێت بە یەکێتی ئەرك و واقیعیەت هەر بۆیە ئێمە ناتوانین تەنها لەناو بنەما ڕواڵەتییەکاندا بە دوای سەرچاوەی سیستەمی ئەخلاقی و جەوهەری ئەخلاقیاتدا بگەڕێین.

## ناکۆکی لە تیۆریی دادپەروەری و یاسای کانت

کانت لە میتافیزیکی ئەخلاقدا وەکو خودمەبەستێك باس لە ڕێزداری مرۆڤ دەکات.[٨] ڕێزداری مرۆڤ بەرزترە لە هەموو بەهایەك. هەرشتێك بەهایەکی هەیە و دەکرێ لەگەڵ شتەکانی تردا هەڵبسەنگێنرێ، بەڵام ناتوانین بەهایەك دیاری بکەین بۆ ڕێزداری مرۆڤ و هیچ شتێك نییە کە بتوانرێت بگۆڕدرێتەوە لەگەڵ ڕێزداری مرۆڤدا. ڕێزگرتن لە ڕێزداری مرۆڤ هاوئاستە لەگەڵ خودی یاسای ئەخلاقی. کانت ئەم ڕێسایە لە بنەمای تیۆریە ئەخلاقی و یاساییەکەی خۆیدا



بەکاردەهێنێ و بەم جۆرە فۆرمۆلیزەی دەکات:"وەها ڕەفتار بکە کە هەمیشە مرۆڤایەتی لە خۆت و لە کەسانی تریشدا وەکو مەبەست لە بەرچاوبگری، نەك هەرگیز وەك ئامرازێك"[٩] هۆکارەکەشی ئەوەیە کە ڕێزداری مرۆڤ و جەوهەری مرۆڤ وەکو بکەرێکی ئەخلاقییە و پەیوەست بە ئەم یان ئەو تایبەتمەندییە تایبەتەی تاکەوە نییە.

ئەم تێڕوانینەی کانت دەکەوێتە بەرامبەر تێڕوانینی پێش مۆدێرن کە زۆرکات تیایدا چەمکی ڕێزداری تێکەڵدەبێت لەگەڵ چەمکی نەژاد و بنەچەك و ئایین و ڕەسەنایەتی خێزانی و بەم جۆرە بوو کە کۆمەڵگای کلاسیك لەسەر بنەمای کاروبارەکان بوو. بە یەکسان دانانی مرۆڤەکان لەبانگەشەکانی هزری مۆدێرن بووە. گرنگی ڕێزداری مرۆڤ لە تیۆریەکەی کانتدا تائاستێکە کە پێشێلکردنی ڕێزداری کەسێك وەکو پێ شێلکردنی ڕێزداری تەواوی کۆمەڵگا تەماشادەکرێت. میتافیزیکی کانت و فەلسەفە ئەخلاقی و یاساییەکەی ئەو ئەم جۆرە بڕیار و بەشانەی هەیە. بەڵام ڕەخنەگران دەڵێن سەرەڕای ئەوەی کە کانت هەموو ئەمانە لە ئاستی ڕێسایی یا ڕێگەپێدراو پەسنددەکات بەڵام لەو جێیەی کە باس لە ڕاستییە دەرکییەکان دەکرێت پابەند نابێت بە بنەماکانی خۆیەوە و بەشتێکی زۆری ناڕەواکان بەڕەوا دادەنێت.





## پەراوێزەکان

1- Heiner Bile feled, Autonomy and Republicanism “Immanuael Kant philosophy of freedom, political, Angust 1997.

s Theory of property, political ś Kant2- Patrick Riley, on Susan shell Theory, Vol. 6, No 1 February 1978, pp.91-99.

s Rechtslehre” 3- Kevin podsom “Autonomy and Huthority in Kant Political Theory Vol 25, No 1 February 1997, pp.93-111.

٤- راجراسکروتن، کانت، ترجمة علی پایا، تهران، طرح نو، ١٣٧٥، ص ١٧٤.

5- Charles Taylor, Hegel, London, Cambridge University press, 1975, p.386.

٦- امانوئل کانت. بنیاد مابعد الطبیعة اخلاق، ترجمة حمید عنایت و علي قیصري، تهران، انتشارات خوارزمی، ١٩٦٩،ص ٦٠.

٧- سەرچاوەی پێشوو، بەشی یەکەم.

٨- سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٤.

٩- سەرچاوەی پێشوو.

## پاژی -٨-

## هیگڵ

### George Wilhelm Hegel

**کۆمەڵگای سیاسی وەکو بەرزترین لایەنی عەقڵانیی ژیان**

**ژیان و بەرهەمەکانی هیگڵ**

گیۆرگ ویلهێلم فریدریك هیگڵ (١٧٧٠-١٨٣١) بە یەکێك لە گەورەترین فەیلەسوف و بیرمەندانی مێژووی جیهان دادەنرێت. لە شاری شتۆتگارت لە دایکبووە و پاش تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی (قۆناغی سەرەتایی تا دواناوەندی) لەم شارە رویکردە شاری توبینگن و لەوێدا دەستی بە خوێندنی فەلسەفە و تیۆلۆژی کرد. ماوەیەك وەکو مامۆستای ماڵەوە (تایبەتی) ژیانی بەسەربرد تا سەرئەنجام (١٨٠١) لە زانکۆی یەنا وەکو مامۆستای لۆژیك و میتافیزیك دەستبەکاربوو. پاش چوار ساڵ لە هەمان زانکۆ پلەی پرۆفسوری پێبەخشرا. لە ساڵی ١٨١٦ لە زانکۆی هایدلبەرگ کورسی پرۆفیسوری وەرگرت و دەستی بەوتنەوەی وانەی فەلسەفەی سیاسی و مێژووی فەلسەفە و لۆژیك و میتافیزیك و جوانیناسی کرد. پاش دووساڵ وانەوتنەوە لەم زانکۆیە رووی کردە زانکۆی بەرلین و لەسەر کاری وانەوتنەوە بەردەوام بوو.

هیگل لە ریزی ئەو بیرمەندانەیە کە کارێکی زۆریان بە ئەنجامگەیاندووە و بەرهەمێکی زۆریان هەیە. لەوانە کتێبی دیاردەناسی گیان (١٨٠٧) و زانستی



لۆژیك (١٨١٢) و ئینسکلۆپیدیای زانستە فەلسەفییەکان (١٨١٧-١٨٣٠) و فەلسەفەی ماف (١٨٢١).

لە باسەکانی خوارەوەدا سەرەتا تەواوی سیستەمی هزری هیگڵ و پاشان بەشی سەرەکی هزری سیاسی ناوبراو دەخەینەروو.

### ١- تێڕوانینێکی کۆمەڵەی فەلسەفیی هیگڵ

**فەلسەفەی هیگڵ وەکو مێژووی کامڵبوونی ئاگایی**

فەلسەفەی سیاسی و هزری سیاسیی هیگڵ وەکو سیستەمێکی هزری رێکوپێك پەیوەندییەکی ئۆرگانی هەیە لەگەڵ کۆمەڵە فەلسەفییەکەیدا. بۆ باشترین تێگەیشتن لە هزری سیاسی هیگڵ باشتروایە سەرەتا زانیارییەکی کورت بە دەستبهێنین سەبارەت بە کۆمەڵە فەلسەفییەکەی. دەتوانین کتێبی دیاردەناسی گیان بە پێشەکییەك دابنێین بۆ تەواوی فەلسەفەی هیگڵ. هیگڵ لە دیاردەناسی گیاندا کامڵبوونی دیالێکتیکی ئاگایی دەخاتە روو لە پەتیترین باریەوە تاوەکو ئاستی مەعریفەی رەها. بە بۆچوونی هیگڵ کاری فەلسەفە بریتییە لە تێگەیشتن "ئەو شتەی کە لە راستیدا هەیە" و پێوستە بۆ ئەم تێگەیشتنەش شێوەی تێگەیشتنی راستەقینە لە لایەن هەست یان ئاگاییەوە بخاتەروو. هیگڵ پیشانی دەدات کە چۆن هەست (ئاگایی) بە شێوەیەکی دیالێکتیکی لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر کامڵدەبێت و هەر قۆناغێك جگە لە پاراستنی دەستکەوتەکانی پێشوو چەند دەستکەوتێکی نوێیشی دەبێت، بەم جۆرە لە چاو قۆناغەکەی پێشوو، قۆناغە نوێیەکە دەگوازێتەوە بۆ ئاستێکی بەرزتر. ئەم رەوتە بەردەوام دەبێت تا بەدەستهێنانی مەعریفەی رەها، بۆیە بەبۆچوونی هیگڵ لە لایەکەوە مێژووی جیهان شتێك نییە جگە لە مێژووی پێشکەوتنی بەردەوامی ئاگایی لە ئازادییەوە،





چونکە هەروەکو پاشتر باسی دەکەین پێشکەوتنی ئاگایی هاوڕێ و جمکی پێشکەتنی قۆناغ بە قۆناغی کامڵبوونی کۆمەڵگای مرۆییە.

مێژووی ژیانی مرۆیی و کۆمەڵگای مرۆڤیش مێژووی تێپەربوونی بەرەبەرەیە لە ئازادی شاراوەوە بەرەو ئازادی ئاشکرا و لە کۆتایشدا ئاگایی لە ئازادییەوەیە. بە وتەیەکی تر مێژوو لە راستیدا مێژووی بە دیهاتنی عەقڵە، چونکە عەقڵ وەکو توانای ناوەکی مێژوو نەك تەنها قۆناغ بە قۆناغ کامڵدەبێت بەڵکو وێڕای ئەوەش قۆناغ بە قۆناغ بەرەو بەدیهاتنی ئازادی و بەدەستهێنانی ئاگایی سەبارەت بە خود بەرەوپێشەوە دەڕوات. لە کۆتاییدا پێشکەوتنی عەقڵ و ئاگایی بەوە کۆتایی دێت کە لە سیستەمی فەلسەفەی هیگڵدا عەقڵ بەخود ئاگایی دەگات و لەم پێگە بەرزەو بەرەودواوە دەڕوانێت و قۆناغەکانی پێشکەوتنی رابردووی خۆی لە سادەترین دۆخەوە تا دۆخی پێشکەوتنی ئێستای دەناسێتەوە.

## لە زانستی لۆژیکەوە تا فەلسەفەی یاسا

کۆمەڵەی فەلسەفی هیگڵ سێ بەشی سەرەکی هەیە: لۆژیك و فەلسەفەی سروشت و فەلسەفەی زەین. هەریەك لەم سێ بەشە یەکێك لە رەنگدانەوە سێ لایەنییەکەی ئەو شتەی لەگەڵدایە کە بە "ئایدیا" یان "گیانی رەها" ناودەبرێت. "ئایدیا" (مپال) باری تاکی "ئایدیاکانە" (مپل) و لە کاتی خستنەرووی فەلسەفەی ئەفلاتۆندا لەگەڵ ئەم زاراوەیە ئاشنابووین. هیگڵ زاراوەی "ئایدیا" کە لە لایەن ئەفلاتۆنەوە بەکارهاتبوو بۆ کۆمەڵە فەلسەفییەکەی وەردەگرێت و بە واتایەکی تایبەتی بەکاری دەهێنێ. چەمکی ئایدیا شوێنگەیەکی تایبەتی هەیە لە کۆمەڵەی فەلسەفیی هیگڵدا. لە راستیدا ئەم چەمکە چەمکی سەرەکی (سەنتەر) فەلسەفەی هیگڵە. فەلسەفەی هیگڵ لە روویەکەوە ناسینی ئایدیایە لە سێ رەهەندی سەرەکی خۆیدا. ئەم سێ رەهەندە کە سێ بناغە سەرەکییەکەی کۆمەڵە هزری هیگڵ پێکدێنن بریتین لە: ئایدیا و سروشت و گیان (یان عەقڵ). ئایدیا لە لۆژیك و سروشت لە فەلسەفەی سروشت و گیان یان عەقڵ لە فەلسەفەی زەین باسیان لێوەدەکرێت.

١- **لۆژیك-** ئایدیا بریتییە لە بوون لە پەتیترین رەهەندا یان بە واتایەکی تر رەهەندێکی تەواو سادە تەواو بە تاڵ. بوون لە ناخی خۆیدا، بوون بە ئیعتباری خودی بوون. ئایدیا حاڵەتێکە لە بوون کە لە هیچ یەك لەو شتانەی کە هەیە بە دیارنەکەوتووە یان بەو جۆرەی کە هیگڵ باسی لێوەکردووە لە هیچ شت و هیچ فۆرم و هیچ دەرکەوتنێکدا نەبینراوە و نەسەلماوە. هیگڵ لەو بیرمەندانەیە کە گریمانەی ئەوە دەکا گەشتێکی دیکەی جیا لە بوونەوەر (کە فۆرمی بینراوی بوونە) بە ناوی بوون (بوونی پەتی) وێنا دەکرێت. کەواتە ئایدیا واتە بوونی پەتی و سادە و بەتاڵ، و پلەی یەکەمی سێ پلەکەی هیگڵە لە سیستەمی بووندا. هیگڵ لە زانستی لۆژیکدا باس لە ئایدیا دەکات لە حاڵەتی سادە و بەتاڵدا (واتە داماڵراو لە هەموو رەنگدانەوە و فۆرمێکی دەرەکی). بەواتایەکی تر لۆژیك، پشکنینی ئایدیا لە باری سادە و پەتی خۆیدا. لەهەمانکاتدا لۆژیك بناغەی سیستەمی فەلسەفەی هیگڵە.

هیگڵ لە کتێبی زانستی لۆژیکدا سەرەتا رەخنە لە لۆژیکی پێش خۆی دەگرێت کە لە لایەن ئەرەستۆوە دامەزرابوو و پاشان لۆژیکی خۆی کە لۆژیکێکی نوێیە دادەمەزرێنێت. لۆژیکی پێش هیگڵ کە دەتوانین بە لۆژیکی کۆن یان کلاسیك ناوی ببەین بە "لۆژیکی رواڵەتی" ناسراوە. لۆژیکی رواڵەتی مامەڵە لەگەڵ فۆرمی هزردا دەکات نەك ناوەڕۆکی هزر. هیگڵ بە هۆی رواڵەتی بوونی لۆژیکی رواڵەتی بەبێ توانای دادەنێت بۆ ناسینی راستی دەرەکی.

هەروەك هیگڵ دەڵێت ئەم هاوکێشەیەی: گالیلە مرۆڤە و هەموو مرۆڤەکان نەزانن، کەواتە گالیلە نەزانە. هاوکێشەیەکی دروستە. بۆچی؟ چونکە بەراییەکانی ئەم هاوکێشەیە (زەمینەکانی) دروستە. بەڵام ئایا لە راستیدا ئەو حوکمانەی کە لەم هاوکێشەیەوە بە دەست دێن دروستن؟ بۆ دیاری کردنی دروستی یان نادروستی

بابەتی "هاوکێشە راستەکەی" سەرەوە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئەزموونە دەرەکییەکان و دنیای ئەزموونی و دەرەکی.

هیگڵ بۆ خۆبەدوورگرتن لەو ناکۆکییەی کە رووبەڕووی لۆژیکی رواڵەتی بووەتەوە دەیەوێت لە خاڵی سفرەوە واتە خاڵی داماڵراو لە هەموو پێش گریمانە و ناوەڕۆکێکی دەرەکی دەستپێبکات. بە جۆرێك ئەم کارە ئەنجامدەدات کە دەگاتە پەتیترین باری هزر، بارێك کە هەروەکو هیگڵ دەڵێت بە تەواوی "بێ ناوبژیە" (داماڵراو لە هەموو ناوبژییەك). ئەم بارەیە تەواو ئەبستراکت و "بەبێ ناوبژیوان"ە بوونی رەها یا "بوونی پەتی" یە. هیگڵ دەڵێت بەم جۆرە ئەم "بوونی پەتی" یان "بوونی رەها"یە بریتییە لە "هیچ شت" ێك. کەواتە لەم خاڵەدا ئێمە گەیشتینە "هیچ شتێك". بەڵام ئەگەر بە دروستی وردبینەوە ئەم "هیچ شت"ە بۆ خۆی "شتێك"ە-واتە "هیچ شت"ێکە. کەوابوو "هیچ شت" گۆڕا بۆ "شت"یش بۆ "هیچ شت". لە گۆڕانی ئەمانەوە بۆ یەکتر ئێمە گەیشتینە بوون (کاری بوون). بوون واتە ئەو شتەی کە دەکەوێتە نێوان "هیچ شت" و "شت". هیچ شت دەبێتە شت و شتیش دەبێتە هیچ شت. لێرەدا ئێمە لە بینینی (هیچ شت)ەوە دەپەڕینەوە بۆ بینینی (شت) و ئەم پەرینەوەیەش بریتییە لە بوون، بوون سێیەمین بەشی سێ بەشەکەیە.

یەکەمین سێ بنەمای لۆژیکی هیگڵ بریتییە لە هیچ شت و شت بوون. هیچ شت بێ ناوبژییە واتە فۆرم و روخسارو سیمای نییە. شت خاوەن ناوبژییە واتە فۆرم و روخسارو سیمای دیاریکراوی هەیە و بوون بریتییە لە گواستنەوەی یەکەم بۆ دووەم. پاش دەرهێنانی ئەم سێ بنەمایە هیگڵ درێژە بە کاری هەڵێنجانی خۆی دەدات و گوتارگەلێکی جیاواز بەدەستدێنێت لە سنووری لۆژیکدا. تەواوی لۆژیکی هیگڵ هزرێکە کە "بیر لە خۆی دەکاتەوە" واتە هزر مامەڵە لەگەڵ خودی هزردا دەکات و هیچ کارێکی بە دنیای دەرەوە نییە. ئەو شێوەیەی کە هیگڵ لە لۆژیکدا بەکاریدەبات بە هەڵێنجان ناودەبرێت. هەڵێنجان واتە دەرهێنانی ئایدیایەك لە ناو ئایدیایەکی تر. دواین گوتار کە هیگڵ لە کتێبی لۆژیکدا هەڵدەهێجێنێ بە



"فۆرمی پەسەندکراوی عەقڵ" ناودەبرێت. "فۆرمی پەسەندکراوی عەقڵ" بەو جۆرەی کە هیگڵ باسی دەکات دەخوازێت کە لە حاڵەتی هزری پەتی و ئایدیا لە حاڵەتی سادە و بەتاڵ و پەتی بێتەدەرەوە و بگۆڕێت بۆ دیار و پەرەسەندوو و دەرەکی. لێرە بە دواوە ئایدیا لە سروشتدا ئاشکرادەبێت. واتە ئەوەی کە سادەو بە تاڵ و پەتی بوو لە سروشتدا بە شانەگەلی جۆراو جۆر فۆرمێکی بابەتی (عینی)بە خۆیەوە دەگرێت.

**٢- فەلسەفەی سروشت-** لێرە بە دواوە هیگڵ دەچێتە ناو فەلسەفەی سروشت. فەلسەفەی سروشت بەشی دووەمی کتێبی ئینسکلۆپیدیای فەلسەفی پێکدەهێنێت. سروشت ئەو شوێنەیە کە ئایدیا هەروەکو هیگڵ دەڵێت تیایدا بە دیارکەوتووە ئەم حاڵەتە لەهەمانکاتدا حاڵەتی "لە خۆ نامۆبوونی (نامۆبوون)" ئایدیایە. لێرەدا ئێمە ئاشنا دەبین بە چەمکی "لەخۆ نامۆبوون" (بەو گوزارشتە تایبەتەی کە هیگڵ مەبەستێتی) کە چەمکێکی ناسراوە لە فەلسەفەی سیاسی رۆژئاوادا. رۆسۆ چەمکی لە خۆ نامۆبوونی بۆ حاڵەتێك بەکارهێنا کە مرۆڤی کۆمەڵایەتی دوورکەوتبێتەوە لە سەربەخۆیی (یان خودرێسای) سروشتی خۆی و لە کۆمەڵگادا توشی جۆرەها خووڕەوشتی نا پەسەندی وەکو تەماحکاری و دوژمنی و ستەمکاری و ..... هاتبێت. رۆسۆ پێیوابوو کە دەبێت بە کەرەستەی سیاسی کۆمەڵگایەکی نوێ دروست بکرێت کە بە دووربێت لەم کارانە و مرۆڤ بگەیەنێتەوە بە ئازادی سەردەمی پێش باری مەدەنی واتە ئازادی سەردەمی باری سروشتی.

بەڵام هیگڵ بەواتایەکی نوێوە "لە خۆ نامۆبوون"ی بەکارهێنا کە لە پاژی بەشە سەرەکییەکانی سیستەمی بووناسییەکەیدا وەکو سروشت بە دیاردەکەوێت لە بەرامبەر ئایدیادا. کەواتە بەپێی فەلسەفەی هیگڵ سروشت باری لەخۆ نامۆبوونی ئایدیایە. نامۆبوون بەو واتایەی کە ئایدیا لە باری پێشووی واتە باری سادەو نەبینراو وەدەرهاتووە و رەنگدانەوەی دیار و فراوانی وەرگرتووە.

بەم شێوە سروشت بنەمای دووەمە لە سێ بنەماکەی ئایدیا -سروشت- زەین. هەروەکو باسکرا ئەم سێ بنەمایە لە بەشە سەرەکییەکانی سیستەمی بوون-ناسی و سیستەمی مەعریفەناسی هیگڵن. شێوەی دیالێکتیکی هیگڵ بەم جۆرەیە کە لە هەریەك لەم سێ بنەمایانە بنەمای یەکەم بریتییە لە تێز یان ڕەوش و بنەمای دووەم ئانتی تێز یان دژەرەوش و بنەمای سێیەم سەنتێز یان ڕەوشی کۆکراوە.

ئەم سێ چەمکە (تێز و ئانتی تێز و سەنتێز) لە سەرەکیترین چەمکەکانی سیستەمی هزری هیگڵن، لە لایەکی ترەوە سێ چەمکە بنەڕەتییەکەی دیالێکتیکی هیگڵن. بوون (کاری بوون) کە بنەمای تێڕوانینی هیگڵە بۆ هەموو بەشەکانی بوون (هەبوون) لە پەیوەندی نێوان ئەم سێیانە دروستدەبێت. بوون یان بزاوتن لە هەموو بەشەکانی بوون لە هەموو بونەوەرەکانەوە تا سروشت و لەوێوە تا کۆمەڵگاو تەنانەت لە سنووری هزر و چەمکەکانیشدا بریتییە لە ڕاوەستانی ئانتی تێز لە بەرامبەر تێزدا و وەلانانی تێزە لە لایەن ئانتی تێزەوە (چارەسەرکردنی دژایەتی) و لە ئەنجامدا هەنگاونان بەرەو قۆناغێکی نوێ واتە سەنتێز (کامڵبوون). هیگڵ زاراوەی سەنتێز (بەواتای تێکەڵبوون)ی بۆ ئەوە بە کارهێناوە کە ئەوەی لەم قۆناغەدا هەمانە واتە قۆناغی سەنتێز جگە لەوەی کە ئاست و پلەیەکی نوێیە و بەشە نوێیەکانی ئانتی تێزی چەسپاندووە و ئەو شتانەش کە لە تێزدا شیاوی مانەوەو هاوئاراستەی پێشکەوتنن لە خۆیدا دەهێڵێتەوە بۆیە هەم لێکپچڕانمان هەیە لەم پرۆسەیەدا (وەلاوەنانی تێز) و هەم پەیوەست (درێژەی بەشە بەرهەم هێنەر و پۆزەتیڤەکانی تێز لە سەنتێز).

لە سێ بنەماکەی ئایدیا-سروشت- زەین بەشی سروشت ئانتی تێز واتە ڕەتکردنەوەی ئایدیایە. بەڵام ئایدیا لەم حاڵەتە نوێیەدا چەند تایبەتمەندییەکی نوێی وەرگرتووە کە بریتییە لە بینراو و فرەبوون و توانای کامڵ بوون لە سروشتدا. هیگڵ لە فەلسەفەی سروشتدا باسی ئەوە دەکات کە چۆن سروشت بە تایبەتمەندیە کامڵەکارییەکەی خۆی کامڵ ترین بوونەوەر واتە مرۆڤ دروستدەکات و مرۆڤ کە



خۆی بەشێکە لە سروشت چۆن دەتوانێت خۆی و سروشت بناسێت. بەم پێیە سروشت لە ڕێگەی مرۆڤەوە دەگاتە ناسینی خۆی و دەبێتە خود ئاگا.

**٣- فەلسەفەی زەین-** فەلسەفەی زەین بەشی سێیەمی ئنیسکلۆپیدیای فەلسەفییە. هیگڵ لە فەلسەفەی زەیندا مامەڵە لەگەڵ بینراو و ڕەنگدانەوە و کامڵبوونی عەقڵ یان گیان دەکات لە ژیانی بیرکردنەوە و کۆمەڵایەتی مرۆڤدا. عەقڵ یان گیان (ئەو زاراوەیەی کە هیگڵ بۆ ئەم بەشەی بوون کە سەنتێزی سروشت و ئایدیایە بە کاری بردووە لە زمانی ئەڵمانیدا لەیەك جێدا هەردوو واتای عەقڵ و گیان بە دەستەوە دەدات) ئەویش بە نۆرەی خۆی پێکهاتووە لە سێ بنەما: گیانی زەینی-گیانی بابەتی- گیانی ڕەها. پەیوەندی نێوان ئەم سێ بنەمایەش پەیوەندییەکی دیالێکتیکییە. واتە گیانی زەینی تێز یەکسانە بە گیانی بابەتیی ئانتی تێز و گیانی ڕەهای سەنتێز. گیانی بابەتیی بەرچاو بەرجەستەی گیانی زەینییە، هەر بۆیە لە ڕاستیدا ڕەتی دەکاتەوە.

لە فەلسەفەی هیگڵدا گیانی بابەتی شوێنی دەرکەوتنی ئۆرگان و دامەزراوە و پێکهاتە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانە. بۆیە ئەگەر بمانەوێت لە هزری سیاسیی هیگڵ وردبینەوە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئەم بەشەی بەرهەمە هزرییەکانی هیگڵ و لێرە بەدواوە لە باسی هزری سیاسیی هیگڵ سەرنجی خۆمان ئاراستەی ئەم بەشەدەکەین.

## گیانی بابەتی و فەلسەفەی یاسا

لە کتێبی فەلسەفەی یاسادا بزاوتنی دیالێکتیکی ناوبراو ئاراستەی کامڵبوونی ویستە لە ڕێڕەوی بزاوتن بەرەو ئازادی. لەو ڕێڕەوەی کە هیگڵ باسی لێوە دەکات سەرەتا ویست لە مافی پەتی بەسەر ئامرازەکانی ژیانەوە بوونی هەیە و پاشان بەرەو ڕێسا ئەخلاقییەکان و لە پێشەوە بەرەو "ژیانی ئەخلاقی" سەردەکەوێت. ئەوکات لە درێژەی ڕێڕەوی بزاوتنی خۆی دەچێتە ناو سێ بنەماکەی دەوڵەت کە بریتین لە خێزان- کۆمەڵگای مەدەنی- دەوڵەت. بە بۆچوونی هیگڵ ئازادی مرۆڤ لە





شوێنکەوتنی جەوهەری خودەوە واتە عەقڵ دێتەدی و پەیڕەویکردنی عەقڵیش بە واتای بەشداریکردنی لە ژیانی بەرفراوانتر کە بەرزترین فۆرمی بریتییە لە دەوڵەت.

## بەرەو ئازادی

فەلسەفەی هیگڵ بە فەلسەفەی مەبەستگەرا لە قەڵەمدەدرێت. بەپێی ئەم فەلسەفەیە ژیان و مێژووی مرۆڤ مەبەست و مەرامێکی هەیە. بەپێی فەلسەفەی هیگڵ جیهان بەرەو مەبەستێك هەنگاو دەنێت. ڕێڕەوی جیهان بەم ئاراستەیە کە گیان پاش بڕینی ڕێڕەوێکی دیاریکراو کە یاسای دیالێکتیك زاڵە بەسەریدا دەگاتە خود ئاگایی لە ئازادیدا. یان بە زمانێکی سادەتر خود ئاگا دەبێت لە ئازادیدا. هیگڵ دەڵێت بەم جۆرە گیان یان عەقڵ دێتەدی. بەڵام گیان یان عەقڵ چۆن دێتەدی؟ واتە بۆ ئەوەی بە ئازادی و خودئاگایی لە ئازادی بگات کام ڕێگە دەگەرێتەبەر؟

گیان یان عەقڵ لە دنیای کات و شوێندایە. بۆیە مێژووی چیرۆکی بەدیهاتنی گیانە (یان عەقڵ) لە ڕێڕەوی قۆناغە جیاوازەکانی کامڵبووندا.[1] ئەوە دیالێکتیکی گیانە کە لەناو سروشتی ڕەوتی بەرەوپێشچووی مێژوودا شاراوەیە. مەبەستی گیان لە ڕەوتی مێژوودا ئەوەیە کە لە کۆتاییدا بە ناسینی خۆی بگات و ئەم مەبەستەیش بە کامڵبوونی کۆمەڵگا لە ڕەوتی عەقڵانیەتدا بە ئاکامدەگات. مرۆڤ لە ڕەوتی مێژوودا لە کۆمەڵگا سەرەتایی و ناکامڵەکانەوە بەرەو کۆمەڵگای کامڵتر هەنگاو دەنێت. شارستانیەتە یەك لە دوای یەکەکانی مێژوو وەکو قۆناغەکانی کامڵبوونی گیانن. ئەو مرۆڤانەی کە لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا لە دەرەوەی سیستەمی دەوڵەتدا دەژین دەکەونە پەراوێزی مێژووەوە.

کاتێك درامای مێژوو لە یۆنانی کۆنەوە دەستپێکرد کە یەکێتی ژیانی ئەخلاقی کۆمەڵگا تێکشکاو لەم گۆڕانەوە تاك لە دایکبوو. بەرلەمە تاك لەناو کۆمەڵگادا تواوبووەوە. لە ڕاستیدا ناسنامەیەکی جودای نەبوو. پاش داروخانی یەکێتی سەرەتایی لە کۆمەڵگای یۆنان و پەیدابوونی تاك پرۆسەیەك لە کامڵبوونی مێژوویی



دەستپێکرد کە لە کۆتاییەکەیدا جارێکی تر، ئەم جارە لە ئاستێکی بەرزتردا، تاك لەگەڵ کۆمەڵ یەکیان گرتەوە و هاوئاهەنگییەك دروستبوو لە نێوان تاك و ئۆرگانە سیاسیەکاندا. ئەم مەبەستە لە دەوڵەتێکدا دێتەدی کە لەسەربنەمای عەقڵ دروستکراوە واتە دەوڵەتی عەقڵانی (کە پاشتر ئەدگارەکانی دەخەینەروو).

## ئازادی و دەوڵەت

وێنای باو ئەوەیە کە دەوڵەت سنووردارکردنی ئازادیە. هەروەك بینیمان هۆبز و لۆك دەوڵەت بەکەرەستەو هۆکارێك دادەنێن بۆ پاراستنی ئاسایش. لە ڕاستیدا لایەنگرانی سوودگەرایش دەوڵەتیان بە کارێکی ناچار دادەنا بۆ ڕێکخستنی بەرژەوەندییە ناکۆکەکان. لە ڕاستیدا ئەم بیرمەندانە وەکو کەرەستەیەك تەماشای دەوڵەتیان دەکرد و بە پێویستیان دەزانی بۆ پارێزگاری کردن لە ئازادی بەڵام بە ڕەنگدانەوەی ئازادییان دانەدەنا. کانت و ڕۆسۆ دەوڵەت وەکو سیستەمێك بە پێویست دەزانن بۆ بەدیهاتنی ئازادی و سەربەخۆیی (خودرێسایی) ئەگەر هاتوو ڕەنگدانەوەی ویستی گشتی بێت. هیگڵ زیاتر لەگەڵ ڕۆسۆدا هاو ئاراستەیە بەڵام زۆر لە ئەو زیاتر دەڕوات و دەڵێت کە دەوڵەت ئامرازی گەشەپێدانی ئازادییە و مرۆڤ تەنها لە دەوڵەتدا دەتوانێت ئازادی بە دەست بێنێت. هێڵکارییەکەی خوارەوە کۆمەڵەی فەلسەفەی هیگڵ نیشاندەدات.

١- ئایدیا = ئایدیای سادە و سەرسوڕمان.

٢- سروشت = ئایدیا یان گیان لە حاڵەتی نامۆبووندا.

٣- گیان (عەقڵ) = خودئاگایی گیان لە ڕێگەی کامڵبوونی عەقڵی مرۆڤەوە.

| ١- لۆژیك- مامەڵە لەگەڵ ئایدیای پەتیدا دەکات لە سێ باس | ١- بوون- بێ ناوبژی<br>٢- زات- ناوبژی<br>٣- فۆرمی پەسندکراوی عەقڵ |
|---|---|





- ٢- فەلسەفەی سروشت: مادە و بوونەوەرەکان
- ٣- فەلسەفەی گیان
  - گیانی زەینی
    - ١- مرۆڤناسی- باسی گیان
    - ٢- دیاردەناسی-باسی ئاگایی
    - ٣- دەروونناسی- باسی زەین
  - گیانی بابەتی
    - ١- مافی پەتی-یاسا
    - ٢- ئەخلاق (تاکە کەسی)
    - ٣- ژیانی ئەخلاقی
  - گیانی ڕەها
    - ١- هونەر
    - ٢- ئایین
    - ٣- فەلسەفە



## ٢- لە عەقڵی فەلسەفەی کانتەوە بۆ عەقڵی فەلسەفەی هیگڵ

### شوێنگەی عەقڵ لە سیستەمی بووندا

هیگڵ یەکەمین بیرمەندی مۆدێرنە کە عەقڵێکی گشتی بە زاڵ دەزانێت بەسەر بوون و مێژووی مرۆڤدا. ئەم بۆچوونەی هیگڵ کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لەسەر بیرمەندانی سەردەمی خۆی و پاش خۆی، هەروەها کاریگەریەکی هەمەلایەنەشی هەبوو لەسەر هەموو هزری مۆدێرن. دەبێت لە متیافزیکی کانتدا بە دوای خاڵی دەستپێکی واتایەکی وەها بۆ عەقڵ بگەڕێین کە لە تێڕوانینیدا بۆ عەقڵ بۆچوونی ئەو جیاوازە لەگەڵ بۆچوونی فەیلەسوفە عەقڵانی و ئەزموونگەراکان. عەقڵانییەکان لە ئەفلاتۆن و ئەرەستۆوە تا دیکارت مەعریفەیان دەبەستەوە بە جۆرێك توانای سروشتی لە زەینی مرۆڤدا. ئەفلاتۆن دەرك پێکردنی هەستی بەجێ متمانە نەدەزانی، تەنها پەسندکراوە عەقڵییەکانی (معقولات) بە راست دەزانی. ئەو لەو بڕوایەدا بوو کە زانیارییە عەقڵییەکان بە شێوەی کۆمۆن (هاوبەش) لە دەروونی هەیە و تەنیا پێویستە هەوڵبدەیت کە ئاشکرای بکەیت. ئەرەستۆ دەرککراوە هەستییەکانی بەجێ متمانەوە دەستپێکی زانستی مرۆڤ دادەنا، بەڵام دەیوت کە هەست تەنها دەتوانێت بەشەکان و مادیاتەکان دەرك بکات و دەرك کردنی شتە گشتی و پەتییەکان تایبەتن بە عەقڵ. دیکارت هەست پێکراوەکان بەجێ متمانە دادەنێت بۆ دەستنیشانکردنی سوود و زیانی شتە دەرکییەکان بۆ جەستە و دەیوت کە زانیاریە هەستییەکان ناگونجێن لەگەڵ راستیدا. ئەو هێزی خەیاڵی بە سروشتی و تایبەتمەندی عەقڵی زاتی مرۆڤ دادەنا.

بەڵام ئەزمونگەراکان لە ئیپیکۆریانەوە تا هۆبز و لۆك و هیۆم و بێنتهام و میل زانیارییان بە سروشتی نەدەزانی. بەڵکو بە بەرهەمی هەستەکانیان لەقەڵەمدەدا. کانت دوای ئەو قەیرانەی کە بە هۆی گومانگەراکانەوە هاتبووە رێی مەعریفەناسی شێوەیەکی نوێی هەڵبژارد. هەروەکو ئاماژەی پێکرا کانت رووی لەو بۆچوونەکرد





که هەندێك لە قاڵبەکان لە زەینی پێشیندان ومرۆڤ هەستپێکراوەکانی خۆی دەرێژێتە ناو ئەم قاڵبانە و ڕێکیان دەخات. بەم جۆرە چەمکێکی نوێی دایە پاڵ عەقڵ کە سەرەڕای ئەوەی کە چەند لایەنێکی هاوبەشی هەبوو لەگەڵ بۆچوونی عەقلانییەکاندا بەڵام جیاوازییەکی سەرکیشی هەبوو لەگەڵیدا.

عەقڵ لای عەقلانییەکان سەرچاوەی بیرکردنەوە و گەڕانە بەدوای نموونەی دروستی کرداردا. لە لای ئەزموونگەراکانیش عەقڵ لە خزمەتی خواست و حەز و بەرژەوەندییە کەسییەکاندایە. بەڵام کانت وەکو ویستی ئەخلاقی، عەقڵی کردەیی شیدەکاتەوە ("تەنها لە سەربنەمای ئەو ڕێسایە رەفتار بکە کە لە هەمانکاتدا بخوازی کە ئەو ڕێسایە یاسایەکی گشتی بێت")[٢] بەڵام ئەو عەقڵەی کە کانت پێی گەیشتبوو عەقڵی رواڵەتی بوو، بۆیە بێ ناوەرۆك و بەتاڵ بوو لە هەموو واتاو بابەتێك. لە سیستەمی فەلسەفەی کانتدا عەقڵ لە لایەکە و جیهانی دەرەکیش دەکەوێتە لایەکی ترەوە. هەر وەکو هیگڵ دەیوت جیهانی دەرەکی هیچ لە بیری ئەوەدا نییە کە خۆی بگونجێنێت لەگەڵ پێوەرەکانی عەقڵی کردەیی ئێمەدا.

هیگڵ بۆ ئەوەی عەقڵ لەو جۆرەی کە لە سیستەمی فەلسەفەی کانتدا هاتبوو لە رواڵەتی بوون بە تاڵ بوون بهێنێتە دەرەوە گۆڕای بە عەقڵی تەواوی بوونەوەرەکان. بەم جۆرە تەواوی بوونەوەرەکان کەوتنە ناو عەقڵەوە و گۆڕان بۆ ناوەرۆکی ئەم عەقڵە. عەقڵی خودرێسایی کانت لە سیستەمی هزری هیگڵدا گۆڕا بۆ عەقڵی سەرتاسەری بوون و عەقڵی جۆری مرۆڤ. ئێستا ئەم عەقڵە بکەری سەرتاسەری بوونەوەرەکانە. بەم پێیە عەقڵ کە بکەری داهێنەرە ئیدی جیهانی دەرەکی و سروشتی لە بەردەمدا نییە بەڵکو لەناو خۆیدان. عەقڵ خودبوون (کار) و بەکردەیی بوونە.

ئێمە لە سیستەمی هزری کانتدا تا ئەو جێیە لە جیهان دەگەین کە بیخەینە ناو ئەو قاڵب و گوتارانەی کە پێشتر هەمانە (وەکو هۆکارێتی و کات و شوێن و پەیوەندی). بەڵام ئەوەی کە جیهان لە واقع و بۆ خودی خۆی چییە لە سنووری



عەقڵی ئێمە بەدەرە. ئێمە تەنها جیهانی دەرکەوتوو (بینراو) دەناسین نەك جیهانی بوون (وجود). هیگڵ بەو شوێنگەیەی کە لە سیستەمی فەلسەفی خۆیدا بۆ عەقڵی دیاریکرد لە هەمانکاتدا کێشەی نەناسراو بوون و مەحاڵبوونی ناسین (بوون-وجود)یشی چارەسەرکرد. بەم جۆرە ئەم کێشەیە چارەسەر بوو کە کاری گشتی چیدی ئەبستراکت و دوورە دەست نییە. بەڵکو کارێکی پاشکۆ و مرۆییە کە لە ناو گەڕی مێژوودایە و دەتوانرێت بناسرێ. ئەم عەقڵە یان بەواتایەکی تر ئەم گیانە هەمان سروشت و مرۆڤ و مێژووی مرۆڤ و ئۆرگانە دروستکراوەکانی مرۆڤ و بیرکردنەوەی مرۆڤە.

بە واتایەکی تر و بە جۆرێکی تر هیگڵ لە سیستەمەکەی خۆی دانا سەر (زانا) و بابەتی ناسینی (زانیاری) کردەیەك. بەو پێیەی کە جیهان راستییەکی دەرەکییە کە هەوڵی ناسین و مەعریفەی دەدەین. بەڵام بە جۆرێکی تریش ناسەر و بەدەستهێنەری مەعریفەیش هەر ئەم جیهانەیە. چ تەواوی بوونەوەرەکان وەکو: ئایدیا و سروشت و زەین لەبەرچاوبگرین و چ جیهانی مرۆیی وەکو مێژوو و دامەزراوە مرۆییەکان لە بەرچاوبگرین لە هەردوو باردا ناسەر و بابەتی ناسین یەك شتە. بە زمانێکی تر عەقڵە کە چ لە پانتایی بوونەوەرەکان و چ لە پانتایی مێژوو مرۆییدا هەم هەیە و هەم کاردەکا و هەم دەناسێت (لە راستیدا خۆی دەناسێت). ئەم دوکترینە بە یەکێتی ناسەر و بابەتی ناسین (عالم و معلوم) ناودەبرێت.

## عەقڵی تاکە کەسی و عەقڵی گرووپی

عەقڵ لە سیستەمی فەلسەفی هیگڵدا عەقڵی تاکە کەسی نییە بەڵکو عەقڵی گشتییە. لە مێژووی مرۆڤ و کۆمەڵگای مرۆییدا ئەم عەقڵە بەرهەمی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان و زەینی مرۆڤەکانە. بە واتایەکی تر ئەم عەقڵە عەقڵی نێوان زەینەکانە. مرۆڤەکان تەنها لە بەشداری کۆمەڵایەتی، بەتایبەتی لەو ڕێکخستنانەی کە لەسەر بنەمای دەوڵەتە، دەگۆڕێن بۆ بوونێکی عەقلانی.





هەموو پێشکەوتنێکی تاك تەنها لە پەیوەندییەکانی ئەو لەگەڵ کۆمەڵدا دروستدەبێت.[٣] رۆسۆش (هەروەك بینیمان) بڕوای بە عەقلانییەتی ویستی گشتی هەبوو بەڵام کێشەی فەلسەفەی رۆسۆ لەوەدابوو کە هێشتا لەویدا عەقڵ دیاردەیەك بوو تایبەت بە تاك، بە پێچەوانەی فەلسەفەی هیگڵ عەقڵی نێوان زەینەکان نەبوو. لە دوکترینەکەی رۆسۆدا هەموو تاکەکان ناتوانن بە کردەوە خوازیاری ویستی گشتی بن، رەنگە ویستی تەنها لە یەك کەسدا واتە ئەو کەسەی کە رۆسۆ ناوی دەنێت "یاسادانەر" رەنگبداتەوە. بۆیە بۆچوونەکەی رۆسۆ هەندێك کەم و کورتی تیادا دروستدەبێت لە پراکتیزەکردنی سیستەمی دیموکراسی لەگەڵ سیستەمی ویستی گشتیدا.[٤]

بەپێی بۆچوونی هیگڵ ژیانی کۆمەڵایەتی ویستی تاکەکان دەگۆڕێت بۆ ویستی عەقلانی. ویستی عەقلانی وەکو ویستێك کە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی رێك دەخات لە زەینی تاکە کەسیدا دروست نابێت بەڵکو لە پەیوەندی نێوان زەینە جیاوازەکان و گونجاو لەگەڵ داواکارییەکانی ژیانی هاوبەش دروستدەبێت. بۆیە پەیوەندییەکی نزیك هەیە لە نێوان ویستی عەقلانی تاك و سیستەمی کۆمەڵایەتی و سیاسی. گەرچی هیگڵ لەو بڕوایەدا نییە بۆ ئەوەی تاك بە تەواوی عەقلانی بێت پێویستە خۆی لەگەڵ هەموو یاساو پەیمانێکدا بگونجێنێت، بەڵام بڕوای وایە کە پیویستە سەرەتا سیستەمێکی یاسایی و ئەخلاقی گونجاو و پایەدار هەبێت تاوەکو تاك بتوانێت عەقلانی بێت.[٥]

### ٣- دەوڵەت و کۆمەڵگا

### ئۆرگانە سیاسیەکانی وەکو پێگەی دەرکەوتنی گیانی بابەتی

لە کۆمەڵەی فەلسەفی هیگڵدا کە پێشتر بەشە سەرەکییەکانیمان خستەروو ئۆرگانە سیاسییەکان دەکەونە بەشی گیانی بابەتییەوە. وتمان کە گیان یان عەقڵ لە سێ بنەمای گیانی زەینی -گیانی بابەتی- گیانی رەها دروست بووە. لە بەشی گیانی



زەینیدا هیگڵ مامەڵە لەگەڵ گیانی تاکە کەسیدا دەکات. گیانی زەینی قۆناغی لەناوەوە بوونی گیانە و هێشتا گیان سادە و نادیارە. گیانی بابەتی قۆناغی بەرچاوی یان دەرەکی بوونی گیانە. لێرەدا گیان یان عەقڵ لەناو ئۆرگان و دامەزراوە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا وەدیاردەکەوێت.

گیانی بابەتیش لە شوێنی خۆیدا پێکهاتووە لە سێ بنەما: خێزان-کۆمەڵگای مەدەنی-دەوڵەت. لەم سێ بنەمایەدا خێزان گوتارێکی گشتییە و کۆمەڵگای مەدەنیش گوتارێکی لاوەکییە و دەوڵەتیش کۆکەرەوەی گشتی و لاوەکییە لە ئاستێکی بەرزتردا. بۆ تێگەیشتنی ئەم تیۆرەی دەوڵەتی هیگڵ پێویستە سەرەتا بە کورتی بەشەکانی ئەم سێ بنەما دیالێکتیکییە بخەینەروو.

**١- خێزان:** یەکەمین بەشی سێ بنەما دیالێکتیکییەکەی هیگڵ لە باسی دەوڵەتدا خێزانە. هەر تاکێك لەگەڵ چەند کەسێکی تردا دەژی و پەیوەستە بەوانەوە هەروەك چۆن کەسەکانی تریش بەهەمان شێوە پەیوەستن بە ئەوەوە. بۆیە نابێت بە جیا لە کۆمەڵی ئەو ئۆرگانانەی کە خزمەتی پێداویستییە جۆراوجۆرەکانی ئەو دەکەن و بۆ خۆیان بەرجەستەکەری گیان یان عەقڵن لە جیهاندا لە تاك بکۆڵرێتەوە. یەکەمین ئۆرگان بریتییە لە پێکەوەبوونی تاکەکان لە خێزاندا. خێزان خزمەتی پێداویستییە هەستییەکانی مرۆڤ دەکات و یەکەمین پێگەیەکە ئاسایش و ئارامی بۆ دابین دەکات. گەرچی پەیوندی ژن و مێردایەتی لەسەر بنەمای هەست دروستبووە بەڵام هەستیش لەناو خۆیدا ناوەرۆکێکی عەقڵ پەسەندی هەیە. لێرەدا عەقڵ لە بەرگی هەستدا کار دەکات.[٦]

**٢- کۆمەڵگای مەدەنی:** بەڵام خێزان بچوکترە لەوەی کە هەموو پێداویستییەکانی مرۆڤ دابینبکات. دنیایەکی گەورەتر هەیە کە بەشێکی زۆری پێداویستییەکانی تری تاك دابین دەکات. ئەم دنیایە کۆمەڵگای مەدەنییە. کۆمەڵگای مەدەنی ئانتی تێز (باری بەرامبەر)ی خێزانە. کاتێك کە تاك لە سنووری خێزان دەردەچێ و کاتێك کە منداڵ گەورە دەبێت ماڵە باوکی بەجێ دەهێڵێت دەچێتە ناو کۆمەڵگای





مەدەنی، کۆمەڵگای مەدەنی سنووری تاکە سەربەخۆکان و رووبەروبوونەوە و ململانێکانیانە. لە بەرامبەر خێزاندا کە کاری سەرەکی ئەو بریتییە لە ئەوین و خۆشەویستی بەرامبەر، کاری سەرەکی کۆمەڵگای مەدەنی ململانێی گشتییە.

بازرگانی و پیشەسازی کە لە چوارچێوەی کۆمەڵگای مەدەنیدا بەڕێوەدەچن (هەندێ کات هیگڵ وەکو کۆمەڵگای بورژوازیش ناوی دەبات) چوارچێوە و سیستەمێکی نوێیە بۆ هەندێك لە پێداویستەکانی مرۆڤ. بەم پێیە ئەم بوارەش لە شوێنی خۆیدا عەقڵانییەتێکی تایبەتی هەیە.

**٣- دەوڵەت:** کۆمەڵگای مەدەنی ئانتی تێزی خێزانە. خێزان بواری یەکێتی و گشتێتییە و کۆمەڵگای مەدەنیش بواری لاوەکی و پەراکەندەییە. بەڵام دەوڵەت سەنتێزی ئەم دوانەیە. دەوڵەت باشترین تایبەتمەندییەکانی ئەم دوانە وەردەگرێت و بێ ئەوەی هەردووکیان لە خۆیدا بتوێیننێتەوە لە ئاستێکی نوێ و بەرزتردا دەیانگەیەنێتە یەکێتی. بنەمای دەوڵەتی مۆدێرن ئەوەیە کە تیایدا لایەنە گشتی و تایبەتی یا گشتی و لاوەکییەکان هەموویان بە جۆرێك پێکەوە لکاون کە تێیدا حەوزەی تایبەتی و بەشەکان ئازادی تەواویان هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا نابێت سێ گوتارەکەی خێزان و کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت وەکو چەند بەشێکی جیا لە یەکتر سەیر بکرێن کە بۆ نموونە چەند سنوورێکی فیزیکی لێکیان جیادەکاتەوە. هیگڵ هەریەك لەمە بە "خولەکێك" لە گشتێکی پێکەوە بەستراو دەبینێت. پێویستە لێرەدا سەرنجی زاراوەی "خولەك" بدەین کە زاراوەیەکی هیگڵییە. کاتێك کە دەڵێت خێزان و کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت هەریەك چەند خولەکێك لە یەك گشتی تاکن بەواتای ئەوەیە کە جیاوازی ئەمانە رێژەیی و شیکارییە.

## چەمکی ئۆرگانیستی دەوڵەت

لە روونکردنەوەی بابەتەکەی پێشوودا بێت ئەمەیش زیادبکەین کە هیگڵ مەبەستی لە جیاکردنەوەی دەوڵەت لە کۆمەڵگای مەدەنی و خێزان ئەوە نەبووە کە



بڵێت ئەو چالاکییە بازرگانی و قازانجخوازانەیەی کە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا هەیە دەبێتە هۆی چەند لێك ئاڵان و بەریەك کەوتنێك کە دەوڵەت (لەم چەمکەدا، لە راستیدا حکوومەت) بۆ دادوەریکردن و جێبەجێکردنی دادپەروەری دێتە ناومەیدانەوە. وەها تێڕوانینێك جیاوازییەکی زۆری نییە لەگەڵ تیۆریی دەوڵەتی جۆن لۆکدا. ئەگەر کاری دەوڵەت بریتیبێت لە دابین کردنی ئاشتی و ئارامی نێوان تاکەکان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا یان کاری ئاشتکردنەوەی خێزان لەلایەك و کۆمەڵگای مەدەنی لە لایەکی تر ئەوا لە روانگەی سوودگەراییەوە شتێکی دیکەی جیا لە چەمکی دەوڵەت دروستنابێت. ئەم جۆرە تێگەیشتنانەی دەوڵەت بە تێگەیشتنی میکانیستی دەوڵەت ناودەبرێت. تێگەیشتنی میکانیستی دەکەوێتە بەرامبەر تێگەیشتنی ئۆرگانیکی. لە تێگەیشتنی ئۆرگانیکیدا دەوڵەت وەکو هەموو بوونەوەرێکی زیندوو چەند ئەندامێکی هەیە کە تەنها پێکەوەلکانی هەموو ئەندامەکان وەکو پەیکەرێکی زیندوو دەبێتە خاوەن واتا. بۆ نموونە دەست لە جەستەی مرۆڤدا تا ئەو کاتەی کە پەیوەست بە گشتێتی جەستەی مرۆڤەوە واتادارە و لەگەڵ ئەوەی لە جەستەی مرۆڤ جیابکرێتەوە ئیدی شتێکی ترە و ناسنامەکەی پێشووی لە دەستداوە. بەشەکانی دەوڵەتی هیگڵیش لەم جۆرە پەیوەندەیەیان هەیە لەگەڵ یەکتردا. بۆیە تیۆریی دەوڵەتی هیگڵ کۆکە لەگەڵ تیۆریەکەی رۆسۆدا لە کاتێکدا کە جیادەبێتەوە لە تیۆریەکەی هۆبز، لۆك، بێنتهام و میلدا (کە تێگەیشتنێکی میکانیکی- ئامرازییان هەیە بۆ دەوڵەت). هیگڵ جیاوازی دەکات لە نێوان سیستەمی پێداویستییەکان کە مامەڵە لەگەڵ دووبارە بەرهەمهێنانی ژیانی مادی دەکات و سیستەمی دادپەروەری کە بە هۆی کۆمەڵە مەبەستێکی هاوبەشەوە تاکە لێك جیاوازەکان پێکەوە دەبەستێت. هیگڵ لەو بڕوایەدایە کە سیستەمی هزری سوودگەرایی ناتوانێت کێشەی ئاشتکردنەوەی بەرژەوەندی تاکەکان لەگەڵ ویستی گشتیدا روون بکاتەوە. سوودگەرایی مەبەستە گشتییەکان بە ئامرازێك دادەنێت بۆ گەیشتن بە مەبەستی تایبەتی ئایدیال نەك لەبەر خۆیان. بەڵام هیگڵ مەبەستە گشتییەکان لەوانە شتگەلێکی وەکو دادپەوەری





یان چەند فۆرمێکی سیستەمی کۆمەڵایەتی یان ناسنامەی نەتەوەیی بەرِەسەن دادەنێت و لەو بڕوایەدایە کە مرۆڤەکان مەبەستگەلێکی گشتیشیان هەیە و لە پێناویاندا هەوڵدەدەن لەوانەش هەوڵدان بۆ چاکسازیکردنی ئۆرگان و بەهاکان. بە بۆچوونی هیگڵ لە کۆمەڵگای مەدەنیدا هەم مەبەستگەلێکی تایبەتی هەیە و هەم مەبەستگەلی گشتی و لە پێناو خۆیاندا لە لایەن مرۆڤەکانەوە کاریان بۆ دەکرێت. لە کومەڵگایەکی سیاسی عەقڵانیدا پێکهاتوو لە کۆمەڵە مرۆڤێکی خاوەن عەقڵ و ئازاد هەماهەنگی دەبێت لە نێوان مەبەستە تایبەتی و گشتییەکاندا.

هیگڵ دەڵێت مرۆڤەکان لە پانتایی کۆمەڵگای مەدەنیدا لە هەمانکاتدا کە بەها گشتییەکان دەدۆزنەوە و لەبەر خودی هاوکاری (نەك تەنیا بۆ قازانجی تایبەتی) پەی بە بەهای هاوکاری دەبەن.

## دەوڵەتی عەقڵانی و دەوڵەتی ئەخلاقی

هیگڵ بە سێ واتا دەوڵەت بە کاردەبات کە لە راستیدا سێ رووی یەك راستییە بەڵام چەند پلەو پایەیەکی جیاوازی هەیە. ئەم سێ واتایە بریتین لە:

١- دەوڵەتی دەرەکی.

٢- دەوڵەتی سیاسی.

٣- دەوڵەتی ئەخلاقی.

چەمکی دەوڵەتی ئەخلاقی کامڵترین واتای دەوڵەت و دوو رووی تری هەیە لەگەڵ ئەمەشدا لە پلەیەکی بەرزتردایە. مەبەست لە دەوڵەتی دەرەکی کۆمەڵە سیستەم و یاسایەکە کە دەکەوێتە سەرووی کۆمەڵگای مەدەنییەوە کە بواری گەڕان بە دوای قازانجی تاکە کەسی و ململانێ و بازرگانییە. واتای دەوڵەتی سیاسیش تێڕوانینی دەوڵەتە روانگەی سیستەمی دەسەڵات و ئۆرگانە حکوومییەکانەوە. لە کۆتاییشدا ئەخلاقی کاتێك دەوڵەتەکە هاوڵاتیان بە دروستی لە واتای ئەخلاقی ئۆرگان و



بونیادی دەوڵەت گەیشتبن. لەو جێیەی کە وتمان مرۆڤ لە دەوڵەتدا دەگاتە ئازادی و ئاگایی لە ئازادی لەم واتایەی دەوڵەتدا ئەم کارە روودەدات.

لە دەوڵەتی ئەخلاقیدایە کە مرۆڤ بەرەو لوتکەی کامڵبوونی مێژووی سەردەکەوێت. لە روانگەی هیگڵەوە دەوڵەت بریتی نییە لە کۆمەڵێك یاساو رێسای سەربەخۆ و جیاواز لە حەزە کردەییەکانی هاوڵاتیان. بۆیە لەهەمانکاتدا دەوڵەت بریتی نییە لە رەنگدانەوەی کۆی ئەو بەرژەوەندیانەی کە هەیە لە چوارچێوەی کۆمەڵگای مەدەنیدا (بەو جۆرەی کە سوودگەرایی مەبەستێتی). دەوڵەت لە روانگەی هیگڵەوە ئۆرگانێکی ئەخلاقییە کە لە قالبی یاساو ئۆرگانە سیاسیەکاندا حەزی تاکەکانی لە خۆگرتووە. تەنها لە واتای ئەخلاقیدا کە دەوڵەت ویستی عەقڵانی و خواستی سروشتی مرۆڤ لەخۆدەگرێ. رەنگە تاك و دەوڵەت سەرگەرمی کاروباری ئەم جیهانەی خۆیان بن بەڵام لەهەمانکاتدا گوێزەرەوەی عەقڵێکی جیهانی و عەقڵی رەهان.[٧]

هیگڵ لەو بیرمەندانەیە کە لە تیۆری دەوڵەتی خۆیدا بە شێوەیەکی دیاریکراو کۆمەڵگای مەدەنیی لە دەوڵەت جیاکردەوە. جیاکردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت لە بیردۆزی سیاسی و شیکردنەوەی رێکی ئایدیای سیستەمی سیاسیدا شوێنێکی گرنگی هەیە. بیرمەندانی سوودگەرایش (هەروەك ئاماژەمان پێکرد) لە بیردۆزی سیاسی خۆیاندا شوێنیکیان بۆ کۆمەڵگای مەدەنی دیاریکردووە. بەڵام هیگڵ دەڵێت ئەوەی کە بیرمەندانی سوودگەرایی سەبارەت بە دەوڵەت وتوویانە لەگەڵ پێناسەی کۆمەڵگای مەدەنیدا دەگونجێت نەك دەوڵەت. هیگڵ جەخت دەکاتەوە کە نابێت دەوڵەت تێکەڵبکرێت لەگەڵ ئابووری ئازاددا. ئابووری ئازاد و کۆمەڵگای مەدەنی تەنها یەك خولەکێکە لە چەمکی دەوڵەت نەك هەمووی. بە بۆچوونی هیگڵ مرۆڤ بێ ئەوەی خودئاگابێت لە مەرام و حەزە تایبەتییە سنووردارەکاندا نامێنێتەوە بەڵکو لە عەقڵانییەکی دنیای راستیدا ئاوێتە دەبێت





و لە کردار و بیرکردنەوەی خۆیدا دەیخاتەوە روو. دەوڵەت یەکێکە لە راستییەکانی ئەم عەقڵانییەتە.

ئێمە بە کۆمەڵە داب و نەریت و یاسا و ئۆرگانێك پەروەردە دەبین کە پێمان دەڵێت چ ئەرکگەلێکمان هەیە. کارکردن بەپێی خواستەکانی ئەم داب و نەریت و رێسایە دەگۆڕێت بۆ سروشتی دووەمی ئێمە. ئەوانە دەگۆڕین بۆ شتێك کە ئێمە بە راستی خوازیاری ئەوین.[٨] بەم جۆرە لە لایەکەوە ئەمانە هەموویان رەنگدانەوەی بنەما عەقڵانییەکانن و لە لایەکی تریشەوە لەگەڵ هەستەکانی ئێمەدا ئاوێتە کراون.

## هیگڵ و تۆمەتی دەوڵەتگەرایی

بەوەی کە لەسەرەوە باسکرا ئایا نابێت بەو ئەنجامە بگەین کە هیگڵ بەتوندی بۆچوونی دەوڵەتپەرستی هەیە؟ لە راستیشدا چەند تۆمەتێکی وەکو دەوڵەتگەر و کۆنەخوازی و تەنانەت فاشیزمیش ئاراستەی هیگڵ کراوە. ئایا ئەم جۆرە دادوەریکردنە سەبارەت بە هیگڵ دروستە؟ بە بۆچوونی ئێمە ئەم تۆمەتانە لە بەدحاڵیبوونەوە دروستبوون و ئەم جۆرە دادوەریکردنانە نادروستن. هیگڵ دەوڵەت لە چەمکی ئەخلاقی و عەقڵانیدا بە بەرزترین شوێنی رەنگدانەوەی عەقڵ و ئازادی خودئاگا دادەنێت. بەڵام هەموو دەوڵەتەکان بە وێنەی تەواوی ئەم چەمکە دانانێت. لە راستیدا دەوڵەتەکان لە زۆر رووەوە شێوێندراون. بۆیە ئەم دەوڵەتانە ناتوانن بەپێی بۆچوونەکەی هیگڵ دەوڵەتی عەقڵانی بن.

لەگەڵ ئەمەشدا نابێت ئەو خاڵە لەیاد بکەین کە هیگڵ بە شێوەیەکی گشتی دەوڵەتی بە رەنگدانەوەی راستییەکی گشتی و رەنگدانەوەی پێداویستییەکی سەرووتر لە دڵەڕاوکێکانی قازانجی تاکە کەسی و گرووپییەکان دەزانی. تەنانەت دەوڵەتە ناکامڵەکانیش لە بوونی خۆیاندا شتێکیان نییە لەوەی کە پەیوەستە بە زاتی دەوڵەتەکانەوە. بە جۆرێك کە تەنانەت ناشرینترین مرۆڤ یان مرۆڤە نەخۆشەکانیش لە هەموو بارێکدا مرۆڤن.[٩] دەوڵەتەکان سەرەڕای هەموو کەم و



کورتییەکانیان دروستکراوی عەقڵی گشتی مرۆڤەکانن نەك ئارەزووی ئەم و ئەو. دەوڵەت دیاردەیەکی مەعقوڵە، واتە بەرهەمی چەند هێزێکی بە رێکەوت یان ئارەزووی مرۆڤ نییە. کۆمەڵگا و دەوڵەت جەوهەری تاکەکان پێکدەهێنن. تاکەکانیش لە پەیوەندیان لەگەڵ کۆمەڵگادا دەگۆڕێن بۆ ئەوەی کە هەن.

## تاك و کۆمەڵگا

دەبێت لە درێژەی ئەم باسەدا بڵێین کە بەپێی هەڵسەنگاندنی هیگڵ تاك بەشێکە لە گیانێکی گەورەتر. مەبەست لە گیانی گەورەتر چییە؟ کاتێك کە ئێمە باس لە مرۆڤ دەکەین مەبەستمان تەنها ئاماژەکردن نییە بە بوونەوەرێکی زیندوو وەکو ئۆرگانیزمێك، بەڵکو ئاماژە بە مرۆڤێك دەکەین کە دەتوانێت هەستبکات و بیربکاتەوە و بڕیاربدات و پەیوەندی جۆراوجۆر دروستبکات لەگەڵ کەسانی دەوروبەریدا. هەموو ئەمانە پێویستی بە کەناڵێکی گەیەنەرە وەکو زمان. زمان ئامرازێکە بۆ تاقیکردنەوەی جیهان و روونکردنەوەی هەستەکانی خود و تێگەیشتنی پەیوەندی لەگەڵ دەوروبەر و گەڕانەوە بۆ رابردوو. زمان کەناڵێکە لە رێگەیەوە خۆمان دەخەینە ناو دنیایەکی کەلتوورییەوە و ناسنامەیەك بۆ خۆمان هەڵدەبژێرین. بۆیە بەشێکی زۆری ئەوەی کە تاك هەیەتی لە زمانەوەیە. زمان شتێکە کە تەنها لە کۆمەڵگادا دەتوانێت دروست ببێت و تەنها کۆمەڵگایە کە دەتوانێت خاوەن زمانێك بێت. رۆسۆش ئەم بابەتەی باسکردبوو.

هیگڵ دەڵێت ئێمە تەنها کاتێك وەکو بوونەوەرێکی مرۆیی دەناسرێین کە لە کۆمەڵگایەکی کەلتووریدا بژین. کەواتە زمان و ژیانی کەلتووری دەکەونە سەر تەوەرێکی گەورەتر لە تاك. زمان لە کۆمەڵگادا دروستدەبێت. تاك پەیوەندی دروستدەکات لەگەڵ کەلتووری کۆمەڵگا، بەم جۆرە دەبێتە خاوەن ناسنامە. هەموو پێشکەوتنێکی تاك تەنها لە پەیوندی لەگەڵ کۆمەڵگادا دروستدەبێت. کاتێك کە دەڵێین زمان تەنها دەتوانێت پەیوەستبێت بە کۆمەڵگاوە (واتە هی کۆمەڵگابێت)





مەبەست ئەوە نییە کە زمان کەناڵێکە بەو واتایەی کە ئەزموونەکانی تاك تەواو تاکە کەسی و تایبەتین، ئەو تەنها پێوستی بە کەناڵێکی گشتییە تاوەکو بە هۆیەوە پەیوەندی دروستبکات لەگەڵ دەوروبەریدا. رۆڵی زمان زۆر گرنگترە لەمانە. راستییەکەی ئەوەیە کە لە لایەکەوە ئەزموونەکانی ئێمە لە روونکردنەوەمان بۆ رووداوەکان بە دەستدێن و تارادەیەکی زۆر بەستراوەتەوە بەو زەمینەیەوە کە لە کەلتووری ئێمەدا هەیە.

بەشێکی زۆری ئەزموونەکانی ئێمە لە دەرەوەی کۆمەڵگا بە شێوەیەکی گشتی مەحاڵە، چونکە بە زۆری پەیوەستە بە کۆمەڵە هۆشیارییەکەوە کە هەموو کۆمەڵایەتین، وەکو بەشداری کردن لە رێورەسمەکان و هاوبەشی لە ژیانی سیاسی و لایەنگری تیپی هەڵبژاردەی نیشتمانی و .... ئێمە دەتوانین نەریت و ئۆرگانەکانی کۆمەڵگا وەکو زمانێك تەماشا بکەین کە کۆمەڵە هزرێکی بنەڕەتییان پێ دروستدەکرێت. ئەم هزرانە ناتوانن تەنها وەکو چەند یەکەیەکی جیا لە یەك لە زەینی تاکەکاندا بن، بەڵکو میراتی هاوبەشی کۆمەڵگایە. دەتوانین بە یەك واتا لەگەڵ هیگڵدا بڵێین کە لە هەموو ئەمانەدا گیان یان عەقڵی کۆمەڵگا بە دیارکەوتووە. کاتێك کە هیگڵ ئەمانە بە گیان یان عەقڵی بە دیارکەوتوو ناودەبات مەبەستی ئەمەیە.

هەریەك لە ئۆرگانە کۆمەڵایەتی و گشتییەکان بەرجەستەیەکی گیان یان عەقڵن بەڵام لێرەوە دەوڵەت یان سیستەمی سیاسی کۆمەڵگا بەرجەستەیەکی کامڵتری گیان یان عەقڵە. تاك بەشێکی لاوازتری هەیە لە بەرجستەبوونی گیان یان عەقڵ بۆیە زۆرکات روودەکاتە شوێنکەوتنی غەریزە خاو و ناکامڵەکان. ئەگەر گیان (عەقڵ) لەباری شاراوەدا بێت لە تاکدا لەم حاڵەتەدا تاك دەبێتە کۆیلەی حەزەکانی و لە ئازادی دووردەکەوێتەوە. هەر وەك لە خستنەرووی بوچوونەکەی رۆسۆدا باسمانکرد ئازادی ئەوە نییە کە ئێمە ئازادی و سەربەخۆیی تەواومان هەبێت لە شوێنکەوتنی حەزەکانی خۆمان. لە جۆری بیرکردنەوەی رۆسۆ و کانت و هیگڵیشدا



شوێنکەوتنی حەزەکان ناخودرێساییە نەك خودرێسایی. لەم جۆرە بیرکردنەوەیەدا کاتێك تاك شوێن عەقڵی گشتی دەکەوێت، شوێن ویستی راستەقینەی خۆی کەوتووە و ئازادە. بەم جۆرە ئازادی بەواتای کرداری سەربەخۆ نییە لە هەڵبژاردنی نائاگایانەدا. ئازادی واتە ویستنی ئەوەی کە عەقڵانییە.

## مافی ملکەچ نەبوون

وەها جەختکردنەوەیەك لەسەر مەرجەعیەت و داب و نەریت و لایەنە عەقڵانییەکانی دامەزراوێك بەناوی دەوڵەت نابێت بەو ئەنجامگیرییە کۆتایی بێت کە هیگڵ خوازیاری ملکەچی رەهایە بۆ هەموو دەوڵەتێك و تاك دادەماڵێت لە هەر جۆرە بەرهەڵستیەك لە بەرامبەر دەوڵەتێکی ناداد پەروەردا. هیگڵ جەخت لەسەر پابەندبوون بەرێکوپێکی و ملکەچی بەرامبەر بە یاساکان دەکاتەوە بەڵام بەو مەرجەی کە یاساکانی دەوڵەت جەوهەری ئەخلاقی تاك بێت. هیگڵ سەبارەت بە کۆمەڵگای سەردەمی خۆی دەڵێت کە نایەکسانی نێو کۆمەڵگای مەدەنی سەردەمی ئێستا بەهای ئەرکی ملکەچی چینێکی بەر بڵاوی خەڵکی هەژار دەخاتە ژێر پرسیارەوە. جگە لەمەش دیار نییە کە بەردەوام یاساکان لەگەڵ چاکە و بەرژەوەندی گشتی خەڵکدا گونجاو بن. لە حاڵەتی نەگونجانی یاساکان لەگەڵ بەرژەوەندی راستەقینەی سەرجەم کۆمەڵگا ئەو کات بەرهەڵستی کردن لە بەرمبەریدا بەناوی بەرژەوەندی گشتییەوە، نەك بەرژەوەندی تاکە کەسی، رەوایە.[١٠] پەیوەندی نێوان تاك و دەوڵەت پەیوەندیەکی دوولایەنە و دیالێکتیکییە. دەوڵەت هاوکاری تاك دەکات کە خۆی بهێنێتەدی و لەولایەشەوە کامڵبوونی دەوڵەت بەستراوەتەوە بەوەدیهاتنی تاکەوە. دەوڵەت پێویستە بۆ بەدیهاتنی ئازادی مرۆڤ، هەروەك چۆن مرۆڤی ئازادیش پێویستە بۆ دەوڵەتی تەواو.





## لەخۆنامۆبوون (نامۆبوون)

پەیوەندی حاشاهەڵنەگری نێوان تاك وكۆمەڵگا و کەلتووری کۆمەڵگا کۆتایی بە بابەتی سەرهەڵدانی لە خۆنامۆبوون ناهێنێت. چەمکی نامۆبوون یان لەخۆنامۆبوون لە چەمکە گرنگەکانی هزری سیاسییە، گەرچی رۆسۆ خستیەڕوو، بەڵام بە نواسراوەکانی هیگڵ پەرەی سەند و گۆڕاو بۆ دوکترینێکی گرنگ لە هەندێ سیستەمی فەلسەفی پەیوەست بە فۆیەرباخ و کارل مارکس. لە بەشی بوونناسی تیۆریەکەی هیگڵدا لەو شوێنەی کە باسمان لە سێ بنەماکەی ئایدیا -سروشت- گیان (عەقڵ) کرد چەمکی لە خۆنامۆبوونمان خستەڕوو. لێرەدا لە روانگەی کەلتوور و مێژووەوە باس لە چەمکی لە خۆنامۆبوون دەکەین.

کاتێك لە خۆنامۆبوون دێتەپێش کە ئەزموونە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگا بێ واتا بن بەلامانەوە. کاتێك کە ئەو مەبەست و رێسا یان مەرامانەی کە ئۆرگان و کردارەکان پێناسەدەکەن وردەوردە بەبێ واتا و تەنانەت بە دوژمنیش بێتە پێش چاو ئەوکات لە خۆنامۆبوون سەرهەڵدەدات. ئەوەی لەم کۆبوونەوەیە دروستدەبێت ئەوەیە کە ئیدی تاك لە بنەڕەتدا ناسنامەی خۆی لەگەڵ ئەزموونی گرووپی کۆمەڵگادا پێناسە ناکات. لە وەها بارێکدا ئەو ئەزموونەی کە گرنگتر و واتادارترە بۆ تاك پاشەکشە دەکات بەرەو چوار چێوەی تایبەتی و ژیانی تاکە کەسی و بەرەو چوارچێوەیەك کە پەیوەست دەبێت بە حەز و دڵبەندە لاوەکییەکانی ئەوەوە نەك حەز و دڵبەندە گشتییەکانی ئەو.

هیگڵ لە مێژوو و کەلتووری رۆژئاوادا لە پەیدابوون و گۆڕان و هەلومەرجی لە ناوچوونی لە خۆنامۆبوون دەکۆڵێتەوە و بە شێوازی تایبەتی خۆی فۆرمبەندی دەکات. لەم بارەیەوە هیگڵ سێ بنەمایەکی دیالێکتیکی هەیە کە بریتین لە یەکێتی تاك و کۆمەڵگا لە یۆنانی کۆندا (تێز) داڕوخانی ئەم یەکێتییە و



پەیدابوونی هەستی ناشاد لە سەردەمی رۆم و مەسیحییەتدا (ئانتی تێز) و یەکێتی دووبارە لە فۆرمێکی بەرزتر لە سەردەمی مۆدێرندا (سەنتێز).

دەتوانرێت دەستپێکی پرۆسەی لە خۆ نامۆبوون بگەڕێنرێتەوە بۆ رووداوی داڕوخانی دەوڵەتشارەکانی یۆنان. لە دەوڵەتشارەکانی یۆناندا (هەروەك لە بەرگی یەکەمدا باسمان لێوەکرد) تاك خۆی لە هاوشێوە و یەکێتی تەواودا دەبینییەوە لەگەڵ ژیانی گشتیدا و ناسنامەی خۆی دەبەستەوە بە دەوڵەتشارەوە. بەها بنەڕەتییەکانی هاوڵاتی هەمان ئەو شتە بوو کە لە ژیانی گشتیدا رەنگی دەدایەوە. ئەمە باردۆخی سەردەمێك بوو لە مێژووی مرۆڤ کە هیگڵ لە شوێنی خۆیدا بە هۆی یەکبوونی تاك و کۆمەڵ و ژیانی تایبەتی و ژیانی گشتی رێزی لێدەگرێت.

بەڵام ئەم یەکبوونە سەرەڕای ئەوەی چەند لایەنێکی پۆزەتیڤی هەیە، بەڵام هێشتا یەکبوونی ئایدیالی و مەبەستدار نییە. هۆکارەکەی ئەوەیە کە یەکبوونی تاك و کۆمەڵ و کاری تایبەت و گشتی هێشتا ئاگایانە نییە و جگە لەمە لە راستیدا تاك لە کۆمەڵدا دەتوێتەوە. بۆ گەیشتن بە قۆناغی یەکبوونی ئاگایانە و یەکێتی دامەزراو لەسەر بنەمای تاکەکەسی، قۆناغێکی مێژووی نوێ دەستپێدەکات کە ئانتی تێزی قۆناغی یەکەمە. لە ماوەی ئەم قۆناغەدا گیان یان عەقڵ قۆناغێکی لە خۆ نامۆبوون تێدەپەڕێنێت. هیگڵ لە پرۆسەی مێژوودا قۆناغی مەسیحییەت بە پەیوەنددار دەبینێت لەگەڵ ئەم قۆناغەدا. لە قۆناغی مەسیحییەتدا کە قۆناغی لەخۆ نامۆبوونی عەقڵ یان گیانە لە پرۆسەی مێژووی مرۆڤدا یەکێتی تاك و کۆمەڵ و گشت و تایبەت دەگوازرێتەوە بۆ دنیای باڵا (بۆ ئاسمان). هیگڵ هەستی نامۆی ئەم قۆناغە ناو دەنێت بە هەستی ناشاد. لە مەسیحییەتدا لەو دیوی کۆمەڵگای سیاسیەوە بە دوای ئامانجە سیاسیەکانی خۆیدا دەگەڕێت (لە بەرگی یەکەمدا چەند ئاماژەیەکمان بۆ ئەم بابەتە هەبووە). هەروەك هیگڵ جەختی لەسەر دەکاتەوە مەسیحییەت لەو دیوی سنووری ژیانی رامیارییەوە بە دوای کەماڵی ئەخلاقی مرۆڤدا دەگەڕێت نەك لە ناو سنوورەکەدا.





له قۆناغی ڕێنیسانسدا سەردەمێکی نوێ دەستپێدەکات بە ناوی سەردەمی عەقڵ. لەم سەردەمەدا مرۆڤ دەگاتە ئاستێك لە گەشەکردن کە دەتوانێت چارەنووسی خۆی بە دەستەوە بگرێت و دەسەڵاتداربێت بەسەر چارەنووسی خۆیدا. لەم سەردەمەدا مرۆڤ دەتوانێت سیستەمێکی سیاسی نوێ دروستبکات کە یەکبوونی نێو کۆمەڵگا لەسەر بنەمایەکی نوێ بچەسپێت. لەم جۆرەی یەکبووندا و هەر لەم دنیایەدا پەیوەندییەکی بەرامبەر و دیالێکتیکی دروستدەبێت لە نێوان تاك و کۆمەڵدا. دەوڵەتی عەقڵانی پێگەی ئەم یەکبوونەیە و ئامرازی بەر قەراربوونی ئازادی خودئاگایە. لە باسەکەی خوارەوەدا سەبارەت بە دەوڵەتی عەقڵانی روون کردنەوەی زیاتر دەخەینەڕوو.

## تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتی عەقڵانی

دەوڵەتی عەقڵانی کە هیگڵ و بیرمەندانی هاوبیری ئەویان لە ژێر کاریگەری ئەو دەیخەنەڕوو، دەوڵەتێکە کە هیگڵ دەڵێت تیایدا مرۆڤ بە ئازادی و خود ئاگایی لە ئازادی دەگات و لە رووی تایبەتمەندییە سەرەکییەکانەوە هاوشێوەی دەوڵەتی ئایدیا لە تیۆریەکەی رۆسۆیە. بەر لەوە وتمان کە هیگڵ چەمکی دەوڵەتی بە سێ واتا بە کاربردووە. دەوڵەتی عەقڵانی هاووێنەیە لەگەڵ واتای دەوڵەتی ئەخلاقیدا. هیگڵ چەند زاراوەیەکی وەکو "دەوڵەتی کامڵ" و "دەوڵەتی مۆدێرن" یشی هەر بۆ ئەم چەمکەی دەوڵەت بەکاربردووە.

تا ئەو جێیەی کە پەیوەستدەبێت بە لایەنە سەرەکییەکانی سیستەمی سیاسیەوە سەرەکیترین دیارخەری دەوڵەتی مۆدێرن ئەوەیە کە لەسەر بنەمای بەشداری گشتی و هەمووانی دروستبووە. هیگڵ هەردوو چەمکی "گشتی" و "هەمووان"ی لە پاڵ یەکدا و بۆ مەبەستێکی تەکنیکی تایبەت بە کاربردووە. مەبەست لە بەشداری گشتی و هەمووانی ئەوەیە کە سەرەتا دەوڵەتی عەقڵانی لەسەر بنەمای بەشداری تەواوی هاوڵاتیان دروستدەبێت، پاشان هاوڵاتیان بۆ کارێکی گشتی، نەك بۆ



بەرژەوەندی تاکە کەسی رووداوەکانە بەشداری کردن. وەها بەشداریەك چەمکی راستەقینەی ئازادی هاوڵاتیان لە خۆدەگرێت. ئەگەر هاوڵاتیان بۆ بەرژەوەندی تاکەکەسی فۆرم یاخود کۆمەڵێك پێکبهێنن و بەشداری ئەوان تیایدا تەنها بۆ مەبەستی تایبەتی بێت ئەوا رەنگە لە رواڵەتدا بە پێی ویست و خواستی خۆیان جووڵابنەوە، بەڵام بەپێی پێداویستی ئازادی خۆیان نەجووڵاونەتەوە. هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئەگەر بەرهەمی کۆی ئەم بەشدارییە (بەشداری لە سەر بنەمای گەڕان بە دوای بەرژوەندی تاکە کەسدا) هاووێنەی بۆچوونەکەی ئەوان بێت ئەوا ناکۆك نییە لەگەڵ ئازادییەکەی ئەواندا بەڵام ئەگەر شتێکی تر بێت کە ئەوان لە بەشدارییەکی خۆیاندا نەیانویستووە لەم حاڵەتەدا ئازادنین و لەم بارەیەوە ئازادی خۆیانیان لە دەستداوە.

بەڵام کاتێك هاوڵاتی دەنگ بەشتێکی گشتی و هەمووانی دەدات ئەوا بەرهەمی دەنگەکە هەرچی بێت ناکۆك نییە لەگەڵ ئازادییەکەی ئەودا، چونکە ئەو کارێکی گشتی ویستووە و ئەنجامی دەنگی هاوڵاتییانیش هەرچی بێت گشتییە. کەواتە کاتێك کە کۆمەڵگایەك لەسەر بنەمای بەشداری گشتی بەڕێوە دەچێت ئەوا کۆمەڵگایەکی عەقڵانییە و دەوڵەتێك کە لەسەر ئەم بنەمایە ڕێکدەخرێت و کاردەکات دەوڵەتێکی عەقڵانییە. دەوڵەتی عەقڵانی لەسەر بنەمای ئازادی پۆزەتیڤ دامەزراوە لە کاتێکدا ئەو دەوڵەتەی کە لەسەر بنەمای سوودگەرایی بنیات نراوە لەسەر ئازادی نێگەتیڤ دامەزراوە.

## ئازادی و یاساکانی کۆمەڵگا

هیگڵ بڕوای وایە بۆ ئەوەی مرۆڤ ئازادی تەواوی هەبێت پێویستە ویستی خۆی بگۆڕێت بۆ ویستی عەقڵانی. پەیڕەویکردن لە ویستی رەها (خواستی بێ گوێدانە هەلومەرجی دەرەکی) ناگاتەوە بە ئازادی، چونکە حەزە جۆراوجۆرەکانی خودی تاك حەز و کردارەکانی خەڵکی لە کۆمەڵگادا چەند ئاستەنگێکی جۆراوجۆر





دروستدەکەن لە بەردەمیدا کە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی نائومێد بوونی ئەو. ئەگەر مرۆڤ بڕوای بە کۆمەڵە بەهایەك نەبێت و پەیڕەوی یاساگەلێگ نەکات کە بە گەڕانەوە بۆیان هەندێك بە حەزەکان بە لە پێشتردابنێت لەچاو هەندێکی تردا، ناتوانێت خواست و ویستێکی پایەداری هەبێت. پێویستە ئەو کەسانەی کە خوازیاری ئازادین خواستەکانی خۆیان لەگەڵ یەکتردا هاوئاهەنگ بکەن، ئەوکات بیگونجێنن لەگەڵ ویستی گشتیدا.

هیگڵ پێی وایە کە بەردەوام یاسا و پەیمانەکانی کۆمەڵگا هاوئاهەنگ بن، بەڵام بڕوای وایە بۆ ئەوەی ویستی تاك عەقڵانی بێت پێویستە هاوئاهەنگی دروستببێت لە نێوان سیستەمی ئەخلاقی و یاساییدا. بە بڕوای هیگڵ مێژووی مرۆڤ لە ڕەوتی بەرەوپێش چوونی خۆیدا لە پێشرەوییەکی بەرادەوام دایە بەرەو دروستکردنی هاوئاهەنگی لە نێوان ویستە عەقڵانییەکان و ویستی گشتیدا.

مرۆڤی ئازاد مرۆڤێکە کە وەکو ئەندامی کۆمەڵگای سیاسی بتوانێت مامەڵە لەگەڵ یاساو پەیمانەکانی کۆمەڵگادا بکات، بەشدارییکات لە دانانی ئەم یاسایانەداو بە لە بەرچاوگرتنی چارەنووسی گشتیش هەموو ئەمانە بەئەنجام بگەیەنێت. وەها هەلومەرجێك لە کۆمەڵگای مۆدێرندا دەگاتە ئەو پەڕی کامڵبوونی خۆی. لە کۆمەڵگا پێش مۆدێڕنەکاندا (نەریتی) لە ڕووی نەریتەوە یاساکان و پەیمانەکان پەسەند دەکرێن هێشتا ئازادی بەدینەهاتووە. ئازادی بە واتای ژیان بەسەر بردنە، بەپێی ئەو بنەمایانەی کە ڕەخنەگرانە لێکۆڵینەوەیان لە سەرکراوە و ئاگایانە پەسەندکراون.



**پەراوێزەکان:**

1- Charles Taylor, Hegd, London, New York, Cambridge University press, 1975, p.389.

٢- ئمانوئیل کانت، پێشوو.

3- Jason Caro, Looking over yours shoulder: The on lookers of Hegels phenomenology political studies, 1977 XLV, p 914-927.

٤- حسین بشریه، "عقل درسیاست" در دولت عقل، تهران، نشر علوم نوین، ١٣٧٤، ص ٤٥.

٥- جان پلامناتز، فلسفه اجتماعی و سیاسی هگل، ترجمه حسین بشیریه، تهران، نشرنی، ١٣٧٦، ص ١٧٤.

٦- و. ت. ستیس، فلسفه هگل، ترجمه حمید عنایت، جلد دوم، تهران، شرکت سهامی کتابهای جیبی، ١٣٧٧، ص ٥٧١.

7- Wilhelm Friedch Hegel, Philosophy of Right Eng. Trans. T.M. Knox, Albany, state University of New York 1979, p.222, Sect 359.

٨- و. ت. ستیس، پێشو، ص ٥٩٢.

٩- فردریك کاپلستون، تاریخ فلسفه، جلد هشتم، ترجمه بهاءالدین خرمشاهی، تهران، انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٧٦، ص ١٩٧.

١٠- ژان هیپولیت. پەیدارشناس روح برجسب نظر هیگل، ترجمه کریم مجتهدی، تهران، انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٧١، ص ٩٢.





# پاژی -٩-

# کارل مارکس

# Karl Marx

## پێکەوە بەستنی هەمەلایەنی هزری سیاسی و ئامانجە مرۆڤگەراییەکان

### ژیان و بەرهەمەکانی مارکس

کارل مارکس (١٨١٨-١٨٨٣) یەکێکە لە گەورەترین بیرمەندانی بوارە جیاوازەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، لەوانە ئابووری و سیاسی و کۆمەڵناسی. لە شاری رینلەندی ئەڵمانیا کە ئەو کات بەشێك بووە لە دەوڵەتی پرۆس لە دایکبووە. دایك و باوکی لە بنەڕەتدا جوولەکە بوون و پاشتر چووبوونە سەر ئاییینی مەسیحی. مارکس لە زانکۆی بۆن و بەرلین دەستی بە خوێندنکرد و دکتۆرای وەرگرت لە فەلسەفەی کلاسیکدا. لەو کاتەی کە قوتابی زانکۆ بوو دەستی بە چالاکی سیاسی کرد و تا دوایین رۆژەکانی ژیان بەڵێنی زانستی و شۆڕشگێڕی پێکەوە بەرەو پێش برد. سەرەتا لە ساڵی ١٨٤٣ وەکو رۆژنامەنوس و پاشان وەکو سەرنوسەرری رۆژمانە دەستی بە کارکرد. لە ساڵی ١٨٤٤ بە هۆی پەیوەندی لەگەڵ کۆڕ و کۆبوونەوە شۆڕشگێڕییەکان کەوتە ژێر چاودێرییەوە و پاشان بەرەو پاریس هەڵات. لە پاریس فردریك ئەنگلسی ناسی کە ئەویش یەکێك بوو لە لاوە شۆڕشگێڕ و رادیکاڵەکان و لەوە بەدواوە دۆستایەتی و هاوکاری نێوانیان تا کۆتایی تەمەنی مارکس درێژەی هەبوو.



مارکس و ئەنگلس کە پەیوەندییان هەبوو بە کۆڕ و کۆمەڵی لایەنگرانی سۆسیالیزم لە ساڵی ١٨٤٧ بڵاوکراوەی "مانیفستی کۆمۆنیست" یان بڵاوکردووە. لە ساڵی ١٨٤٨ زنجیرە شۆڕشێك لە ئەوروپا بەرپا بوو. مارکس لە کاتی شۆڕشەکەدا گەڕایەوە بۆ ئەڵمانیا، بەڵام پاش سەرنەکەوتنی شۆڕشەکە لە ئەڵمانیا دوورخرایەوە و پاشماوەی تەمەنی خۆی لە لەندەن بەسەربرد. لە لەندەن سەرەڕای پاراستنی پەیوەندی خۆی لەگەڵ چالاکییە شۆڕشگێڕییەکان زۆرترین کاتەکانی خۆی بۆ لێکۆڵینەوە تەرخانکرد بە مەبەستی نووسینی کتێبی "سەرمایە" لە سێ بەرگدا کە لەسەردەمی ژیانی خۆیدا تەنها بەرگی یەکەمی بڵاوکرایەوە و دوو بەرگەکەی تر، ئەنگلسی هاوڕێی بڵاوی کردەوە. مارکس لە بەریتانیادا ژیانێکی سەختی بەسەربرد بە هۆی هەژارییەوە چوار منداڵەکەی خۆی لە دەستدا. داهاتی ژیانی لە رێگای نووسینی وتار بۆ رۆژنامەکان و یارمەتییەکانی ئەنگلسەوە (کە سەرەتا زۆر نەبوو) دابین دەبوو. کاتێك کە ئەنگلس توانی یارمەتییەکی زۆرتری بدات تەواوی توانای خۆی تەرخانکرد بۆ نووسین و لێکۆڵینەوە. بەم حاڵەشەوە کتێبی سەرمایە بە ناتەواوی مایەوە و مارکس نەیتوانی چەند بەشێکی تیۆریەکەی خۆی فراوان بکات و بەدرێژی باسی لێوەبکات.

نووسینە گرنگەکانی مارکس بریتین لە: دەستنووسە ئابووری و سیاسیەکان (١٨٤٤)، چەند تێزێك دەربارەی فۆیەرباخ (١٨٤٥)، ئایدیۆلۆژی ئەڵمانی (١٩٤٦)، مانیفستی کۆمۆنیست (بە هاوکاری ئەنگلس-١٨٤٧)، بنەماکانی رەخنەی ئابووری سیاسی (١٨٥٤)، شەڕی چینایەتی لە فەرەنسا (١٨٤٨)، هەژدە برۆمەری ناپلیۆن پۆناپارت (١٨٥٢) و سەرمایە. بەشێکی زۆری ئەو دوکترینانەی کە مارکس لەم نووسینانەدا پەروەردەی کردوون هێشتا زیندوون لە بوارە جیاوازەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا و هەندێکی تری بە توندی بوونەتە بابەتی باس و مشتومڕ لەسەر کردن.





## ١- تێڕوانینێکی گشتی بۆ بنەماکانی هزری مارکس

### بەیاد هێنانەوەیەکی گرنگ

بەر لە هەموو باسێك دەربارەی هزری مارکس پێویستە باس لە خاڵێك بکەین، ئەویش ئەوەیە کە مارکس و ئەنگلس پەیوندییەکی هزری و ئەدەبی نزیکیان بەیەکەوە هەبوو بەشێکی زۆری ئەو شتانەی کە دەدرێنە پاڵ مارکس لە کارتێکردنەکانی ئەنگلسەوە بە دوورنین. جیاکردنەوەی ئەو شتەی کە تایبەتە بە یەکێك لەوان کارێکی زۆر ئاسان نییە. جگە لەمە ئێمە سوریش نین لەسەر ئەم جیاکردنەوەیە. لەم بەشەدا زیاتر باس لە روداوێکی هزری دەکەین بەناوی مارکسیزم کە ئەنگلسیش تیایدا بەشدارە. بەڵام دەبێت ئەوەیش بڵێین کە ئەنگلس (١٨٢٠-١٨٩٥) بەراشکاوی رایگەیاندووە کە هزری سەرەکیی نووسینەکانی ئەو و مارکس هی مارکس بووە. لەگەڵ ئەمەشدا ئێمە هەوڵمان داوە کە لەم نووسراوانەدا تا ئەو جێیەی کە دەگونجێت مارکسیزم لە سنووری دوکترینە سەرەکییەکانی مارکسدا رابگرین و زیادکردنەکانی بیرمەندە مارکسیستەکانی دیکەی تێکەڵ نەکەین. کامڵبوونی مارکسیزمی پاش مارکس بۆ خۆی گفتوگۆیەکی دوور و درێژ هەڵدەگرێت کە لە بەرگی پاشتردا باسی لێوەدەکەین.

### نامۆ بوون و گەڕانەوە بۆ خود

ناوەرۆکی سەرەکی پرۆژەکەی مارکس بەشێوەیەکی چڕوپڕ لە نامیلکەی مانیفێستی کۆمۆنیستدا هاتووە. هەموو نوسینەکانی مارکس پەیوەندییەکی هەمەلایەنەیان هەیە لەگەڵ بەڵێنی شۆڕشگێڕانەی ئەودا کە خوازیاری گۆڕانی سیستەمی سەرمایەدارییە بۆ سیستەمێکی عەقلانی تر واتە سیستەمی سۆسیالستی و سیستەمی کۆمۆنیستی. مارکس تیۆریداڕێژی، بەڵێنی سیاسی و چالاکی شۆڕشگێڕی پێکەوە گرێ دابوو. ئەم کارە لە دروشمە ناسراوەکەشیدا هەستی پێ



دەکرێت:"تا ئێستا فەیلەسوفەکان بە چەند شێوەیەکی جۆرا و جۆر کەوتوونەتە لێکدانەوەی جیهان، لە کاتێکدا کە کێشەکە بریتییە لە گۆڕینی جیهان". مارکس کە پەیوەندی هەبووە لەگەڵ هیگڵیە لاوەکان و کەسە چالاکەکانی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان، کاری سەرەکی زانستی خۆی بەکتێبی دەستنووسە ئابووری و فەلسەفییەکان[1] دەستپێکرد. بەشێوەیەکی سروشتی ئەم کتێبە پەیوەندی هەیە لەگەڵ سەرگەرمییەکانی ئەم دەستەیەی شوێنکەوتوانی نەریتی هیگڵی. بابەتی سەرەکی ئەم کتێبە(کە لە هەمان کاتدا چڕکراوەیەکی بەشی سەرەکی تیۆریەکانی مارکسە) بریتییە لە نامۆبوون (یان بە چەند زاراوەکی تر"لە خۆ نامۆ بوون"یان"لە خۆبێگانە بوون"). مارکس لەم کتێبەدا بەشێوازی دیالێکتیکی هیگڵی باس لەوەدەکات کە چۆن لابردنی مۆڵکداری بە کۆمەڵ و دروستبوونی موڵکداری تایبەتی بووەتە هۆی سەرهەڵدانی نامۆبون و لە دەستچۆنی سروشتی جۆری مرۆڤ و چۆن پێویستە کە لابردنی موڵکداری تایبەتی ببێتە هۆی لەناوبردنی نامۆبوون و گەڕانەوە بۆ سروشتی جۆری مرۆڤ لە بارێکی بەرزتردا. ئەگەر بمانەوێت لە شێوازی دیالێکتیکی وردبینەوە پێویستە بڵێین کە لەم گێڕانەوە گەورە و سەرتاسەریەی مێژووی ئێمەدا جارێك باس لە لابردنی سروشتی جۆری مرۆڤ و دروستبوونی موڵکداری تایبەتی هەلومەرجی بەرهەمهێنان و سەرهەڵدانی نامۆبوون دەکەین و جارێکی تر باس لە لابردنی موڵکداری تایبەتی و روخسارەکانی نامۆبوون دەکەین بۆ گەڕانەوەی دووبارە بۆ سروشتی جۆری مرۆڤ لە قۆناغێکی بەرزتردا.

### زەرورەتی مێژوویی

مارکس تەواوی ئەم پرۆسەیە بەپێویست و هاووێنەی یاسامەندی و لۆژیکێکی تایبەتی لە مێژوودا شی دەکاتەوە. دەرچونی مرۆڤ لە قۆناغی کۆمەڵگای هاوبەشی یەکەم و لە موڵکداری بەکۆمەڵەوە بۆ کۆمەڵگای چینایەتی و دامەزراو لەسەر موڵکداری تایبەتی و هاورێ لەگەڵ ئەمانەش چەندین جۆر پێشهاتی لە خۆ نامۆ





بوون و چەوسانەوە و ستەم و شەڕو تەماحکاری و دووركەوتنەوە لە سروشتە مرۆییەکان زەرورەتێکی مێژوویی بووە. مرۆڤ بوونەوەرێکی بەرهەمهێنەرە و جەوهەری مرۆیی خۆی لە بەرهەمهێنان و روبەڕوبوونەوەی سروشت(وەکو مەیدانی بەئاکام گەیاندنی بەرهەم) بەدەستدێنێت. دەرچوونی مرۆڤ لە کۆمەڵگای هاوبەشی یەکەم بەهەموو پێشهاتە ناخۆشەکانییەوە و بۆ چەسپاندنی زووبەزووی مرۆڤ لە بەرامبەر سروشتدا وەکو بوونەوەرێکی بەرهەم هێنەر بەناچاری بووە.

لەقۆناغی دروستبوونی موڵکداری تایبەتیدا توانای بەرهەمهێنانی مرۆڤ زۆر زیاتر لە جاران گەشە دەکات. بەگەشەکردنی توانای بەرهەمهێنان، هاوکات لەگەڵیدا پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی مرۆڤیش یەك لە دوای یەك قۆناغە مێژووییەکان تێدە پەڕێنێت و لەسیستەمە ئاسیایی و کۆیلایەتی و فیودالییەکانەوە دەگاتە قۆناغی سەرمایەداری. لە قۆناغی سەرمایەداریدا گەشەی تواناکانی بەرهەمهێنانی مرۆڤ دەگاتە بەرزترین ئاستی خۆی. هەروەها لەم کۆمەڵگایەدا نامۆبوونی مرۆڤیش بە توندترین باری خۆی دەگات. مرۆڤ دەتوانێت لەسەر بنەمای ئەو پێداویستییانەی کە ئەم قۆناغەی کامڵبوونی بەرهەم و مێژووی مرۆڤ فەراهەمی کردووە، هەنگاوێکی تر بەرەوپێشەوە بڕوات و بچێتە ناو قۆناغێکی نوێیٚ مێژووی خۆیەوە. لە راستیدا هەموو مێژووی رابردووی مرۆڤ لەبەرامبەر ئەم قۆناغەدا بە"بەر لە مێژوو" ی مرۆڤ دادەنرێت.

## بنەمای ئابوریی وەرچەرخان

بەشێکی زۆری لێکۆڵینەوەکانی مارکس پەیوەستە بەبواری ئابوورییە لەم بوارەدا میراتگری ئابووریناسە کلاسیکەکان و تەواوکەری کاری ئەو

مارکیس بەرهەمهێنان و کەرەستە مادییەکانی ژیانی بەتوانا
جووڵێنەری مێژوو دادەنا و بەپێی ئەو روونکردنەوانەی کە لەباسەک
دەیخەینە روو و جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکاتەوە کە مێژووی مرۆ

بەشە سەرەکییەکانی هزری مارکس.



تەوەرە بەرەوپێشەوە هەنگاو دەنێت کە بەرهەمهێنانی مرۆڤ رێکدەخات. بەشێکی گرینگی ژیانی مارکس لە پێناو لێکۆڵینەوە بۆ بەرژەوەندییەکانی کتێبی سەرمایە و نوسینی کتێبەکە بەسەر چوو.

مارکس لەم کتێبەدا هەم باس لە میکانیزمی سیستەمی سەرمایەداری دەکات و هەم رەنگدانەوە سەرەکییەکانی نامۆبوونی ئەم کۆمەڵگایە(جیابوونەوەی بەرهەمهێنەرە-کرێکار- لە بەرهەمی کارەکەی خۆی) لەوانە"زێدەبایی" و"چەوسانەوە"و رکەبەری بەردەوام دەخاتەڕوو.

## کۆمەڵگای یۆتۆپیایی کۆمۆنیستی

مارکس هەموو ئەم زانست و دەستکەوتە گەورانە دەبەستێتەوە بە ئامانجی تێپەڕین بەرەو کۆمەڵگایەکی بەرزتر. لەم کۆمەڵگا بەرزترەدا کە پێویستە بەخەباتی هۆشیارانەی پرۆلیتاریا (چینی کرێکاری پیشەسازی) دروستبکرێت، هەموو فۆرمەکانی لەخۆ نامۆبوون و پێشهاتە جۆرەکانی کە سەرچاوەی بەدبەختی مرۆڤن لەناودەچن. بۆ دروستکردنی ئەم یۆتۆپیایە. پێویستە لە قۆناغێکی ناوەندییەوە کە بە سۆسیالیزم ناودەبرێت و تیایدا دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا کۆمەڵگا بۆ تێپەڕ بوون لەم قۆناغە رێکدەخات. درێژەی ئەم باسە چڕە لە باسەکانی پاشتردا دەخەینەڕوو.

دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە کۆمەڵەی هزریی مارکس بخەینەڕوو:

۱- **ووریی سیاسی:** کە ئەمانە لەخۆدەگرێت: دوکترینەکانی کار وەکو سەرچاوەی بەها و زێدەبایی و چەسپانەندنەوە و قەیرانەکانی سەرمایەداری.

۲- **ریالیزمی مێژوویی:** پەیوەستە بە یاسامەندی کامڵبوونی مێژوویی کۆمەڵگاو دوکترینەکانی بەرهەمهێنان و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و لایەنی بەرهەمهێنان و فۆرمبەندی ئابووری کۆمەڵایەتی و ژێرخان و سەرخان

**۳- سۆسیالیزمی زانستی:** کە ئەم جۆرە باسانە لە خۆدەگرێت: خەباتی چینایەتی و بنەماکانی بزووتنەوەی سوسیالیستی و ئامانجی کۆمەڵگای کۆمۆنیستی.

۱- ئابووری سیاسیی ئینگلیز و ئادەم سمیت و ریکاردۆ

۲- ئایدیالیزمی ئەڵمانی- هیگل

۳- سۆسیالیزمی فەرەنسی

## ۲- مرۆڤ، سروشت و بەرهەمهێنان

### تێڕوانینی مارکس بۆ مرۆڤ

بنەمای تیۆرەکەی مارکس سەبارەت بە مێژوو و کۆمەڵگا بریتییە لە تێڕوانینی ئەو بۆ مرۆڤ. تێڕوانینی مارکس لە تێڕوانینی بۆ پێداویستییەکانی مرۆڤەوە دەستپێدەکات. مارکس لە یەکەمین بەرهەمەکانی خۆیدا (لەوانە لە دەستنووسە ئابووری و فەلسەفییەکان) دەنووسێت کە مرۆڤ لە هەنگاوی یەکەمدا بوونەوەرێکی سروشتیە. وەکو بوونەوەرێکی سروشتی لە لایەکەوە خاوەن زنجیرەیەك توانای پەیوەست بە ژیانە لە وانە حەزەکان و ئارەزووی خواردن و غەریزە، لە لایەکی ترەوە بوونەوەرێکی پشتبەستوو بە ئەویدیکە و سنووردارە. بەو واتایەی کە بابەتی حەزو ئارەزووی خواردن و غەریزەکەی دەکەونە دەرەوەی خۆی و لە جیهانی دەرەکیدان. مرۆڤ تاکە بوونەوەرێکە کە بۆ دابینکردنی ئەم پێداویستیانە خەریکی بەرهەمهێنانی دەبێت، بەو واتایەی کە سروشت بۆ پێداویستییەکانی خۆی دەگۆڕێت. بەم جۆرە رووبەڕووبوونەوەی سروشت یەکەمین رووبەڕووبوونەوەی مرۆڤە. گیانداران تەنها بەبوونی خۆیان لە سروشتدا چەند گۆڕانێکی تیادا



ئەنجامدەدەن (خواردنی گیا و لق و پۆپی دارەکان و خواردنی یەکتر). بەڵام مرۆڤ سروشت بۆ بەرهەمهێنانی کەرەستەکانی ژیان دەگۆڕێت. بەم واتایە مرۆڤ تاکە بوونەوەرێکە کە کاردەکات.

مرۆڤ لە پرۆسەی هەوڵدانی گۆڕینی سروشتەوە بۆ دابینکردنی کەرەستەکانی ژیان خۆی وەکو بوونەوەرێکی بەرهەمهێنەر دەبینێت. مرۆڤ بە کاری خۆی، خۆی دەکاتە مرۆڤ. بە واتایەکی تر کاری خودی مرۆڤە کە مرۆڤی دروستکردووە. مرۆڤ لە پرۆسەی هەوڵی داهێنەرانەدا خۆی لە بەرامبەر سروشتدا دەبینێتەوە و لەم رێگەیەوە دەگاتە خودئاگایی و ناسینی خۆی. مرۆڤ کە خۆی لە سروشتەوە لە دایکبووە لە سروشتەوە گەشەی کردووە، لە رووبەڕووبوونەوەی ئەویشدا لایەنە مرۆییەکانی خۆی تەواو دەکات. ئاسۆی هۆشیاری مرۆڤ لە لایەکەوە لە پێکەوەبوونی لەگەڵ سروشتدا و لە لایەکی ترەوە لە رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ سروشتدا دروستبووە.

### بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی

بەرهەمهێنان بەشێوەی تاکە کەسی نایەتەدی. هەر لەسەرەتاوە بەرهەمهێنان ناوەرۆکێکی بە کۆمەڵی هەیە. گرووپە مرۆییەکان کاری بەرهەمهێنان دەکەن. کەواتە مرۆڤەکان لەهەمانکاتی پرۆسەی گۆڕینی سروشت بۆ پێداویستییەکانی خۆیان پەیوەندییەکیشیان هەیە لەگەڵ یەکتردا. بەواتایەکی تر بەرهەمهێنان لەناو رێکخراوێکی کۆمەڵایەتیدا دروستدەبێت تەنانەت ئەگەر ئەم رێکخراوە کۆمەڵایەتییە سەرەتا لەسەر تەوەری خاڵی خوێن و رەچەڵەك بسوڕێتەوە. بەهەرحاڵ مرۆڤەکان لە کاتی بەرهەمهێنان و رووبەڕووبوونەوەی سروشتدا چەند پەیوەندییەکیشیان هەیە لەگەڵ یەکتردا. ئەم پەیوەندیانەیش چەسپاونین بەڵکو لەگەڵ پرۆسەی پێشکەوتنی بەرهەمدا دەگۆڕێن. لە تێڕوانینێکی گشتیدا سروشتی پەیوەندییەکانی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردا پەیوەندی هەیە بە ئاستی زاڵبوونیان





بەسەر سروشتدا. هەرچی توانای بەرهەمهێنانی مرۆڤ بەرزتردەبێتەوە جۆری ئەو پەیوەندییەی کە لەناو ڕێکخراوە کۆمەلآیەتییەکەدا دروستدەبێت بەرەو ئاستێکی بەرزتر هەلّدەکشێت.

بەم جۆرە مێژوو بریتییە لە هەموو ئەو گۆڕانە یەك لە دوای یەکانەی کە لە ڕێکخراوی کۆمەلآیەتی یان سیستەمە کۆمەلآیەتییەکاندا دروستدەبێت. هاوکات لەگەلْ پێشکەوتنی توانای بەرهەمهێنانی مرۆڤدا کە بە هێزەکانی بەرهەمهێنان ناودەبرێت چەند گۆڕانێك لە ڕێکخراوی کۆمەلآیەتیدا کە بە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان ناودەبرێت دروستدەبێت. بۆیە سیستەمە مێژووییە زنجیرە ئاساکان یەك لە دوای یەك مرۆڤ دەگۆڕن و بەرەو پێشەوەی دەبەن. یەکەمین سیستەمی کۆمەلآیەتی سسیستەمی کۆمونەی سەرەتاییە کە هاووێنەی نزمترین توانای بەرهەمهێنانی مرۆڤە. سیستەمی دواتر سیستەمی ئاسیاییە لە ڕۆژهەلآت و سیستەمی کۆیلایەتی لە ڕۆژئاوا کە هاوکاتە لەگەلْ پایەیەکی نوێی گەشەی توانای بەرهەمهێنان و پەیوەندیگەلێکی بەرهەمهێنانی گونجاو لەگەلْ ئەودا. سیستەمی فیودالّی قۆناغێکی نوێ و پێشکەوتووترە لە سیستەمی کۆیلایەتی و پاشان سیستەمی سەرمایەداری قۆناغێکی پێشکەوتووترە لە چاو ئەویشدا. ئەم سیستەمانە بە یاسا ناوەکی و پێویستەکانی خۆیان دروستدەکەن و شوێنی خۆیان دەدەنە ئەوی دواتر. لە باسی ماتریالیزمی مێژوویدا ڕوونکردنەوەیەکی زیاتر لەم بارەیەوە دەخەینە ڕوو.

### لە پێشتر بوونی

### وجود بەسەر هەستدا

مارکس لە شێوازی دیالێکتیکدا یەکێك بوو لە قوتابییەکانی ڕێبازی هیگلْ. هەلّبەتە مارکس بە شێوەیەکی نوێ کە تایبەت بوو بە خۆی شێوازی دیالێکتیکی بەکارهێنا. بۆچوونەکەی مارکس بە ماتریالیستی ناودەبرێت، لە کاتێکدا کە



مارکس بۆچوونەکەی هیگلْ بە ئایدیالیستی ناو دەبات. چەمکی ئایدیالیستی بوونی بۆچوونەکەی هیگلْ ئەوەیە کە لە کۆمەلّەی هزریی هیگلّدا، هەروەك بینیمان گیان یان عەقلّێکی ڕەها هەیە (ئایدیا) کە لە سروشت لە خۆنامۆ دەبێت و لە کۆمەلّگای مرۆییدا بە خودئاگایی دەگات. فۆیەرباخ کە یەکێکە لە هیگلّیە لاوەکان لە سالّی ١٨٤١ دا کتێبێکی بلآوکردەوە بە ناونیشانی "جەوهەری مەسیحیەت" کە زۆر لە لایەن هیگلّیە لاوەکانەوە گرنگی پێدرا. فۆیەرباخ لەم کتێبەدا ڕەخنە لە ڕوانگە ئایدیالیستییەکەی هیگلْ دەگرێت و دەلّێت کە ئەم گیانە ڕەهایە یان عەقلّە ڕەهایە شتێك نییە جگە لە خودی مرۆڤ کە بەسەر شانی سروشتەوە ڕاستاوە.

فۆیەرباخ تیۆریی نامۆبوونی خۆیشی لەسەر ئەم بناغەیە بنیات ناوە. دەیوت کە لە ڕاستیدا خودا ڕەنگدانەوەی وزەی خودی مرۆڤە کە لە خەیالْ و وێناکاندا لەو نامۆبووە و بەسەر ئەو دیوی مرۆڤدا ڕەنگی داوەتەوە. مارکس لە شوێنی خۆیدا سەرەڕای پاراستنی ناوەڕۆکە ماتریالیستیەکەی فۆیەرباخ ڕەخنە لە تیۆریی نامۆبونەکەی دەگرێت کە لە بنەڕەتدا لەسەر بنەمای ئایین بوو و نامۆبوون بە ئەنجامی جیاکردنەوەی بەرهەمهێنەر لە بەرهەمی کارەکەی خۆی لە پڕۆسەی بەرهەمهێنانی کۆمەلآیەتیدا دادەنێت. مارکس شێوەی بەرهەمهێنانی ژیانی مادی مرۆڤ بە دیارخەری تایبەتمەندی سەرەکی پڕۆسە کۆمەلآیەتی و سیاسی و هزرییەکان دادەنێت و بەم پێیە دەلّێت کە ئەم بوونە کۆمەلآیەتییە هۆشیاری یان هەستی کۆمەلآیەتی مرۆڤ بەدیاردەخات. ئایدیالیستەکان ئەم هاوکێشەیە پێچەوانە دەکەنەوە و دەلّێن کە هۆشیاری یان هەستی کۆمەلآیەتی مرۆڤ، بوونی ئەو یاخود شێوەی بوونی ئەو بەدیاردەخات.





## ٣- ماتریالیزمی مێژوویی و ئابووری سیاسی

### فۆرمبەندی ئابووری-کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا

ماتریالیزمی مێژوویی شێوەیەکی شیکردنەوە و راڤەکردنی مێژوو و پرۆسەکان و پێکهاتەکانی کۆمەڵگا و یاسامەندییەکانیەتی کە بناغەی تێڕوانینی خۆی لە سەر لە پێشتری بوون بەسەر هەستدا دادەمەزرێت. مارکس و ئەنگلس وەکو کاردانەوەیەك بەرامبەر بە ئایدیالیزمی باوی سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم، بە تایبەتی ئایدیالیزمی هیگڵ ماتریالیزمیان دامەزراند. لەسەرەتاکانی سەدەی حەڤدەیەمدا بیرمەندانی ئەوروپا دابەشدەبوون بۆ دوو دەستەی سەرەکی: هەندێك کە دەیانووت جیهان شتێك نییە جگە لە مادەیەکی فیزیکی و لە بەرامبەر ئەمانەیشدا هەندێکی تر کە پێیان وابوو زەین رۆڵێکی سەربەخۆی هەیە. هۆبز لە دیارترین نوێنەرانی دەستەی یەکەم و هیگڵیش ناسراوترین بیرمەندانی دەستەی دووەم بوو.

مارکس لە بەرامبەر ئایدیالیزمی هیگڵدا سەرهەڵدەبرێت و دەڵێت کە لێکۆڵینەوەکانی بەو ئەنجامەیان گەیاندووە کە ناتوانرێت بە کامڵبوونی گشتی زەینی مرۆڤ فۆرمەکانی دەوڵەت و پەیوەندییە یاساییەکانی کۆمەڵگا روون بکرێتەوە، بەڵکو دەبێت لەناو هەلومەرجی مادی ژیانی مرۆڤدا بە دوای رەگ و ریشەیاندا بگەڕێین. هەستی مرۆڤ بوونی ئەو (مرۆڤ) دیاری ناکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە بوونی مرۆڤ هەستی ئەو (مرۆڤ) دروست دەکات. پاشتر ئەنگلس ئەم بۆچوونەی فراوان کردەوە بۆ تەواوی بوون ماتریالیزمی دیالێکتیکی دروستکرد. بەڵام لە بنەڕەتدا پڕۆژەکەی مارکس مرۆڤگەرایانە بوو و سەرنجی دەدایە سەر بارودۆخی مرۆڤ.

مارکس لە (پێشەکی بنەماکانی رەخنەی ئابووری سیاسی)[٢]دا بەم جۆرەی خوارەوە بنەماکانی بۆچوونی خۆی لە شیکردنەوەی مێژوو و کۆمەڵگادا دەخاتە روو:



مرۆڤەکان لەبەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی خۆیاندا دەچنە ناو چەند پەیوەندییەکی دیاریکراوەوە لەگەڵ یەکتردا کە بە شێوەیەکی ناچار و سەربەخۆ لە ویستی ئەوان. ئەم پەیوەندییانە کە بە پەیوەندی بەرهەمهێنان ناودەبرێت پەیوەندییان هەیە بە قۆناغێکی دیاریکراوی گەشەکردن و کامڵبوونی توانا مادییەکانی بەرهەمهێنان. کۆی هەموو ئەو پەیوەندییانەی بەرهەمهێنان بنیاتی ئابووری کۆمەڵگا دروستدەکات. ئەم بنیاتە ئابوورییە بریتییە لە بناغە یان ژێرخانی راستەقینە کە سەرخانی سیاسی و یاسایی کۆمەڵگا لەسەر ئەو دادەمەزرێت و فۆرمە دیاریکراوەکانی هۆشیاری کۆمەڵایەتی لەگەڵیاندا هاوجۆر دەبێت. شێوەی بەرهەمهێنانی ژیان دیارخەری سەرەکی تایبەتمەندییە بنەڕەتییەکانی پرۆسە کۆمەڵایەتی و سیاسی و هزرییەکانە. کاتێك کە دەڵێین هەست لە لایەن بوونەوە دیاریدەکرێت هەر مەبەستمان ئەمەیە.

مارکس بە درێژی ئەم شێوازبەندیەی روون نەکردووەتەوە، بەڵام دەتوانین بە شێوەیەکی گشتی بەم جۆرە بۆچوونەکەی روون بکەینەوە کە فۆرمبەندی ئابووری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا خاوەن ژێر خانێك و سەرخانێکە. ژێرخان یاخود بنیاتی ئابووری کۆمەڵگا کە بە دەربڕینێکی تر شێوەی بەرهەمهێنانی مادی یان لایەنی بەرهەمهێنانیشی پێدەوترێت، بە شێوەیەکی گشتی ئەمانە لەخۆدەگرێت:

أ- "هێزە مادییەکانی بەرهەمهێنان" و ب- "پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان". لەسەر ئەم ژێرخانە یان بەواتایەکی تر بنیاتی ئابووری، سەرخانێك دروستدەبێت کە هۆشیاری کۆمەڵایەتی و سیاسی و یاسایی لەخۆ دەگرێت. ئەم هۆشیارییە یان سەرخانە هاووێنەیە لەگەڵ بنیاتی ئابووری یان ژێرخاندا. بە واتایەکی تر جۆر و تایبەتمەندی ئەو پەیوەندییە سیاسی و یاساییەی کە مرۆڤەکان لە نێوان خۆیاندا دروستی دەکەن بەستراوەتەوە بە بەرهەمهێنانی مادی کۆمەڵگاوە.

مرۆڤ بۆ ئەوەی بژیت لە هەنگاوی یەکەمدا دەبێت بخوات و بخواتەوە و لە بەربکات و سەر پەنایەکی هەبێت. بۆ هەموو ئەمانە پێویستە کاربکات و بەرهەمی هەبێت.





بۆیە کارو بەرهەمهێنان لایەنی سەرەکی ژیانی مرۆڤن. لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا چەند پەیوەندییەك لە نێوان مرۆڤەکاندا دروستدەبێت. جۆری ئەم پەیوەندیانە بەرێکەوت و خۆویست نییە، بەڵکو خاوەن یاسامەندییەکی تایبەتە. مرۆڤەکان لە کۆمەڵگایەکی دواکەوتوو خاوەن هێزی لاوازی بەرهەمهێنان (بێبەش لە کەرەستەو ئەزموونە پێشکەوتووەکانی بەرهەمهێنان) دا دەبنە خاوەن جۆرێك لە پەیوەندی بەرهەمهێنەرانە و لە باردۆخی کۆمەڵگایەکی پێشکەوتووی خاوەن هێزی گەشەکردووی بەرهەمهێناندا دەبنە خاوەن پەیوەندیگەلێکی بەرهەمهێنەرانەی تر. و بەپێی ئەم دوو پێکهاتەیە دەبنە خاوەن هۆشیاری و ئایدیۆلۆژیاو یاسا و سیاسەتی جیاواز بە خۆیان کە پێشکەوتن یا دواکەوتن لەگەڵیدا هاووێنە دەبێت.

## لایەنی پێشڕەوانەی مێژوو

لە تێوریەکەی مارکس و لە مارکسیزمدا لە روانگەیەکی گشتییەوە مێژوو تایەتمەندییەکی پێشڕەوانەی هەیە. بەردەوام مرۆڤ تواناکانی بەرهەمهێنانی خۆی بەرەو کامڵبوون دەبات. بەشی چەسپاوی ئەم پێشکەوتنە بەردەوامە بریتییە لە کەرەستەی بەرهەمهێنان. بەرهەمهێنان لە رێگەی کەرەستەیەکەوە بە ئەنجامدەگات کە بە "کەرەستەی بەرهەمهێنان" ناودەبرێت. کەرەستەی بەرهەمهێنان وەکو بێڵ، قوڵنگ، گاسن و ماشێن بەردەوام بەرەو کامڵبوون هەنگاویاںناوە. بێڵی بەردینی سەردەمی کۆنە بەردین و بەردینی نوێ لەسەردەمی ئێمەدا گۆڕاوە بۆ بێڵی هایدرۆلیکی. ئەمڕۆ لەبری گاسن، تراکتۆر بەکاردەهێنرێت بۆ کێڵانی زەوی. ئێستا ئاشی کارەبایی شوێنی ئاشی دەستی گرتووەتەوە کە بۆ ماوەی دەیان هەزار ساڵ دانەوێڵەی پێدەکرایە ئارد. ئەم کەرەستانە بەشی سەرەکی تواناکانی مرۆڤ پێکدەهێنن و نموونەکانی سەرەوە بەڵگەی کامڵبوونی گەورەی ئەو کەرەستانەیە. مارکس بۆ روونکردنەوەی بابەتەکە لە دەربڕینێکی چڕدا دەڵێت کە ئاشی دەستی بۆ مرۆڤ کۆمەڵگای کۆیلەداری و ئاشی هەواییش کۆمەڵگای فیودالی، ئاشی هەڵمیش



کۆمەڵگای سەرمایەداری دروستدەکات. هەڵبەتە ئەم جۆرە دەربڕینە بۆ سادەکردنەوەی بابەتەکەیە. لەو جێیەی کە دەگەینە راستییە دەرەکییەکان کێشەکە لەم فۆرمبەندیە سادەیە ئاڵۆزتر دەبێت و خودی مارکسیش لەم پرسە ئاگاداربوو و هەر لەبەر ئەمەش بوو کە ساڵانێکی دوورودرێژ و بەشێکی زۆری لێکۆڵینەوە و نووسینەکانی خۆی تەرخانکرد بۆ ئاناتۆمی (توێکاری) سیستەمی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری و هێشتا ئەمەش کۆتایی کارەکە نەبوو. تەمەنی مارکس لەمە زیاتر ماوەی لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوە و نووسینی پێنەدا. لە پاش خۆی شوێنکەوتوانی لە هەندێ بواردا درێژەیان بە کارەکەی داو لەسەر بنەمای شێوازی هزری مارکس دەستکەوتگەلێکی گەورەیان خستە سەر زانستی مرۆڤ.

هەروەها رەوتی پێشڕەوانەی مێژوو واتە ئەوەیە کە مرۆڤ هاوکات لەگەڵ کامڵبوونی هێزی بەرهەمهێنانی خۆیدا رێکخراوگەلێکی ئاڵۆز و ئاڵۆزتر دروستدەکات. ململانێ چینایەتی لە شوێنی خۆیدا رۆڵێکی گرنگی هەیە لەم وەرچەرخانەدا. پێشکەوتن رەوشێکی پارادۆکسیانەی هەیە سادە و راستە هێڵی نییە. لە هەندێ جار ئەو بەشانەی کە سیستەمی کۆمەڵایەتی دروستدەکەن لە یەکتر بەجێ دەمێنن. بە زۆری هێزەکانی بەرهەمهێنان کە کەرەستەکانی بەرهەمهێنان شوێنێکی گرنگیان هەیە  لەناویدا بە جۆرێکی رێکتر بەرەوپێشەوە دەڕۆن. بەڵام هەندێ جار پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لێی بەجێ دەمێنن. ئەو چینانەی کە سوومەند دەبن لە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانن بەرگری دەکەن لە بەرامبەر گۆڕانەکانی ئەم پەیوەندیانەدا لێرەدا سیستەمی بەرهەمهێنان توشی خاوی و قەیران دەبێت. بۆ ئەوەی هێزە بەرهەمهێنەرەکان بتوانن درێژە بە گەشەی خۆیان بدەن پێویستە پەیوەندییە دواکەوتووە لاسەنگەکان بگۆڕن و بچنە ناو قۆناغێکی نوێوە. لە رەهەندێکی ترەوە لە بەرامبەر ئەو چینانەی کە بەپێی بەرژەوەندییەکانیان دەبنە رێگر لە بەردەم گۆڕانی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێناندا چەند چینێکی تر هەیە کە لە هەلومەرجێکی نوێدا گەشەیانکردووە بەرژەوەندییەکانیان بریتییە لە گۆڕانی





پەیوەندییە کۆنەکان و زاڵبوونی پەیوەندییە نوێیەکان. ئەم چینانە کە بە هۆشیارییەکی نوێ پۆشتە و پەرداخ کراون سەرئەنجام ئەو چینانە لە گۆڕەپانەکە وەدەردەنێن کە بەرگری لەو رەوشەی ئێستا دەکەن. بەم کارەش مێژوو دەچێتە ناو قۆناغێکی نوێوە و درامایەکی نوێ دەستپێدەکات. لە کورتکردنەوەیەکی گشتیدا مارکس کۆی ئەمانە بە پراکسیس واتە کاری فیزیکی و کاری هزری ناو دەبات و بە دروستکەری مێژووی دادەنێت.

## زەرورەت و ئازادی

ئەم راستییە پەیوەندی دیالێکتیکی زەرورەت و ئازادی لە تیۆریەکەی مارکسدا دەخاتە روو. لە لایەکەوە ئێمە هەلومەرجی بابەتیمان هەیە کە گەرچی گۆڕانەکەی لە ئەنجامی کاری مرۆڤەوە دروستدەبێت بەڵام دەکەوێتە دەرەوەی ویستی مرۆڤ و سەربەخۆیی لەوان. لە لایەکی ترەوە ململانێی چینایەتیمان هەیە کە پەیوەستە بە کرداری خودئاگایی مرۆڤەوە. مارکس لەم پەیوەندییەدا دەڵێت مرۆڤەکان مێژوو دروستدەکەن، بەڵام نەك بەبێ لەبەر چاوگرتنی ئەو هەلومەرجەی کە تیایدا دەژین و نەك هەر جۆرێك کە دەیانەوێت. مارکس ئازادی بەناسینی زەروورەت و کاربۆکردنی زەروورەت پێناسە دەکات. بەم پێیە ئێمە بەو واتایە ئازادین کە هەر کارێك کە بمانەوێت بتوانین ئەنجامیبدەین. هەلومەرجی دەرەکی راستییەکی بینراوە کە رێڕەو و یاسامەندی تایبەت بە خۆی هەیە، ئەم راستییە مرۆڤە خۆش خەیاڵەکان نائومێد دەکات. بەڵام کاتێك کە ئێمە ئەو رێگە و یاسایەمان ناسی کە زاڵە بەسەر راستی دەرەکیدا و کارمان بۆی کرد، ئەو کاتە ئازادین و دەتوانین بەشداربین لە گۆڕینی هەلومەرجەکاندا بۆ ئەوەی بەویستی خاوەنەکەی بێت.

بەڵام ئەگەر زەرووەتمان نەدۆزییەوە و کارمان بۆی نەکرد چی روودەدات؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە زەروورەت بە پێچەوانەی ویستی ئێمە بەرەو پێشەوەمان دەبات کە لەم حاڵەتەدا ئێمە ئازادین بەڵکو شکست خواردووی زەرورەتین.



## ئابووری سیاسی کلاسیك

زاراوەی ئابووری سیاسی لەسەرەتای دروستبوونیدا زیاتر پەیوەست بوو بە کار و بەرنامەی ئابووری دەوڵەتەوە، بەڵام بەرەبەرە وەکو بەشێك بۆ روونکردنەوەی لایەنە سیاسیەکانی ئابووری و نەخشەدانانی سیاسی ئابووری بە کاربرا. لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەمدا کۆمەڵێك لە فەیلەسوف و ئابووریناسانی سکۆتلەندی کە پەیوەندییەکی هزرییان هەبوو لەگەڵ بۆچوونەکانی پرۆسەی رۆشنگەریدا رێبازێکی ئابووری گرنگیان دامەزراند کە چەندین بۆچوونی کۆمەڵایەتی بەرچاوی هەبوو. لە راستیدا ئەم رێبازە کە بە ئابووری کلاسیك ناودەبرێت پێشدەروازەی زانستە کۆمەڵایەتییە مۆدێرنەکان بوو. ئادەم سمیت کە یەکێك بوو لە دیارترین کەسانی ئەم ئابوورییە دەیویست لە پێناو فەراهەمکردنی هەلومەرجی خۆشگوزەرانی گشتیدا زانستی ئابووری بگۆڕێت بۆ لقێکی مەعریفە بۆ رێنمایی سیاسەتمەداران و یاسادانەران. ئەم بابەتەی خستەروو کە تێگەیشتنی شێوەی بەرهەمهێنانی بژێوی یەکێکە لە رێگەکانی تێگەیشتنی جۆری کامڵبوونی کۆمەڵگای مرۆیی لە قۆناغە جیاوازەکاندا. ئادەم سمیت جۆرەکانی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگای مرۆیی دابەشکرد بۆ چوار دەستە: راوچیەتی و ئاژەڵداری و کشتوکاڵ و بازرگانی.

بەرەبەرە لە نێوان بیرمەندانی ئینگلیزیدا ئابووری سیاسی وەکو لێکۆڵینەوەی چینە کۆمەڵایەتییەکان و ناسینی پەیوەندییە ئابوورییەکانی نێوان چینەکان بڵاوەیکرد. ئابووری ناسانی کلاسیك جەختیان لەسەر رەگە ئابوورییەکانی ئەم جۆرە پەیوەندییانە دەکردەوە. گرنگترین دەستکەوتی ئابووری سیاسی کلاسیك تیۆریی کار بوو وەکو سەرچاوەی بەهاو ئامرازی هەڵسەنگاندنی بەها کە گۆڕا بۆ یەکێك لە دوکترینە سەرەکییەکانی ئابووری سیاسی مارکسیستی.





## ئابووری سیاسی مارکس

مارکس تێڕوانینێکی نوێی ئابووری سیاسی خستەروو کە پێکهاتبوو لە وەرگرتنی هەندێك لە دەستکەوتەکانی ئابووری سیاسی کلاسیك و رەخنەگرتن لە هەندێکی تر لە پێش گریمانەکانی ئەو رێبازە. مارکس ئەو روانگەیەی ئابووری کلاسیکی پێ پەسەند بوو کە دەیوت "دەبێت لە ئابووری سیاسیەوە دەست بە توێکاری (ئاناتومی) کۆمەڵگای مەدەنی بکرێت" بەڵام چەند گۆڕانێکی سەرەکی بەسەر زۆربەی دەستکەوتەکانی ئابووری سیاسی کلاسیکدا هێنا.

مارکس لەم خاڵەوە دەستدەکات بەرەخنەگرتن لە ئابووری سیاسی کلاسیك، ئەم ئابووریناسانە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە باوەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری کە کارێکی مێژووی و لاوەکییە وەکو کارێکی سروشتی و زاتی (کارێکی گشتی و هەمیشەیی) تەماشادەکەن. مارکس دەڵێت لەو دیوی ئەبستراکت و چەمکە سەرەکییەکانی ئابووری کلاسیك وەکو زەوی و کار و کرێ و قازانج، پێویستی هەبوونی موڵکداری تایبەتی هەیە کە بۆ خۆی کارێکی مێژووییە و لە سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراودا دروستبووە. ئابووریناسانی کلاسیك بێ ئەوەی بیری لێبکەنەوە ئەم کارەیان بەشتێکی دوودڵی هەڵنەگر داناوە. مارکس لە کتێبی بنەماکانی رەخنەی ئابووری سیاسی دا بەدرێژی روونی دەکاتەوە  کە چۆن موڵکداری تایبەتی کارێکی مێژووییە.

گۆڕانی هێزی کار بۆ کاڵا، واتە ئەو شتەی کە وەکو هەموو کاڵایەك لە بازاڕدا کڕین و فرۆشتنی پێدەکرێت کارێکی مێژووییە لە پرۆسەی گۆڕانە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکانەوە دروستبووە. کرێکار واتە کەسێك کە هێزی کاری خۆی دەخاتە بازاڕەوە و دەیفرۆشێت، کەسێکە کە لە پرۆسەی گۆڕانە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکاندا لە هەلومەرجی بەرهەمهێنانی خۆی جیابووەتەوە و ئێستا بۆ دابین کردنی بژێوی و درێژەدان بە ژیانی شتێکی دیکەی نییە جگە لە هێزی کارکردنی



خۆی. مارکس بە دەستپێکردنی لەم خاڵەوە گەیشتە تیۆریی زێدەبایی و چەوساندنەوە و چین و ململانێی چینایەتی و میکانیزمی کۆمەڵگای سەرمایەداری و زەروورەتی پەڕینەوە لێرەوە بۆ سیستەمێکی کامڵ کراوتر (سیستەمی سۆسیالیستی و کۆمۆنیستی).

## زیادە بەها

چەمکی "زیادە بەها" و هاوتاکەی "بەهای زیاتر لە پێویست" لە چەمکە کلیلییەکانی ئابووری سیاسی مارکسە. پاش ئەوەی کە سیستەمی کۆمۆنەی یەکەم شوێنی خۆی دایە ئەو سیستەمانەی کە لەسەر بنەمای موڵکداری تایبەتی و جیاوازی چینایەتی و دەسەڵاتی چینایەتی دامەزراون، بەرهەمهێنانی زیادە بەهاو بەهای زیاتر لە پێویست لە لایەن چینە بەرهەمهێنەرەکانەوە (کۆیلە و کرێکار و رەنجبەر) و دەست بەسەراگرتنی لە لایەن چینە زاڵەکان یاخود چینی خاوەن ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و چینی دەسەڵاتدار دەبنە بنەمای سیستەمی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی هەروەها پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان. لە کۆمەڵگا چینایەتییەکانی پێش سەرمایەداری بەرهەمهێنان و دەستبەسەراگرتنی بەهای زیاتر لە پێویست و لە کۆمەڵگای سەرمایەداریشدا بەرهەمهێنان و دەست بەسەراگرتنی زیادە بەها وەکو پرۆسەی سەرەکی دروستکەری بوونی کۆمەڵایەتییە کە پێشتر باسمان لێوەکرد و وتمان کە مارکس بە بنەمای سیستەمی سیاسی و یاسایی و ناوەڕۆکی دەوڵەتی دادەنێت.

وتمان لە کۆمەڵگاکانی پێش سەرمایەداری بەرهەمهێنان و دەستبەسەراگرتنی بەهای زیاتر لە پێویست بنەمای سیستەمی کۆمەڵگایە. لە کۆمەڵگای کۆیلەداریدا کۆیلەکان بەهای زیاتر لە پێویست بەرهەم دەهێنن و خاوەن کۆیلەکانیش دەستی بەسەردادەگرن. لە کۆمەڵگای فیۆدالیشدا رەنجبەر (کە بەناوی جۆراوجۆری وەك سێرڤ و مۆژیك و ئەوانیتر ناو دەبرێت) بەهای زیاتر لە پێویست





بەرهەمدێنێت و چینی فیودال دەستی بەسەر دادەگرن. بە واتایەکی وردتر دەتوانین بەهای زیاتر لە پێویست بە "بەرهەمی زیاتر لە پێویست" ناوببەین. بەرهەمی زیاد لە پێویست ئەو بەرهەمەیە کە بەرهەمهێنەر راستەوخۆ (کۆیلە یا رەنجبەر) زیاتر لەوەی کە بۆ بژێوی خۆی و خێزانەکەی پێویستە بەرهەمیدێنێت. واتای سادەی ئەم زاراوەیە ئەوەیە کە بەرهەمهێنەر راستەوخۆ لە پلەی کۆیلە یان رەنجبەر زیاتر لەو هێزی کارەی کە بۆ نزمترین ئاستی بژێوی یان بە واتایەکی تر دووبارە بەرهەمهێنانەوەی هێزی کار سەرفیدەکات بەرهەم بەدەستدێنێت. خاوەن کۆیلە یان دەربەگ دەستبەسەر ئەم بەرهەمە زیادەیەدادەگرێت. بە شێوەیەکی بنەڕەتی سیستەمی ژیان لە کۆمەڵگای کۆیلەداری یاخود فیودالّی بەدەوری ئەم بازنەیە دادەسورێتەوە. هەڵبەتە ئێمە بۆ ئاسان کردنەوەی تێگەیشتن کێشەکەمان سادە کردۆتەوە. شتێکی بەڵگە نەویستە کە راستیی دەرەکی لەم نموونە سادەیە ئاڵۆزترە. بەڵام نابێت ئاڵۆزی راستی دەرەکی سەرمان لێ بشێوێنێت و تووشی هەڵەمان بکات (هەروەك چۆن بە زۆری هەروایە). ناوەڕۆکی پرسەکە هەر ئەوەیە کە لە و دەربڕین و نموونە سادەیەی سەرەوەدا باسکرا.

## بەهرەکێشی سەرمایەدارانە

ئەگەر سیستەمی کۆیلەداری و سیستەمی فیودالّی لەسەر بنەمای بەرهەمهێنان و دەستبەسەر راگرتنی بەرهەمی زیاد لە پێویست دامەزراوە ئەوا سیستەمی سەرمایەداری لەسەر بنەمای بەرهەمهێنان و دەستبەسەرا گرتنی زیادە بەها یاخود بەهای زیاتر لە پێویست دامەزراوە. سەرەڕای ئەو ماوە کەمەی کە لێرەدا هەمانە رەنگە هێنانەوەی نموونەیەك بۆ روونترکردنەوەی بابەتەکە کارێکی پێویستبێت. خاوەنکار یاخود سەرمایەدارێك لەبەر چاوبگرین کە کاری بەرهەمهێنان و فرۆشتنی مافوور دەکات. برێك پارە لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت و بەرەو بازاڕ دەڕوات و هەندێك داو دەکڕێت. پاشان تەونێکی مافوور بەرپادەکات و چەند کرێکارێکی



مافوورچنین بەکرێ دەگرێت تاوەکو مافوورەکەی بۆ بچنن. پاش تەواوبوونی کارەکە مافوورەکە بەرەو بازاڕ دەبات و دەیفرۆشێت. هیچ گۆمانی تیادانییە کە ئەو کەسە لە هەلومەرجی ئاساییدا هەموو ئەم کارانە بۆ ئەوە ئەنجامدەدات کە پاش فرۆشتنی مافوورەکە برێك پارەی بۆ بمێنێتەوە زیاتر لەوەی کە خەرجی کردووە بۆ کڕینی داو و کرێی  کرێکار و ئەو کاتەی خۆی کە تەرخانیکردووە بۆ ئەم کارە. ئەو بڕە پارە زیادەیەی کە لەم کارەوە بە دەستی دێنێت لە زمانی ئاساییدا پێی دەوترێت قازانج.

ئەم بڕە پارە زیادەیە یان قازانجە لە کوێوە بە دەستهاتووە؟ ئەگەر هەموو ئەو بڕە پارەیە کۆبکەینەوە کە خەرجی کردووە بۆ کڕینی داو و تەونی مافوور و کرێیی کرێکار (لەوانە کرێی کاتەکەی خۆیشی) کەمترە لەوەی کە لە فرۆشتنی مافوورەکە بەدەستیکەوتووە. دەبێت بۆ دابینکردنی یەکێك لەم پێداویستیانە کەمتر لە بەهای راستەقینەی خۆی پارەی دابێت. لە ڕواڵەتدا وادیارە کە ئەم خاوەنکارە بۆ هەر شتێك کە وەریگرتووە بەرامبەر بەنرخەکەی پارەی داوە. بەرامبەر بە کڕینی داوەکە پارەی داوەتە داو فرۆشەکە و هەروا کرێی داوەتە هەریەك لە کرێکارەکانیش بەرامبەر بە کارەکانیان. ئەگەر هەموو خەرجییە ورد و بچووکەکانیش کۆبکەینەوە هێشتا خاوەنکارەکە بڕە پارەیەکی زیادەی بە دەستهێناوە. ئەم بڕە پارە زیادەیە کە بە قازانج ناودەبرێت بریتییە لە پاڵنەری سەرەکی خاوەنکار بۆ ئەوەی هەڵبستێ بە بەرهەمهێنانی مافوور.

مارکس پێشانیدەدات کە ئەم بڕە زیادەیە (یان قازانج) لە کرێی نەدراوی کرێکارەکانەوە بە دەستهاتووە: واتە لەو ماوەیەی کە کرێکارەکان رۆژانە کاریان لەسەر مافوورەکە دەکرد زیاد لەو کرێیەی کە وەریان دەگرت بەهایان بەرهەمهێناوە. ئەم پەیوەندییە لەوێوە دروستبووە کە خاوەنکار توانیویەتی کاڵایەك لە بازاڕ بکڕێت کە بەهایەکی زیاتر لەو بەرامبەرەی کە وەریدەگرێت بەرهەمدێنێت. مارکس ئەم بەهایە بە زیادە بەها ناودەبات و دەڵێت کە رەوڕەوەی





سیستەمی سەرمایەداری لە بەرهەمهێنان و دەست بەسەراگرتن و بڵاوکردنەوەدا لەسەر بنەمای ئەم زیادە بەهایە دەسوڕێتەوە. موڵکداری تایبەتی زەوی و سەرمایە و بە کاڵا بوونی هێزی کار کە ئابووریناسەکان بە کارێکی سروشتی دادەنێن و مارکس پێشانیدەدات کە سروشتی نییە بەڵکو بەرهەمی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکانە و بەشی زەرووری ئەم بەرهەمهێنانەیە.

خاوەنکار یان سەرمایەدار دەستبەسەر زیادە بەها دادەگرێت و ئەو پەیوەندیەی کە تیایدا خاوەنکار دەستبەسەر ئەو زیادە بەهایەدا دەگرێت کە لە لایەن کرێکارەکانەوە بەرهەمهاتووە بە "بەهرەکێشی" (بەواتایەکی تر وەبەرهێنان) ناو دەبرێت.

مارکس پێشانیدەدات کە خاوەنکار لە کاتی بە کرێگرتنی کرێکاردا (یان هێزی کاری کرێکارێك وەك کاڵا) بەرامبەر دووبارە بەرهەمهێنانەوەی هێزی کاری کرێکار کە بریتییە لە نزمترین ئاستی بژێوی خۆی و خێزانەکەی پارەی دەداتێ و ئەو زیادەیەی کە کرێکار لە ماوەی کاری ڕۆژنەیدا بەرهەمی دێنێت بۆ خۆی هەڵدەگرێتەوە. بەم جۆرە کرێکار لەماوەی چەندین کاتژمێر کاری ڕۆژانەدا دوو جۆر بەها بەرهەم دێنێت یەکەم کە بە "بەهای پێویست" ناودەبرێت و بۆ دووبارە بەرهەمهێنانەوەی هێزی کار وەکو کرێ دەدرێتە کرێکار دووەمیش "زیادە بەها"یەکە وەکو قازانج دەمێنێتەوە بۆ خاوەنکار. "بەهای پێویست" بەرامبەرە بە کرێی نزمترین ئاستی بژێوی کرێکار. بەڵام باری کۆمەڵایەتی ئەم نزمترین ئاستە دیاری دەکات و شتێکی خودسەرانە و بە ئارەزوو نییە. بۆیە لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا ئەم نزمترین ئاستە زیاترە لەچاو وڵاتە دواکەوتووەکاندا. ئەم کارە لە ڕەنگدانەوەی دەرەکی خۆیدا وەکو بەرزبوونی کرێ و ئاستی ژیانی کرێکارانی وڵاتە پێشکەوتووەکان بە دیار دەکەوێت.

بەڵام بەرزبوونی کرێ و ئاستی ژیان لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا بەو واتایە نییە کە بەهرەکێشی لەم وڵاتانەدا نییە یاخود تەنانەت ئاستی بەهرەکێشی کەمترە لەچاو



وڵاتە دواکەوتووەکاندا. ئاستی بەهرەکێشی یەکسانە بە ڕێژەی زیادە بەها لەچاو بەهای پێویست، چونکە لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا بە هۆی بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای پێشکەوتووەوە ئاستی سوودوەرگرتن بەرزترە هەر بۆیە ئاستی بەهرەکێشیش زیاترە هەرچەندە کە خاوەنکار لە بەرامبەر کارەکەیدا پارەکی زیاتریش بدات:

$$\text{ئاستی بەهرە کێشی} = \frac{\text{زیادە بەها}}{\text{بەهای پێویست}}$$

هەڵبەتە مارکس لە شیکردنەوەی کۆمەڵگای سەرمایەداریدا تێڕوانینی خۆی ئاراستەی پەیوەندییەکانی کارو سەرمایەداری دەکات و کاری بەوەوە نییە کە ئایا جگە لە بەهرەکێشی لە هێزی کاری سەرچاوەگەلێکی تریش بۆ بەهرەکێشی هەیە یان نا.

## ئیمپریالیزم و نرخی دابەزینی سوود

خاوەنکار بۆ بەرزکردنەوەی سوودی خۆی دەیەوێت سوود لە ئامێر و ماشینە پێشکەوتووەکان وەربگرێت. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە بەکارهێنانی ماشێن ئەو هەلەی بۆ دەڕخسێنێت کە شتوومەکێکی زۆرتر بە تێچوونێکی کەمتر بەرهەم بێنێت. بەڵام کاتێك کە خاوەنکار ماشێن دێنێتە ناو پرسەی بەرهەمهێنانەکەی خۆیەوە ڕکەبەرەکانی ڕازی نابن کە ئەو بۆ هەمیشە سوود لەم پێگە باشترەی خۆی وەربگرێت. بۆیە ئەوانیش بە دوای ئەم ماشێنەدادەچن و بگرە هەوڵدەدەن کە یەکێکی باشتر لەوەی ئەویش بەکاربێنن. کاتێکی زۆری پێناچێت کە ئەو ئامێرە بە هەموو شوێنێکدا بڵاودەبێتەوە. ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی کە تێچوونی بە کارهێنانی ئامێرەکان خێراتر لە تێچوونی کرێدەستەکان گەشەبکات. بە لەبەر





چاوگرتنی ئەوەی کە زیادە بەها لە کارەوە بەدەستدێت واتای ئەوەیە کە ڕێژەی ئەو قازانجەی کە خاوەنکار لە هەموو سەرمایەگوزارییەکەی خۆی بەدەستیدێنێت بەردەوام لەدابەزینندایە. و ئەمەش بە یاسای دابەزینی نرخی سوود ناودەنرێت.

نزمبوونەوەی نرخی سوود دەبێتە هۆی نزمبوونەوەی بە گەڕخستنی سەرمایە و نزمبوونەوەی بە گەڕخستنی سەرمایەش دەبێتە هۆی نزمبوونەوەی هەلی کارکردن. مارکس دەڵێت سەرمایەداری سیستەمێکە کە لەناو خۆیدا دەستەویەخەی چەندین جۆری ناکۆکییە. سیستەمی سەرمایەداری تووشی ناهاوسەنگی چەند قەیرانێکی یەك لە دوای یەك هاتووە.

"یاسای دابەزینی نرخی سوود" یەکێکە لە مەبەستە سەرەکییەکانی ناردنی سەرمایە بۆ وڵاتە دواکەوتووەکان، هەروەها یەکێکە لە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی دیاردەی ئیمپریالیزم. لە ناوچە و وڵاتە دواکەوتووەکاندا بە هۆی نزمبوونی ئاستی پێشکەوتنی پیشەسازی لەبەر ئەو هۆکارانەی کە گوتران نرخی سوود بەرزترە.

تیۆری و شیکردنەوەکانی مارکس لە بواری ئابووری سیاسیدا گۆڕانێکی گرنگیان دروستکرد لە زانستی ئابووریدا و بەرەبەرە گۆڕان بۆ یەکێك لە بوارە گرنگەکانی زانستی سیاسی.

### ٤- لە خۆنامۆبوون

## تێروانینێکی جیاواز بۆ چەمکی نامۆبوون

چەمکی نامۆبوون لە بابەتە سەرەکییەکانی تیۆری و دەستنووسەکانی مارکسە هەر لە دەستنووسە فەلسەفی و ئابوورییەکانەوە هەتا کتێبی مەزنی سەرمایە. چەمکی لەخۆ نامۆبوون لە هیگڵەوە گەیشتە فۆیەرباخ و لە فۆیەرباخیشەوە بۆ مارکس. فۆیەرباخ لە بنەڕەتدا چەمکی نامۆبوونی دەبەستەوە بە بواری ئایینەوە و مارکسیش ناوەڕۆکێکی ئابووری-کۆمەڵایەتی پێبەخشی. نامۆبوون لە تیۆریەکەی



مارکسدا ڕەنگدانەوەی ئەو ڕاستییەیە کە بەرهەمهێنەر (کرێکار) هەرچەندە زیاتر بەرهەمبهێنێ ڕێژەیەکی کەمتر لە بەرهەمەکەی خۆی بەکاردەهێنێ و هەرچی زیاتر بەها دەخولقێنێ خۆی کەم بەهاتر دەبێت، چونکە بەرهەمی کارەکەی لێی نامۆدەبێت و ڕووبەڕووی دەوەستێتەوە. ژیانی کرێکار پشتی بەسەرمایە بەستووە، لە کاتێکدا کە خودی کرێکار بەکارکردنی خۆی ئەم سەرمایەیەی دروستکردووە. ئەو دەبێت کار بۆ سەرمایە واتە بەرهەمی کارەکەی خۆی بکات. تاوەکو بۆ مانەوەی لە ژیاندا شتێك وەکو "کرێدەست" وەربگرێت.

ئەگەر کرێکار کارنەکات هەقدەست وەرناگرێت. لەوەها هەلومەرجێکدا کرێکار لە تەواوێتی مرۆڤێکی پەیوەست بوو بێبەش دەبێ. بوونی جۆرێتی و مرۆڤ و سروشت و بەهرە زەینی و هزرییەکانی مرۆڤ دەگۆڕێت بۆ شتێك کە لەگەڵ ئەودا نامۆیە. مرۆڤ لە مرۆڤ نامۆ دەبێت. مارکس لە کتێبی سەرمایەدا هۆکاری کاری نامۆبوون دەگەڕێنێتەوە بۆ بەرهەمهێنانی بازاڕ و دابەشکردنی کار و دابەشکردنی کۆمەڵگا بۆ چەند چینێکی ناکۆك:

**١- نامۆبوون لە بەرهەم:** مرۆڤ وەکو بوونەوەرێکی بەرهەمهێنەر تەنها بە کارکردنی خۆی کاڵا بەرهەم دێنێت. لە سیستەمی بازاڕیدا کاری کرێکاریش وەکو کاڵای لێدێت. بەهای ئەم کاڵایەش لە بازاڕی کاردا بەرامبەرە بە ئاستی کاری پێویستی کۆمەڵ بۆ دووبارە بەرهەمهێنانەوەی. بەڵام ئەم کارە بەهایەکی بە پلە زیاتر لەوەی کە بۆ دووبارە بەرهەمهێنانەوەی پێویستە دروستدەکات کە وەکو زیادە بەها دەکەوێتە بەردەست خاوەنکار و تەنانەت وەکو هێزێکی نامۆ ڕووبەڕووی رادەوستێت.

**٢- بەبت بوونی کاڵا:** کێشەیەکی تری نامۆبوونی کرێکار بریتییە لە بە پسپۆڕیبوون و دابەشبوونی کارو پارچە پارچە بوونی پرۆسەی بەرهەمهێنان لە کارگە نوێیەکاندا. ئەوەی کە بە تایلۆریزم و فۆردیزم بە ناوبانگە دیارترین لایەنی ئەم ڕاستییەن. لەم جۆرە کارکردنەی کارگەکاندا هەر کرێکارێك بەشێکی

بچووکی کارێکی بە کۆمەڵ ئەنجامدەدات و بێ ئاگایە لە چۆنیەتی بەرهەمی کۆتایی. بەم جۆرە بەرهەمی کاری مرۆڤ تایبەتمەندی خۆی لە دەستدەدات وەکو بەرهەمی کاری مرۆڤ و دەبێتە شتێکی بت ئاسا و وەکو راستییەکی ستەمکاری لێدێت کە رووبەڕووی هەردووکیان واتە بەرهەمهێنەر (کرێکار) و خاوەنکار (سەرمایەدار) دەبێتەوە.

**٣- نامۆبوونی سیاسی:** نامۆبوونی ئابووری بەو جۆرەی کە لەسەرەوە باسکرا هاوکات دەبێت لەگەڵ نامۆبوونی سیاسی و ئایدۆلۆژیایشدا. نامۆبوونی سیاسی و ئایدۆلۆژیایی، واتە شێواندنی پەیوەندییە راستەقینەکان و ئاراستەکردنی بە دنیایەکی خەیاڵی. لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا مرۆڤ لە نێوان هاوولاتی و بوونەوەری ئابووریدا بۆ دوو نیوە دابەشدەبێت. ئەم دوبەشیە رەنگدانەوەی نامۆبوونی سیاسیە کە دەولەتی بورژوازی رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر توندی دەکاتەوە. دەولەتی بورژوازی وەکو ئامرازێکی لێدێت کە چینی خاوەن سەرمایە لە رێگەیەوە زاڵ دەبێت بەسەر هەموو چینەکانی تردا.

فۆرمەکانی نامۆبوونی ئایدیالۆژیا جیاوازن. تیۆریە ئابووری و فەلسەفی و یاساییەکانی کۆمەڵگا چینایەتییەکان و کۆمەڵگای سەرمایەداری لە دەرکەوتنە جیاوازەکانی نامۆبوونی ئایدۆلۆژیاین، ئەم تیۆریانە پەیوەندییە راستەقینەکانی بەرهەمهێنەر و خاوەنکار لە چەند دروستکراوێکی خەیاڵیدا دەشێوێنن و ئاراستەی دەکەن. بە ئایدۆلۆژیاکان و تیۆرییە ئابووری و فەلسەفی و یاساییەکان راستی بەهرەکێشی لە چینی کرێکار بە شاراوەیی دەمێنێتەوە. نامۆبوونی ئایدۆلۆژیایی بە باشترین شێوە لە ئاییندا بە دیار دەکەوێت و ئایین کە سەرەتا یەکێك بوو لە لقەکانی مەعریفەی مرۆیی دەگۆڕێت بۆ ئامرازێکی بێ هۆشکردن.

٤- نامۆبوون لە بوونی جۆرێتی: مرۆڤ "بوونەوەرێکی جۆرێتی"یە. دەکرێت زاراوەی بوونەوەرێکی جۆرێتی بە "بوونەوەرێکی گرووپی" یان بە "بوونەوەرێکی گشتی" لێکبدرێتەوە. مرۆڤ وەکو بوونەوەرێکی ئازادو گشتی بوونەوەرێکی



بەرهەمهێنەر و بوونەوەرێکی ئافرێنەرە کە بە شێوەیەکی هەماهەنگ لە رێگەی کاری ئازاد و داهێنەرانەوە لەگەڵ سروشت و تەواوی هاوجۆرەکانی خۆی و تەنانەت لەگەڵ خودی خۆیشیدا یەکدەگرێتەوە. ژیان بەرهەمهێنەری ژیانی جۆرێتیە. بەلام لە پرۆسەی مێژوودا بە جیابوونەوەی بەرهەمهێنەر لە هەلومەرجی کار و بەرهەمی کارەکەی خۆی مرۆڤ تووشی باری نامۆبوون دەبێت. ئەو کات مرۆڤ رووبەڕووی مرۆڤ رادەوستێت. مرۆڤی نامۆبوو خۆی لە رووبەڕووی هەموو مرۆڤ و شتەکاندا دەبینێتەوە و دەگۆڕێت بۆ بوونەوەرێکی زێدەخواز و رکابەرخواز. لەوەها هەلومەرجێکدا ئەو بارەی کە لە ئارادایە بۆ مرۆڤ ناخۆش دەبێت و ژیانی گشتی مرۆڤ پەرت دەبێت بەرەو جیهانێکی تر، جیهانێکی میتافیزیکی. بەم جۆرە مرۆڤ دەبێتە خاوەن هۆشیارییەکی شێواو کە مارکس بە "هۆشیاری درۆیین" ناوی دەبات. وێناکردنی جیهانێکی تر کە تیایدا مرۆڤ بە نەمری دەگات، یەکێکە لە نموونەکانی ئەم هۆشیارییە درۆیینە.

## نامۆبوون و ململانێی چینایەتی

لە ناوبردنی نامۆبوونی مرۆڤ تەنها بە گۆڕینی سیستەمی سەرمایەداری وەکو کامڵترین سیستەمی مرۆیی و سیستەمێك کە توندترین فۆرمەکانی نامۆبوونی تیادایە دێتەدی. ئەم گۆڕانە گۆڕینێکی شۆڕشگێرانەیە. پرۆلتیاریا (چینی کرێکاری پشەسازی) هێزی بەرهەمهاتووی ئەم گۆڕانەیە. بەلام پێوستە سەرەتا پرۆلیتاریا بۆ بەرەوپێشبردنی ئەم کارە مەزنە مێژووییە هۆشیاری چینایەتی بە دەست بێنێت. ئەم ململانێ چینایەتییە دوایین پلەی ململانێی چینایەتی مێژووییە کە لە حاڵەتی بە ئاکام گەیشتنی ناکۆکی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤدا چارەسەر دەبێت و تەنها رووبەڕووبوونەوەی مرۆڤ و سروشت دەمێنێتەوە. هەڵبەتە نابێت رووبەڕووبوونەوەی سروشت تێکەڵ بکەین لەگەڵ خراپ سوود لێوەرگرتنی سروشت و لە ناوبردنی سروشت لە لایەن سیستەمی سەرمایەدارییەوە (کە هاندەرە سەرەکییەکەی بریتییە





له سوود یان دەست بە سەراگرتنی زیادە بەها). سروشت سەرچاوەی زۆربەی پێداویستییە مرۆییەکانە و مرۆڤ لە رووبەڕووبوونەوەی سروشت یان بە شێوازێکی سادەتر لە پرۆسەی بەرهەمهێنان و کارکردن لەسەر سروشتەوە بە مرۆڤبوونی خۆی گەیشتووە. هەموو سوود وەرگرتنێك لە سروشت سوود وەرگرتنی نابەجێ نییە. جگە لەمە هێشتا پێویستە کە مرۆڤ زۆربەی ئەو ئاستەنگانە لەسەرەڕێی خۆی لابەرێت کە سروشت بەسەریدا سەپاندووە هەر لە نەخۆشییە جۆراوجۆرەکانەوە بگرە هەتا رەهەندەکانی کات و شوێن (کە لە ئێستا لە سنووری گۆی زەوی تێپەڕیوە و گەیشتووەتە هەسارە دوورە دەستەکانیش). ئەم داینامیکییەتە هەرگیز بە کۆتایی ناگات. مارکس وەکو هیۆمنانیستێك مرۆڤ بە تەوەری جیهان و خۆشبەختی مرۆڤیش بە تەوەرەی ناوەندی تیۆریەکەی خۆی دەستنیشاندەکات.

## کۆمۆنیزم وەکو وێستگەی کامڵبوونی کۆمەڵگای مرۆیی

بەسەقامگیربوونی کۆمەڵگای کۆمۆنیستی نامۆبوونی مرۆڤ لەناو دەچێت و مرۆڤ دەگاتە یەکبوونی خۆی. یەکبوونی مرۆڤ پێویستەی بە هەلومەرجێك هەیە کە لە کۆمەڵگای کۆمۆنیستیدا دەستەبەر دەبێت. ئەو هەلومەرجانەیش بریتین لە فراوانبوونی خێروبێرەکانی ژیان و دەربازبوونی کار لە حاڵەتی زۆرەملی (لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگاکانی پێش کۆمۆنیستی) و گۆڕینی بۆ "زەروورەتی ئەخلاقی" و لەناوبردنی جیاوازی چینایەتی و ململانێ چینایەتی و ستەمکردنی مرۆڤ لە مرۆڤ و لە کۆتاییشدا یەکبوونەوەی مرۆڤە لەگەڵ تایبەتمەندییە جۆرێتی و گشتییەکانی خۆیدا (مرۆڤ وەکو بوونەوەرێکی ئازاد و بەرهەمهێنەر لە گشتی بوونی خۆیدا). مارکس پێیوایە کە دیموکراسی وەکو ئامانجێك تەنها لەوەها کۆمەڵگایەکدا دێتەدی.

مارکس لەو دیموکراتیخوازە رادیکاڵانەیە کە پێیوایە تەنها بەلەناوبردنی هەموو جۆرە ستەمکردنێکی مرۆڤ لە مرۆڤ دیموکراسی و بەدیهاتنی ئازادی



دەستەبەردەبێت و ئەمەیش خۆی پێویستی بە لەناو بردنی بەهرەکێشی مرۆڤە لە لایەن مرۆڤەوە. لەم قۆناغە بەرزەی کامڵبوونی کۆمەڵگای مرۆیی بوونی دەوڵەتیش لەناو دەچێت و بەرەبەرە دەوڵەتیش بەرەو لاوازبوون دەچێت. چونکە بە بۆچوونی مارکس دەوڵەت لە قۆناغێکی دیاریکراوی مێژوودا واتە پەیدابوونی کۆمەڵگای چینایەتی و بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەو چینانەی کە بەهرەکێشییان لێدەکرێت لە لایەن چینە بەهرەکێشەکانەوە دروستبووە. هەڵبەتە دەوڵەت تەنها یەك رووی نییە، بەڵام یەکێك لە گرنگترین رووەکانی بریتییە لە کۆنترۆڵکردنی چینایەتی. دەوڵەت لەسەرهەڵدانی موڵکداری تایبەتی و دابەشبوونی کۆمەڵگا بۆ چینەکان دروستبووە و بە نەمانی موڵکداری تایبەتی و لەناو بردنی دابەشکردنی چینایەتیی کۆمەڵگا هۆکاری هەبوونی خۆی لەدەستدەدات.

## سۆسیالیزم و دیکتاتۆری پرۆلتیاریا

بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگای کۆمۆنیستی پێویستە قۆناغێکی ناوەنجی و راگوزار (نێوان سیستەمی سەرمایەداری و کۆمەڵگای کۆمۆنیستی) تێپەڕێنین. ئەم قۆناغە بە قۆناغی سۆسیالیزم ناودەبرێت. سۆسیالیزم بە لابردنی کۆمەڵگای سەرمایەداری لە شۆڕشێکدا و بە رابەری پرۆلیتاریا سەقامگیر دەبێت. پرۆلتیاریا پاش وەلانانی دەسەڵاتی سەرمایەداران وەکو حکوومەتێکی کاتی حکوومەتی چینایەتی خۆی سەقامگیر دەکات. ئەم حکوومەتە ناودەنرێت بە "دیکتاتۆری پرۆلیتاریا". نابێت سەبارەت بە زاراوەی دیکتاتۆری توشی هەڵەببین. مەبەستی مارکس لە دیکتاتۆری ئەوەیە کە حکوومەت لە قۆناغی کاتیدا بە هەموو شێوەیەك لە دەستی پرۆلیتاریادایە و مارکس هەموو جۆرە حکوومەتێکی چینایەتی بە جۆرێك حکوومەتی دیکتاتۆری دادەنێت. بۆ نموونە دیموکراسیش حکوومەتی دیکتاتۆری بوژروازییە.

قۆناغی سۆسیالیزم وەکو هەنگاوی یەکەمی کۆمۆنیزم هێشتا چەندین روخساری مێژووی نامۆبوونی پێوەماوە. لە بواری کارو بەرهەمهێناندا (وەکو بنەمای پەیوەندییەکانی کۆمەڵگا) ئەم شێوە و دروشمەی خوارەوە زاڵە بەسەر ئەم قۆناغەدا:

"هەر کەسەو بەقەدەر توانای خۆی و هەر کەسە و بە قەدەر کاری خۆی" لە کاتێکدا کە پاش تێپەڕاندنی ئەم قۆناغە و سەرهەڵدانی کۆمەڵگای فراوانی کۆمەڵگایەك کە تیایدا کار (بە هۆی گەشەی کەلتووری و سروشتی مرۆڤەوە) چووەتە خانەی "زەروورەتی ئەخلاقی"ییەوە ئەم شێوەیەی خوارەوە بەسەریدا زاڵدەبێت:

"هەر کەسە و بەقەدەر توانای خۆی و هەر کەسەش بەقەدەر پێویستی خۆی."

## قەیرانی سیستەمی سەرمایەداری

قەیرانی سیستەمی سەرمایەداری دەبێتەهۆی رەخساندنی هەلومەرجی گۆڕانی ئەم سیستەمە و هەنگاونان بەرەو ئەو پرۆسانەی کە ئاماژەیان پێکرا. سیستەمی سەرمایەداریش وەکو سیستەمەکانی پێشوو لەسەر بنەمای کامڵبوونی ناوەکی و سەرهەڵدان و گەشەکردنی ناکۆکییە ناوەکییەکان ئامادە دەبێت بۆ گۆڕان و هەنگاونان بەرەو قوناغێکی تازەتری کامڵبوون. گەشەکردنی تواناکانی بەرهەمهێنان و روبەڕووبوونەوەی لەگەڵ پەیوەندییە کۆنەکاندا و گۆڕانی ئەو پەیوەندییانە (کە لە ناخی کۆمەڵگادایە) و ململانێی چینایەتی وەکو رەنگدانەوەی ئەم ناکۆکییە (کە رووە دەرەکییەکەی ئەو بە دیار دەخات) هێزی بزوێنەری سەرەکی پێشکەوتنی کۆمەڵگا و مێژوو و هەنگاوە یەك لە دوای یەکەکانێتی بەرەو پێشکەوتن. سیستەمی سەرمایەداریش لەناو خۆیدا گەشەکردنی هێزە بەرهەمهێنەرەکان و گەشەکردنی ناکۆکی پەروەردە دەکات. لە قۆناغێکدا کە گەشەکردنی هێزە بەرهەمهێنەرەکان بە ئاستێك پێشکەوت کە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان بەجێ بهێڵێت ئەو کات سیستەمەکە تووشی قەیران دەبێت.



ناکۆکی سەرەکی سیستەمی سەرمایەداری ئەوەیە کە بەرهەمهێنان بە زۆرترین روویەوە بە کۆمەڵایەتی بووە، بەڵام پەیوەندییەکانی موڵکداری بەردەوام لە باری تایبەتیدا ماوەتەوە. دەبێت بۆ چارەسەرکردنی ئەم ناکۆکییە لە ئاستی بە کۆمەڵایەتی بوونی بەرهەمهێنانی پەیوەندییەکانی موڵکداریش لە باری تایبەتییەوە بگۆڕێت بۆ باری کۆمەڵایەتی. دەتوانرێت سەبارەت بە روخسارەکانی کۆمەڵایەتی بوونی بەرهەمهێنان چەندین بابەت بخرێتە روو. ئەمە بۆ خۆی باسێکی درێژە و ئێمە لێرەدا بە ئاماژەیەك کۆتایی پێدێنین. هێندە بەسە کە ئاماژە بە دابەشکردنی کار لە چوارچێوەی سەرمایەداری و هەبوونی کارگە گەورەکان و کەڵەکەبوونی سەرمایە و مۆنۆپۆڵەکان و ئەو دیاردە بکەین کە ئەمرۆکە وەکو "بە جیهانی بوون" باسی لێوەدەکرێت تاوەکو وێنەیەکی بە کۆمەڵایەتی بوونی بەرهەمهێنان بە دەستبهێنین.

بەڵام لە ئاستی دەرەکی تری کۆمەڵگای چینایەتی کە بە هۆی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی ئێستاوە زیان دەبینن، واتە ئەو پەیوەندییانەی کە لەسەر بنەمای موڵکداری تایبەتی و قازانجکردنی تایبەتی بنیاتنراون ئەنجامی ململانێیەکە بۆ گۆڕانکاریە. مارکس پرۆلیتاریا بە هێزی سەرەکی هەڵگری پەیامی گۆڕان دادەنێت. مارکس دەیوت کە کۆمەڵگای سەرمایەداری بە توندی دەبێتە شتێکی جەمسەری و دابەشدەبێت بۆ دوو جەمسەر، یەکەم جەمسەرێك کە پێکهاتووە لە خەڵکانێکی زۆر و چەوساوە (بەهرەبراو) و جەمسەرەکەی تر پێکهاتووە لە خەڵکانێکی کەم چەوسێنەر (بەهرەکێش). پرۆلیتاریا بەوەدەستهێنانی هۆشیاری و سوودوەرگرتن لەو هەلومەرجەی کە هەلی رێکخستن و یەکگرتنی ئەوی فەراهەمکردووە سەرئەنجام دێتە ناو مەیدانەکەوە و بە گۆڕینی سیستەمی سەرمایەداری کۆتایی بە تەمەنی سیستەمە چینایەتییەکان دەهێنێ، ئەو سیستەمانەی کە لەسەر بنەمای ستەم و بەهرەکێشی دامەزراون. بە هەنگاوی





گۆڕانسازی پرۆلتیاریا قۆناغی "پێش مێژووی" نەوەی مرۆیی کۆتاییپێدێت و مێژووی راستەقینەی مرۆڤ دەستپێدەکات.

ئەزموونی مێژوویی هەندێك لە پێشبینیەکانی مارکسی نە سەلماندووە. لەوانە بۆچوونی جەمسەربەندی و هەژاریی سەختی چینی کرێکار و دروستبوونی شۆڕشی پرۆلیتاریایی. سەبارەت بە جەمسەربەندی کۆمەڵگا پێویستە باس لەو خاڵە بکەین کە چینی ناوەڕاست (واتە چینەکانی نێوان پرۆلتاریا و بورژوازی) زیاتر لەوەی کە مارکس بیری لێدەکردەوە گەورە بووەوە بەشێکی بەرچاوی کۆمەڵی لە خۆگرتووە. شۆڕشی پرۆلیتاریایش زیاتر لەوەی کە مارکس بیری لێدەکردەوە دواکەوتووە. بەڵام هیچ یەك لەم راستییانە لە پتەوبوونی تیۆریی مارکس دەربارەی یاسامەندی وەرچەخانی مێژوو و زەرورەتی گۆڕینی سیستەمی سەرمایەداری کەم ناکاتەوە. سەرەڕای ئەوەی کە سیستەمی سەرمایەداری زیاد لەوەی کە مارکس پێشبینی دەکرد دینامیکییەت و توانای مانەوەی لە خۆی نیشانداوە، بەڵام ناتوانرێت بە کۆتایی کاملبوونی مێژووی کۆمەڵگای مرۆیی دابنرێت، مەگەر ئەوەی کە مرۆڤ لەوە بەبێ تواناتر بزانین کە بتوانێت بە دروستی ژیانی خۆی رێکبخات. هەر ئێستایش سیستەمی سەرمایەداری تووشی چەندین قەیرانی ئابووری هەمیشەیی و جەمسەربەندی توندی هەژاری و سامان لەسەر ئاستی جیهان، شێواندنی ژینگە و گەلێك زیانی گەورەی تر هاتووە کە چارەسەرکردنیان بەستراوەتەوە بە گۆڕینی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری.

### پەراوێزەکان:

١- دستنوشته‌های اقتصادی و فلسفی ١٨٤٤ ترجمه حسن مرتچوی، تهران، نشرآگه، ١٣٨٧.

٢- مبانی نقد اقتصاد سیاسی، ترجمه باقر پرهام و احمد تدین، تهران، نشرآگه، ١٣٧٨.





## پاژی کۆتایی

## پێداچوونەوەیەکی هزری سیاسی نوێ (مۆدێرن)

لە بەشەکانی پێشوودا ئاشنابووین بە زنجیرە هزرێکی سیاسی کە بە هزری سیاسی نوێ ناسراون. هزری سیاسی ئەو سەردەمەی کە بە سەردەمی نوێ ناوبراوە، دەکەوێتە بەرامبەر هزری سیاسی دێرین کە لە بەرگی یەکەمدا پێی ئاشنابووین و لە رووی مێژووییەوە لە یۆنانی کۆنەوە تاکۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا لەخۆدەگرێت. لێرەدا هزری سیاسی نوێمان لە سەرەتای رێنسانسەوە دەستپێکردو هەتا سەدەی نۆزدەیەم درێژەمان پێدا. درێژەی باسی پەیوەست بە مێژووی سیاسیی رۆژئاوا لە بەرگێکی دیکەدا درێژە پێدەدەین کە تایبەتە بە هزری سیاسی سەدەی بیستەم. بەڵام رێگە بدەن لە کۆتایی ئەم بەرەگەدا جارێکی تر بەو بابەتانەدا بچینەوە کە لەم کتێبەدا باسیان لێوەکراوە، لێرەدا دەمانەوێت چاوێك بە هەندێك لە لایەنەکانی رەوتی وەرچەرخانی هزری سیاسی ئەم قۆناغە و سەرەکیترین دەستکەوتەکانیدا بخشێنین.

لەم بەرگەدا لەگەڵ چەندین هزری جۆراوجۆر و چەندین بیرمەندی جیاواز ئاشنابووین و باس لە چەندین تیۆری و دوکترین کرا. هەندێك لەم تیۆری و دوکترینانە هێشتاش لە نێوان ئەهلی هزر و ئارەزوومەندانی سیاسەتدا لایەنگریان هەیە و هەندێك لەم تیۆری و دوکترینانە هێشتاش باسیان لێوەدەکرێت. هەندێك لە شیکردنەوە و بەڵگە هێنانەوە سیاسیەکاندا سوودیان لێوەردەگیرێت. هەندێك لە دەستکەوتەکانی هزری سیاسی ئەم قۆناغە بوونەتە بەشێك لە بنەما چەسپاوەکانی دنیای سیاسی. لەگەڵ



ئەوەی کە هەندێك لە هزر و تیۆریەکان بە مێژوو سپێردراون، بەڵام بەشێکی زۆریشی هێشتاش پەیوەندی خۆی لەگەڵ دنیای ئێمەدا پاراستووە و لە ژێر تیشکی پێشکەوتنی هزری و کۆمەڵایەتییە نوێیەکاندا پێویستمان بە گەڕانەوە و تەنانەت دوبارە تێڕوانینەوەیان هەیە.

ئەوەی کە بە هزری سیاسی ناوی دەبەین بە هەموو جۆراو جۆری و جیاوازییەکانیشیەوە بە گشتی یەکەم وەکو یەك پرۆژە شیاوی هەڵسەنگاندنە کە خاوەن جۆرێك لە پەیوەستبوونی ناوخۆییە و دووەم وەکو کۆمەڵەیەك کە ئێمە ناوی "مۆدێرن"ی لێدەنێین، چەند خەسڵەتێکی تایبەت بە خۆی هەیە کە لە هزری سیاسی کلاسیك جیای دەکاتەوە و بۆ خۆی ناسنامەیەکی تایبەتی هەیە. لەم بەشەدا بە وردی بۆچوونی خۆمان لەسەر ئەم دوو بابەتە چڕدەکەینەوە.

### ١- لێکدابڕان و پەیوەست بوون لە هزری سیاسی نوێ (مۆدێرن)دا

#### سێ نموونەی شیکردنەوە

بە گشتی دەتوانین بڵێین ئەو بیرمەندانەی کە لەم بەرگەدا باسمان لە تیۆریەکانیان کردووە سوودیان لە سێ نموونەی شیکردنەوە وەرگرتووە. یەکەمین نموونە زیاتر پەیوەستە بە فەلسەفەی مێژوو و خوێندنەوەی پشکێنەرانە یان شیکارانەی مێژوو. هەوڵدەدەین لەم نموونەیەدا دۆزینەوەی یاسامەندییە گشتییەکان لە مێژووی گۆڕانی کۆمەڵگای مرۆیی چەند بڕیارێك هەڵێنجێنین بۆ چۆنیەتی ژیانی کۆمەڵگای مرۆیی و ئەگەری گۆڕانەکانی داهاتووی ئەو ژیانە و جۆرەکانی چاکسازکردنی. ماکیاڤیللی، ڤیکۆ، مۆنتیسکیۆ، رۆسۆ، هیگڵ و مارکسیش لە بەشێکی زۆری بۆچوونەکانی خۆیاندا پەیوەستن بەم جۆرە خوێندنەوە و تێڕوانینەوە.

دووەمین نموونە شێوەی شیکاری یاساییە. خاڵی دەستپێك لەم شێوەیەدا بریتییە لە مافی تاك. لێرەدا تیۆریداڕێژ لە مافە سەرەتاییەکانی تاکەوە دەستپێدەکات





و لە کۆتاییدا دەگاتە بنەما یاساییەکانی کۆمەڵگای سیاسی و مافەکانی دەسەڵاتدار و ئەرکەکانی هاوڵاتیان. دەستپێکردن لە مافەکانی تاکەوە چەند روویەکی هاوبەشی هەیە لەگەڵ یەکێك لە دوکترینە گرنگەکانی هزری کلاسیکی واتە مافە سروشتییەکانی، بەڵام یەك نییە لەگەڵیدا، چونکە مافی سروشتی کلاسیك تاك بەفەرمی ناناسێت. مافە سروشتییەکان بەو جۆرەی کە هۆبز و لۆك باسیان لێوەکردووە و ناونراوە بە مافە سروشتییە نوێیەکان جیاوازە لە مافە سروشتییەکانی هزری کلاسیکی. هەروەك بینیمان هۆبز سەرچاوەی دووری پەیدابوونی کۆمەڵگای سیاسی دەگەڕاندەوە بۆ مافی تاك لە پاراستنی خود و سەرچاوە نزیکەکەشی بەگرێبەستی کۆمەڵایەتی (کە ئەمیش خاوەن ناوەڕۆکێکی یاساییە) لە قەڵەم دەدا. هەروەك بینیمان، هۆبز هەستاوە بە شیکردنەوەی مافی سروشتی بۆ سادەترین و سەلماوترین شێوازی واتە مافی پاراستنی خودی تاکە کەسی.

ئەو بیرمەندانەی کە پەیوەستن بەم شێوە شیکردنەوەیە لە چەند گریمانەیەکی وەکو رەوشی سروشتی و گرێبەستی کۆمەڵایەتی و ئەرکی سیاسی لە پەیوەندی لەگەڵ گرێبەستی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی تیۆریی سیاسی خۆیاندا سوودیان وەرگرتووە. ئەوان گرێبەستی کۆمەڵایەتی بەسەرچاوەی کۆمەڵگای سیاسی دادەنێن و بەگشتیش بە لایەنگرانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی ناسراوان. هەروەك وتمان تیۆریە سیاسیەکانی هوبز و لۆك، لەسەر ئەم بنەمایە بنیاتنرابوون. رۆسۆ لە لایەکەوە پەیوەستە بە نەریتی گرێبەستی کۆمەڵایەتی و لە لایەکی تریشەوە بە شیکاری مێژوویی. لەگەڵ ئەوەی کە رۆسۆ کتێبێکی هەیە بەناونیشانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی و سوود لە چەمکی گرێبەستی کۆمەڵایەتی وەردەگرێت، بەڵام ئەوەی کە لە گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا باسی لێکردووە کۆمەڵگایەکە کە دەبێت لە ئایندەدا دروستبکرێت نەك کۆمەڵگایەك کە بەگرێبەست دابمەزرێت. هێشتاش تیۆریی گرێبەستی کۆمەڵایەتی (هەڵبەتە نەك تەنها بەو جۆرەی کە



هۆبز و لۆك لە تیۆرییەکەی خۆیاندا باسیانکردووە) لایەنگرانێکی هەیە. ئەم دەستەیە حەزدەکەن لەسەر بنەمای گرێبەست کۆمەڵگای سیاسی و سەرچاوە و ناوەرۆك و رێکییەکەی شیبکەنەوە.

نموونەی سێیەم پشت ئەستوور بوو بە دەروونناسی تاك. ئەم گرووپە سەرچاوە و رێکخستنی کۆمەڵگای سیاسی لە دەروونناسی تاکەوە وەردەگرن. بەڵگەشیان ئەوەیە کە پاڵنەری بنەڕەتی مرۆڤ بریتییە لە گەڕان بە دوای شادی و دوورکەوتنەوە لە ئێش و ئازار. دەبێت رەفتاری سیاسی مرۆڤیش لەسەر ئەم بنەمایە شیبکرێتەوە "قازانج" چەمکی بنەڕەتی تیۆریی ئەم بیرمەندانەیە و هەر لەم چەمکەوە رێکخستنی رامیاریش هەڵدەهێنجینن. بەو واتایەی کە دەڵێن هەر کەسەو خۆی باشترین دادوەری قازانجەکانی خۆیەتی، بۆیە تاکەکان مافی یەکسانیان هەیە لە گەڕان بە دوای قازانجەکانی خۆیاندا  و باشترین سیستەمی سیاسی سیستەمێکە کە قازانجی زۆرترین ژمارەی تاکەکان دابینبکات. هەروەها سەرچاوەی کۆمەڵگای سیاسی و ئەرکی سیاسیش لەم قازانجە یان سوودمەندییەوە وەردەگرن و دەڵێن کە خەڵکی بە هۆی سوودمەندی حکوومەتەوە پەیڕەوی لێدەکەن. بۆیە پەنابردن بۆ چەمکی گرێبەستی کۆمەڵایەتی بۆ دیاریکردنی هۆکاری بوونی کۆمەڵگای سیاسی شتێکی بێ ئاکامە. هیوم و بێنتهام و جێمز میل و ستوارت میل کە لەم کتێبەدا باسمان لە تیۆرییەکانیان کرد لەم دەستەیەن. هێشتا چەند لێکدانەوەیەك لە تیۆریەکانی ئەم دەستەیەش لە دنیای هزری سیاسیدا لایەنگری خۆیان هەیە. ئەم دەستەیە لە رووی سەرچاوەی فەلسەفییەوە دەگەڕێنەوە سەر رەوتی سوودگەرایی.

کانت لە نێوان ئەو بیرمەندانەی کە لە بەشەکانی پێشووی هزری سیاسیدا باسمان لێوەکردن شوێنێکی تایبەتی هەیە کە ناتوانین بوێرانە بیبەستینەوە بە یەکێك لەم سێ نموونەیەوە. لەگەڵ ئەوەی کە کانت (هەروەك بینیمان) چەند لایەنێکی گرێبەستی کۆمەڵایەتی لە تیۆریی سیاسی خۆیدا بەکارهێناوە، بەڵام لە بنەڕەتدا باسگەلێکی وەکو ناوەڕۆکی کۆمەڵگای سیاسی و سروشتی ئەرکی سیاسی لە





تێڕوانینی فەلسەفەی ئەخلاق و لە عەقڵی پەتی کردەییەوە وەردەگرێت. ئەو ڕەخنە لە دیدگای سوودگەرایی دەگرێت لەو ڕووەوە کە ئازادی سیاسی بە ئامرازێك دادەنێت بۆ خزمەتکردنی شادی و خۆشبەختی و کەرامەت و گەورەیی مرۆڤ بە ئامانج دادەنێت. کانت لایەنگری جۆرێك لە تێڕوانینی گشتییە دەربارەی ڕێکخستنی دیموکراتیانەی کۆمەڵگا و هێشتاش تێڕوانینی گشتگەرایانەی لە تیۆری دیموکراسی و ئازادی و ئەرکی سیاسەتدا لایەنگرانێکی هەیە.

## بۆچوونە سیاسییەکان

لە ڕووی بۆچوونە سیاسییەکانەوە ئەو هزرانەی کە باسمان لێوەکردن شەپۆلێکی فراوان لەخۆ دەگرن هەر لە دەسەڵاتخوازییەوە بگرە هەتا لیبرالیزم و دیموکراتیزم و سۆسیالیزم. تیۆریەکەی هۆبز لە بواری سیاسیەوە لەگەڵ دەسەڵاتخوازی و لە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە لەگەڵ لیبرالیزم لە پەیوەندیدایە. لۆکیش چ لە ڕووی سیاسی و چ لە ڕووی ئابوورییەوە تیۆریداڕێژی لیبرالیزمە. لایەنگرانی سوودگەرایش لە لیبرالیزمەوە بەرەو لای دیموکراتیزم دەچن. کانتیش لە گۆشەیەکی جیاوازەوە دەگاتەوە بەوان. ڕۆسۆ و هیگڵ نوێنەری بۆچوونی دیموکراتیزمن و مارکسیش نوێنەری سۆسیالزمە.

## پشتبەستن بە دەستکرد بوونی سیستەمی سیاسی

یەکێك لە لایەنە سەرەکییەکانی هزری سیاسی نوێ بریتیبوو لە دەستکردبوونی کۆمەڵگای سیاسی. لە سەدەی حەڤدەیەمدا بزوتنەوەیەکی گەورە لە بواری هزردا دەستیپێکرد کە دەیوست هەموو شتێك لەسەر بناغەی عەقڵ و ویستی مرۆیی لێکبداتەوە، لەم سەردەمەدا کە لەهەمانکاتدا تێڕوانینێکی ماشێنی زاڵبوو بەسەر هزردا، هۆبز هەوڵیدا تاوەکو کۆمەڵگای سیاسی و دەوڵەتیش وەکو دروستکراوی مرۆڤ و وەکو ماشێن شیبکاتەوە. هزری کلاسیکی باسەکەی خۆی لە یاساوە



دەستپێدەکرد و کۆمەڵگای سیاسی دەبەستەوە بە عەقڵ و ویستێکی گەورەتر لە عەقڵ و ویستی مرۆڤ و سیستەمەکەی بە وەرگێڕاوی نموونەیەکی دەرەوەی سنووری مرۆیی بۆ نموونە سنووری خودایی دادەنا. بەڵام هۆبز باسەکەی خۆی لە ویستی ڕەوشی مرۆڤەوە دەستپێکرد. هۆبز ڕوونی کردەوە کە چۆن مروڤ دەسەڵاتی شارستانی دروستدەکات و شوێنیشی دەکەوێت. بەر لە دامەزراندنی دەسەڵاتی شارستانی ویستی مرۆڤ ویستی ڕەهایە، ڕەها بەو واتایەی کە بە هیچ ڕێسا و ئەرکێك سنووردار نابێت. لە دەستدانی ئەرك، هەمان مافی سروشتییە. مافی سروشتی مافی ڕەهایە بەو هۆیەی کە لە سروشتی ویستەوە سەرچاوەدەگرێت، نەك لە یاسایەکی سەرووتر. کۆمەڵگای مەدەنی ئافراندنی ئازادی ویستە ڕەهاکانە. تاکەکان بەپێی گرێبەستی کۆمەڵایەتی ویستەکانی خۆیان دەگوازنەوە بۆ ویستی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا و کۆمەڵگای سیاسی دروستدەکەن. هەروەکو هیگڵ وتویەتی هۆبز سەرنجی داوەتە سەر سەرچاوەی ناوەکی دەوڵەت. بەر لە ئەو دەوڵەت بەردەوام بەکارێکی دەرەکی کۆمەڵایەتی سەیردەکرا کە لە بەرامبەر مرۆڤدا دانراوە.

بە بۆچوونی هۆبز کێشەی گرێبەستی کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە دەسەڵاتدارێك دروستدەکات کە لایەنی گرێبەستەکە نییە لەگەڵ هاوڵاتیاندا و هیچ ئەرکێکی نییە لە بەرامبەریاندا. لە ڕاستیدا بەم جۆرە ئەم گرێبەستە دەگوڕێت بۆ گرێبەستی خۆبەدەستەوەدان. ئەم جۆرە گرێبەستە لەڕووی لۆژیکییەوە ناکۆکی یان پارادۆکسێکی ناوخۆیی تێدایە. پارادۆکسی یان دژیەکی تیۆریەکەی هۆبز ئەوەیە کە پاش سەقامگیربوونی دەسەڵاتدار هاوڵاتیان سەربەخۆیی خۆیان لەدەستدەدەن. هۆبز ئەم کارەی بە پێویست دەزانی بۆ یەکێتی کۆمەڵگای سیاسی. بەڵام ڕۆسۆ ڕەخنە لە گرێبەستی کۆمەڵایەتی هۆبز دەگرێت و پێیوایە کە بەگرێبەستێکی بنیاتنراو لەسەر ئازادی نەبێت یەکێتی و یەکبون بەدی نایەت. ڕۆسۆ دەڵێت کاتێك حکومەت بەهایەکی ئەخلاقی هەیە کە لە هیچ ڕوویەکەوە بە سەر تاکدا نەسەپێندرابێت .





## حکوومەتی سنووردار و مەرجدار لەبری حکوومەتی ڕەها

لۆکی هاونشتمانی هۆبز کە دەستپێکەری سەردەمی ڕۆشنگەری و خاوەن بۆچوونی مەرجدارخوازی بوو، بنەماکانی ڕێبازی هۆبزی پەسندکرد بەڵام بە ئەنجامدانی چەند گۆڕانکاریەك تیایدا بینایەکی نوێی لەسەر دروستکرد. لۆکیش لەم خاڵەوە دەستیپێکرد کە پێویستە لە کۆمەڵگای سیاسیدا دەسەڵاتێکی فەرمانڕەوا هەبێت تاوەکو هەریەك لە تاکەکان لە سنووری بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا ماف و ئازادییەکانی خۆیانی پێبسپێرن. بەڵام ئەم کارەی بە ناپێویست و ناکۆك لەگەڵ گریمانەکانی تیۆریەکەی هۆبز دادەنا کە تاکەکان کۆببنەوە و بەشێوەیەکی بێگەڕانەوە دەسەڵات بدەنە دەستی کەس یاخود دەستەیەك کە هیچ بەرپرسیارێتییەکی نییە لە بەرامبەر هاوڵاتیاندا.

لۆکیش لە تیۆرییەکەی خۆیدا ماف و ئەرکەکانی تاکی لە مافی سروشتی مرۆڤەوە هەڵێنجا. ئەویش بناغەی ئەنجامگیرییەکانی خۆی لە تاکەوە دەستپێکرد و لەوێوە بەرەو دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی هەنگاوینا. بە بۆچوونی ئەویش تاکەکان بەپێی سروشت لە یەکتر سەر بەخۆن و خاوەن ویست و عەقڵن. بەڵام بەو جۆرەی کە ئەو باسی ڕەوشی سروشتیی کردووە کە لە ئەنجامدا بە هەبوونی عەقڵانییەتێکی دوولایەنە لە کۆمەڵگادا کۆتاییدێت، یەکەم بریتییە لە عەقڵانییەتی موڵکداران، ئەویتر عەقڵانییەتی کرێکارە نەدارەکان. هەروەها بەشداری سیاسیشی دابەشکرد بۆ دوو ئاستی جیاوازی پەیوەست بە موڵکداران وکرێکاران.

لە ڕاستیدا هۆبز وەکو کۆمپانیایەکی هاوبەش باس لە کۆمەڵگای سیاسی دەکات کە تیایدا خاوەنی زەوی و سەرمایەکان لەسەر بنیاتی پرەنسیپی حکوومەتی زۆرینە لەگەڵ یەکتردا یەکیان گرتووە و جێبەجێکردنی بڕیارەکانیان لە لایەن تەواوی پێکهاتەکانی کۆمەڵگای سیاسی و لەوانەش کرێکاران (کە هیچ بەشدارییەکیان نییە لە بڕیارداندا) کارێکی پێویستە.



## بەرژەوەندی تاکە کەسی لە بری مافی سروشتی

هۆبز و لۆك دەیانویست بنیاتی کۆمەڵگای سیاسی و هەموو پێداویستییەکان کە پەیوەستە بەو، لە ویست و ڕێکەوتن و ڕەزامەندی خەڵکیەوە وەربگرن.

بەڵام پەنا بردن بۆ مافی سروشتی وەکو سەرچاوەی دەوڵەت لەلایەکەوە دەبووە هۆی لاوازکردنی پێگەی ڕێککەوتن و ڕەزامەندی لەبنیاتی حکوومەتدا. ئەگەر بڕیار وابێت کە ئێمە بە شێوەیەکی سروشتی و پێشوەخت لە کۆمەڵگای سیاسیدا مافێکمان هەبێت لەسەر ئازادی، ئەوکات هەندێك لە ڕەزامەندی و ڕێککەوتن و ویستی ئێمە لەسەقامگیر بوون و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای سیاسیدا کەم دەبێتەوە. ئەم کێشەیە لە هەموو هزری ڕۆشنگەریدا هەبوو لە هەموو ئەو تیۆریانەیشدا هەیە کە ئازادی بە مافی سروشتی و سەروو- سیاسی (بەر لە پێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسی) دادەنێن. هزری سیاسی نوێ کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد پێویستە هەموو شتێکی کۆمەڵگای سیاسی و سیستەمی سیاسی و ڕەوایی و دەسەڵاتی سیاسی لە ویستی مرۆڤەوە (نەك هیچ فاکتەرێکی سەروو و سروشتی تر) وەربگرێت، لەم خاڵەدا تووشی نەگونجان و پارادۆکس هات. بیرمەندانی پەیوەست بە ڕەوتی هزریی سوودگەرایی لە لایەك و ڕۆسۆ و کانت و هیگڵیش لە لایەکی ترەوە بڕیاریاندا چارەسەری ئەم ناکۆکییە بکەن.

بیرمەندانی سوودگەرایی بڕیاریاندا کە خاڵی دەستپێکی خۆیان لە مافی سروشتی تاکەوە بگۆڕن بۆ بەرژەوەندی تاکە کەسی (یا قازانجی تاکەکەسی). گرفتی دەستپێکردن لە مافی سروشتی (و گرفتی کارەکانی هۆبز و لۆك) ئەوە بوو کە لەسەر بنەمای دەستپێکردن لەم خاڵەوە بە تەواوی کۆمەڵگای مەدەنیان کردبووە مەیدانی سیاسی. هەریەك لەوان بە شێوازی تایبەتی خۆی لڤیاتانی ئافراندبوو. لایەنگرانی سوودگەرایی هەوڵیاندا بە پشتبەستن بە بەرژەوەندی تاکەکەس وەکو سەرچاوەی کۆمەڵگای سیاسی بەشێوەیەکی گشتی بواری کۆمەڵگای مەدەنی لە





بواری حکوومەت جیابکەنەوە. بیرمەندانی پەیوەست بە ڕێچکەی سوودگەرایی لەو خاڵەوە دەستپێدەکەن کە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا هەرکەسە و بە دوای بەرژەوەندی تاکەکەسی خۆیدا دەگەڕێت و ئەگەر هەرکەسە و بەدوای بەرژەوەندی تاکەکەسی خۆیدا بگەڕێت، بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگایش دابیندەبێت.

لایەنگرانی ڕێچکەی نۆمینالیزم پێیان وایە کە بەرژەوەندی کۆمەڵگا شتێك نییە جگە لە کۆی بەرژەوەندی یەك بە یەکی تاکەکان، ئەوان لە بنەڕەتدا بۆ کۆمەڵگا وەك گشتێك دان بە ناسنامەیەکی جیاوازدا نانێن. بە بۆچوونی ئەوان کۆمەڵگا وەکو یەك گشت تەنها ساختەیەکی زمانییە. ئەوان پێیان وایە کە کۆمەڵگا کۆی ژمارەی تاکەکانە.

لایەنگرانی سوودگەرایی چەمکی مافە سروشتییەکانیان وەلاوەناو لە بری ئەوە جەختیان لەسەر دەروونناسی تاك کردووە. بەڵام ئایا پشت ئەستوربوون بە دەروونناسی مرۆڤ و دەرهێنانی بنەما ئەخلاقییەکان لەودا بە جۆرێکی تر گەڕانەوە نییە بۆ سروشتی مرۆڤ؟ جگە لەمە ڕۆسۆ ڕەخنەیەکی توند ئاڕاستەی هەموو ئەمانە دەکات هەر لە هۆبزەوە هەتا بێنتهام و میلیش. ڕۆسۆ بەشیکردنەوەی مێژوویی عەقلانی بەو ئەنجامە دەگات کە ئەو پاڵنەرانەی کە هۆبز باسیان لێوەدەکات (وەك لووتبەرزی کە لە شیکردنەوەی هۆبز دەربارەی ڕەوشی سروشتی پێگەیەکی گرنگی هەیە) لە بنەڕەتدا سروشتی نین، بەڵکو کۆمەڵایەتین و تەنها لە کۆمەڵگادا دروستدەبن. ڕۆسۆ سەبارەت بە بنەماکانی هزری سیاسی سوودگەراییش دەڵێت ئەو قازانجانەی کە ئەمان باسی لێوەدەکەن و هەر لە ماکیاڤیللییەوە هەتا میل بانگەشەیان بۆ کردووە ئەویش سروشتی نییە. قازانجخوازی زیاتر لە وەی کە خەسڵەتێکی سەقامگیری هەبێت لە پرۆسەی یەك لە دوای یەکی ڕوداوە مێژووییەکانی کۆمەڵگای مرۆییدا دروستبووە.



## ئازادی خەیاڵی و ئازادی ڕاستەقینە

بەپێی تیۆریی بنیاتنراو لەسەر "دیموکراسی بازاڕ" کە بریتیبوو لە وێستگەی ڕەوتی هزری سوودگەرایی دەربارەی سیستەمی سیاسی کۆمەڵگا ئەو لێکدانەوەیە لە عەقلانیەتی دەوڵەت پەرەیسەند کە لە کۆمەڵگادا هەرکەسەو بۆ خۆی بڕیاردەدات و ئاکامی بڕیارەکەیشی بۆ خۆیەتی.

سوودگەرایی ئەم شێوازە بە هاووێنەی بەرژەوەندی کۆمەڵگا و خوازیاری ئازادی دادەنێت. بەڵام ئەم ئازادییە جگە لە خەیاڵێك شتێکی تر نییە. چونکە لەو کۆمەڵگا و سیستەمەی کە بیرمەندانی سوودگەرایی باسی لێوەدەکەن بڕیاری تاکەکەس کاریگەریەکی کەمی هەیە لەسەر کاری گشتی. لە ئەنجامدا تاك لەدەرەوەی ئەوەی کە پەیوەست دەبێت بە بڕیارەکەی ئەوەوە ڕووبەڕووی هەلومەرجێك دەبێتەوە کە کاری ئەو نییە و ئەنجامی کار و بڕیاردانی ملیۆنەها ویستی دیکەیە (کە ئەوانیش هەموو گرفتاری ئەم ڕەوشەن).

ئەو شتەی کە ویستە پەرت و بڵاوەکان بەیەکەوە دەبەستێت بریتییە لە یاساکانی کۆمەڵگا. لە کۆتاییدا ویستە لێك جیاکراوەکان کە بەبێ بایەخییەوە دەڕواننە کاری گشتی بەپێچەوانەوەی ڕواڵەتیانەوە زۆر ئازادنین. ئەگەر ئازادی ئەوەیە کە دەبێت ئەو شتەی کە لە سنووری گشتیدا ژیانی من دروستدەکات لەلایەن خۆمەوە دیاریبکرێت، لەم حاڵەتەدا هەر چەندێك من بکەومە بارێکەوە کە تەنها بەشێکی بچووکی کاروبارەکان بە بڕیاری منەوە پەیوەستبن بە هەمان ئاست من ئازادنیم. ئازادی ئەوەیە کە تەواوی ئەو شتەی کە ژیانی من دروستدەکات پەیوەستبێت بە بڕیاری منەوە.

بەڵام چۆن ئەم کارە لە کۆمەڵگادا دێتەدی؟ ناکرێت لە کۆمەڵگادا ئەنجامی گشتی تەنها لەلایەن منەوە دیاریبکرێت. ملیۆنەها مرۆڤی تر لە کۆمەڵگادا هەن کە بەش بە حاڵی خۆیان کاریگەرییان دەبێت لەسەر ئەنجامی گشتی. کەواتە





وادیارە من هەرگیز ناتوانم بەو واتایە ئازادبم کە بڕیاری من کاریگەری هەبێت لەسەر تەواوی ژیانم.

بەڵام ئەم کارە دەکرێت و ئەمە هەمان ئەو پەرجوەیە کە رۆسۆ دۆزیویەتەوە. هەروەك لە خستنە رووی هزری رۆسۆدا باسمانکرد ئەو بەدوای سیستەمێکی ژیانی گشتیدا (ژیان لە رووی لایەنی سیاسیەوە) دەگەڕا کە تیایدا تاك سەرەڕای ئەوەی کە لەگەڵ هەمووواندا یەکی گرتووە یەك پارچە بووە لەگەڵیاندا، لە کاتی ملکەچبوون لە بەردەم بڕیاری هەمووواندا بەردەوام ملکەچی خۆی بێت و وەکو بەرلە پەیوەستبوونی بە کۆمەڵگای سیاسیەوە ئازادبێت. ئەو بەڵگەی بۆ ئەوە هێنایەوە کە ئەم کارە بە بەشداری لە"ویستی گشتی" واتە بەشداریەك کە هەردوو لایەنی گشتی و هەمووانی لەیەك شوێندابگرێتەوە دێنەدی.

ئەگەر من و هەموو ئەوکەسانەی کە لە کۆمەڵگای سیاسی مندا دەژین بکەوینە بڕیاردان سەبارەت بە کارێکی تەواو و گشتی و بەرژەوەندی کۆمەڵگایش لەبەر چاوبگرین لەم بڕیارەدا، بەم جۆرە هەر بڕیارێك کە لەلایەن کۆمەڵگاوە بێت بڕیاری منیشە چونکە من خۆم ئەوەم ویستووە تەنانەت ئەگەر بۆچوونێکی تریشم هەبوبێت لەکاتی دەنگداندا. مرۆڤ لەگەڵ خەڵکیدا دەتوانێت ئازادبێت نەك لە بەرامبەریاندا.

لەو کۆمەڵگایەی کە رۆسۆ مەبەستیەتی هەرکەسە و دەسەڵاتی خۆی دەخاتە ژێر دەسەڵاتی بەرزی ویستی گشتییەوەو وەکو بەشێکی جیانەکراوەی کۆمەڵێك سەیردەکرێت. بەم جۆرە پەیکەرێکی ئەخلاقی دروستدەبێت کەدەبێە شوێن گرەوەی یەك بەیەکی تاکی تاکەکان.

ئەم پەیکەرە ئەخلاقییە (یان دەوڵەت) ژیان و ویستی تایبەتی خۆی هەیە. تاکەکان وەکو ئەندامانی ئەم پەیکەرە ئۆرگا. نیکە بەشداری دەکەن لە ژیانی عەقڵانیدا. ئەوان ئێستا کردارەکانیان بەپێی فەرمانی عەقڵە نەك هاندانی غەریزەکان. و بە



تەواوی واتا خود- رێسا و(سەربە خۆ) و ئازادن، چونکە لە هەمان کاتدا ئازادی دەرباز بوونە لە هەموو ئەو زیانانەی کەگەندەڵییەکانی کۆمەڵگا بەسەر سروشتی پاکی مرۆڤیدا سەپاندووە (وەکو تەماحکاری وستەمکاری و لووتبەرزی).

نابێت هەموو ئەم باسانە ئەو گومانەمان لە لا دروستبکات کە رۆسۆ خوازیاری دەستتێوەردانی سنووری گشتیە (دەوڵەت) بۆ سەر سنووری تایبەتی. وەها شتێك کە هاوشێوەی پاوانخوازی(تۆتا لیتاریانیزم)ە لە بۆچوونەکانی رۆسۆوە بەدوورە. سەرگەرمی رۆسۆ بریتییە لە سنووری گشتی ژیانی مرۆڤ نەك سنووری تایبەتی.

## کۆمەڵگای ئەخلاقی و کۆمەڵگای عەقڵانی

کانت و هیگڵ سەرەڕای ئەوەی بەدوای چارەسەرکردنی هەندێك لە ناکۆکییەکانی تێوریەکەی رۆسۆدا دەگەڕان دیکترینی"ویستی گشتی" ی ناوبراویان وەرگرت و هەوڵیاندا بەلابردنی کەم و کورتییەکانی تێوریەکەی رۆسۆ لەم بارەیەوە بیگۆڕن بۆ چەمکێکی کاملتر و پێگەیشتووتر. هیگڵ رەخنەی ئەوەی لە رۆسۆ دەگرت کە ئەو عەقڵی بە تاکە کەسی دادەنا نەك نێوان زەینەکان. هیگڵ بە دیاریکردنی عەقڵ وەکو کارێکی نێوان زەینەکان کێشەکانی تیۆریەکەی رۆسۆی چارەسەرکرد و هەروەها بەهەمانشێوە چاکسازایی لە ناکۆکییەکانی تیۆریەکەی کانتیشداکرد. هیگڵ هەستی بەوەکرد کە ناکرێت لە تاك یان بە واتایەکی تر لە سنوری لاوەکیدا بەدوای بنەماکانی ئەخلاق و ئازادیدا بگەڕێین، بەڵکو دەبێت لە ناو جۆرێك لە یەکێتی نێوان بەش و گشت واتە ویستی تاك و ویستی کۆمەڵدا ئەم کارە ئەنجامبدەین. ناتوانین تاك بناسین مەگەر ئەوەی کە بە دروستی دەرك بە پەیوەندی ئەوبکەین لەگەڵ تەواوی ئەو کۆمەڵگایەی کەتاك تیایدا ئەندامە.

لە تیۆریەکەی هیگڵدا مێژوو پرۆسەیەکی روو لە کاملبوونە کە سەرئەنجام مرۆڤ(کە بوونەوەرێکی ئازادە بە پێی ناخی خۆی، واتە رەنگدانەوەی گیان یان عەقڵە لە بەرزترین قۆناغی رەوتکی کامڵ بوونی خۆی) تیایدا بە خودئاگایی ئازادی دەگات.





ئەم خودئاگاییە لە کۆمەڵگا گەشە نەکردووەکاندا وەکو ئەو کۆمەڵگایانەی کە خاوەن سیستەمی کۆیلەداری یان فیودالین هێشتا شاراوەیە. لە کۆمەڵگا کامڵنەبووەکاندا هێشتا مرۆڤ هۆگری ئازادی نەبووە و هێشتا ویستی مرۆڤ نەگۆڕاوە بۆ ویستی ئازاد. تەنها لە دەوڵەتی مۆدێرندا مرۆڤ بە ئازادی تەواو و خودئاگایی لە ئازادی دەگات.

## ناسین وەکو بەرهەمی زەینی بە کۆمەڵ

بیرمەندانی لایەنگری ئەزموونگەری لە هۆبزەوە هەتا میل لە بنەڕەتدا ناسین یاخود مەعریفە بە روویەکی کارلێکراو دادەنێن. بەواتایەکی تر تەنها رۆڵی وەرگرو کارلێکراویان دەدایە پاڵ هۆشی مرۆڤ. پێیان وابوو کە مرۆڤ و هۆشی مرۆڤ لەلایەکەو جیهانی دەرەکیش لە لایەکی ترە و ئەمیان لە ئەویان رەنگدەداتەوە. کانت رەخنەی لەم تێڕوانینە گرت و بەڵگەی بۆ ئەوە هێنایەوە کە هۆشی مرۆڤ رۆڵێکی چالاکی هەیە لە پرۆسەی ناسیندا. لە کتێبی "هەڵسەنگاندنی عەقڵی پەتیتیۆریی" دا بە درێژی باسی لەوەکردووە کە هۆش رۆڵی چالاکی هەیە لە پرۆسەی ناسین و لە کرداری تێگەیشتندا قاڵبەکان یاخود گوتارەکانی خۆی لەسەر ئەزموون بنیات دەنێت و ئەزموون دەخاتە ناو قاڵبی ئەم فۆرم و گوتارانەوە. بەواتایەکی تر کانت ئەو تیۆریەی خستەروو کە ناسین بریتییە لە بەرهەمی پەیوەندی بەرامبەری بکەری شتناس(زەین،مرۆڤ) لەلایەکەوە و ئەو شتەی کەدیاری کراوەبوو ناسین لەلایەکی ترەوە. هەروەك وتمان هیگڵ لە فەلسەفەی خۆیدا عەقڵی لەو جۆرەی کە لەسیستەمی هزری کانتدا هاتبوو گۆڕی بۆ عەقڵی هەموو بوونەوەرەکان و بەڵگەی بۆ ئەوە دەهێنایەوە کە ناسین بەرهەمی فرەیی زەینەکان (نێوان زەینەکان)ە.

هەروەك هیگڵ باسیکردووە ئەو چەمکانەی کە بەهۆیانەوە وێنەیەکی گونجاومان دەستدەکەوێت سەبارەت بە جیهان بەشێوەی جیاجیاو لە ناو زەینە تاکەکاندا



دروستنابێت، بەڵکو لە بنەڕەتدا میراتی زەینی بەکۆمەڵە. بەم جۆرەبوو کە هیگڵ زەین و عەقڵانیەتی لە تاکەوە گواستەوە بۆ کۆمەڵ و مێژوو. لە تیۆریەکەیدا ناسین بە شێوەیەکی کۆمەڵایەتی هەماهەنگ دەبێت و لە هەموو قۆناغێکدا مەرجدارە بە ئەزموونی مێژووییەوە. تواناکانی زەینی مرۆڤ پەیوەندییەکی ئۆرگانیان هەیە لەگەڵ چەند فۆرمێکی تایبەتی سیستەمی کۆمەڵایەتیدا. لە ناوەڕۆکدا عەقڵانیەت شتێکی کۆمەڵایەتی و نێوان زەینییە. مارکس لەم رووەوە درێژەی بە نەریتەکەی هیگڵدا و بەرەو کامڵبوونی برد.

## ٢- بنەماکانی تێڕوانینی نوێ (مۆدێرن)

هەروەك بینیمان، هزری سیاسی نوێ گەلێك لە تەوەرە هزرییەکانی، هزری پێش خۆی بەتەواوی گۆڕی کە دەتوانین بە هزری کلاسیکی یان هزری پێش مۆدێرن ناوی‌لێ ببەین. چەندین خاڵ هەن کە هزری سیاسی نوێ لە هزری سیاسی پێش خۆی جیا دەکەنەوە. ئاماژەکردن بە یەك بە یەکی ئەم خاڵانە بۆ خۆی پێویستی بە باسێکی دوور و درێژ هەیە. ئێمە لێرەدا بۆ دروستکردنی بەراوردێك لە نێوان هزری سیاسی نوێ و هزری سیاسی کلاسیك ئاماژە بە چەند تەوەرێکی گرنگی جیاوازی بنەماکانی ئەم دوو تێڕوانینە(مۆدێرن و پێش مۆدێرن) دەکەین.

## گۆڕینی ئاراستە لە"دەبێت"ە وە بۆ"هەیە"

هزری سیاسی کلاسیك ئەم بابەتەی کردبووە خاڵی سەرەکی باسەکەی خۆی کە مرۆڤ دەبێ چۆن بژیت. بابەتی سەرەکی هزری سیاسی کلاسیك بریتی بوو لە پایەبەرزی و ئەرکەکانی مرۆڤ. هەروەك بینیمان لەسەردەمی کۆنەوە هەتا سەدەکانی ناوەڕاست رۆڵێکی پەروەردەییان دەدایە پاڵ دەوڵەت. روانگەی مەسیحییەت و زانایانی مەسیحی کە پێگەی کاروبارە مەعنەوییەکانیان جیاکردەوە لە کاروبارە مادییەکان و کاروباری مەعنەوییان دایە کلێسا و کاروبارە





مادییەکەشیان بۆ حکوومەت بە جێهێشت لە گرنگی ڕۆڵی پەروەردەیی دەوڵەتیان کەم کردەوە، بەلاّم بە تەواوی لایان نەبرد.

هزری سیاسی نوێ لەبەرامبەر هزری سیاسی کلاسیك لە هەنگاوی یەکەمدا بیری لەوەدەکردەوە کە مرۆڤ چۆن دەژێت، واتە ڕاستییە دەرەکییەکان بەچ شێوەیەکن، ئەوکات لەسەربنەمای وەها ناسینێك بۆچوونی خۆی دەخاتەروو کە پێویستە چۆن بژێت، یان بە وتەیەکی تر شتی ئایدیال لە ژیانی مرۆڤدا چییە. ماکیاڤیلی یەکەمین بیرمەندێك بوو کە چەمکی فەزیلەتی سیاسی لەوانە نیشتمانپەرستی، کردە شوێنگرەوەی چەمکی پایەبەرزی مرۆڤ کە چەقی سەرنجی هزری پێش ئەو بوو. هۆبزیش بە دەستپێکردن لە بنەما هزرییەکانی ماکیاڤیلییەوە تەلاری مەزنی هزری سیاسی نوێی دامەزراند.

## عەقڵی مرۆیی لەبری یاسای سروشتی و یاسای خودایی

هزری سیاسی بەردەوام بە دوای بنەمایەکدا گەڕاوە بۆ دادپەروەری. لێرەدا مەبەستی ئێمە لەدادپەروەری یاسایەکی گشتییە کە بکرێت لەسەر بنەمای ئەو، سەبارەت بە یاسادانراوەکانی مرۆڤ دادوەری بکرێت و بە هێزی و لاوازیی یاخود دروستی و نادروستی ئەو هەڵبسەنگێندرێت. بە شێوەیەکی گشتی هزری سیاسی کلاسیك لەیاسای خودایی، یان لە یاسای سروشتیدا بە دوای وەها بنەمایەکدا دەگەڕا. بۆ ئەوەی یاسای مرۆیی شتێکی ڕەوابێت، ئەوا پێویستە بگونجێت لەگەڵ یاسای سروشتی یان یاسای خوداییدا. سۆفیستاییەکان و ئیپکۆرییەکان تەنها ڕێچکە گەلێکی هزری بوون کە یاسا و دادپەروەرییان دەگەڕاندەوە بۆ عەقڵی مرۆڤ. هەروەك بینمان یۆنانی کۆن کۆمەڵگایان بە بەشێك لەسیستەمێکی گەورەتر واتە سیستەمێکی جیهانی دادەنا کە(لۆگۆس) یان یاسای خودایی زاڵە بەسەریدا و(نۆمۆس)یاخود یاسای دەوڵەت ڕەنگدانەوەی ئەوە. ئەفلاتۆن لە



مشتومڕیدا لەگەڵ سۆفستائییەکان هەوڵیدا کە دادپەروەری ببەستێتەوە بەشتێکی پایەدارتر لە نۆمۆس، واتە ئایدیا.

هەیوانییەکانیش هەروەك لە بەرگی یەکەمدا باسمانکرد بڕوایان بە یاسای سروشتی هەبوو وەکو سومبولێك لە عەقڵی جیهانی و کاتێك یاسای مرۆییان بە دادپەروەرانە دادەنا کە بگونجێت لەگەڵ ئەو یاسایەدا. سێنت ئۆگەستین ویستی خودایی ئاشتکردەوە لەگەڵ عەقڵدا و بەسەرچاوەی یاسای دانا.

ڕێبازی هەیوانییەکان بووە بناغەی هزری مەسیحی و ئاوێتە بوونی دوکترینەکانی کلاسیکی ئایینی جوولەکە لەگەڵ هزری هەیوانییەکان بنەماکانی هزری سیاسی ڕۆم و سەدەکانی ناوەڕاستی پێکهێنا. هزری نوێ کەوتە بەرامبەر تەواوی ئەم نەریتە و عەقڵی مرۆیی کردە بناغەی دادپەروەری و سیستەمی کۆمەڵگا. هەروەك بینیمان هۆبز عەقڵ و ویستی مرۆیی بەسەرچاوەی دەوڵەت و عەقڵ و ویستی دەوڵەتیشی بەسەرچاوەی یاسا دادەناو بیرمەندانی پاشتریش درێژەیان بەم نەریتەدا. هەموو بیرمەندە گەورەکانی پاش هۆبز عەقڵ و ویستی مرۆییان بەسەر چاوەی ڕێکی و یاسا دادەنا. جیاوازی بۆ چوونەکانیان لەوەدابوو کە بە چ شێوەیەك پەیوەندی نێوان عەقڵ و ویستی مرۆیی بخەنەروو. هۆبز لەسەرەتادا ڕێرەوی وەرچەرخانی هزری سیاسی ویستی بە ڕەها ناساند و عەقڵی خستە خزمەتی ویستەوە و هیگڵیش لە لوتکەی ئەم وەچەرخانەدا ویستی وەکو شتێکی عەقلانی شیکردەوە. بەم جۆرە ویستی ڕەهای هۆبز لە ڕێڕەوی کامڵ بوونی هزری سیاسی نوێدا بۆ ویستی عەقلانی گەشەی کرد.

## ڕازی بوون لە بڕی فەزیلەت

هزری سیاسی کلاسیك جەختی لەسەر تەوەرەی فەزیلەت و کاروبارەکان و جیاوازی مرۆڤەکان لە ڕووی فەزیلەت و کاروبارەکان دەکردەوە. بەپێی یاسای سروشتی مرۆڤەکانی بە جیاواز دادەنا لە ڕووی بەرکەوتنی عەقڵەوە چەند پلەیەکی جیاوازی





فەزیلەت و کامڵبوونی بۆیان دەستنیشان کردبوو. سیستەمی کومەلاٚیەتی ئابوورییەکانی سەردەمی کۆن و سەدەکانی ناوەڕاست واتە کۆیلەداری و فیودالیزمیش جەختیان لەسەر جیاوازی رەچەڵەك و کاروبارەکان دەکردەوە و پشتیان پێدەبەست. بەم جۆرە کۆمەڵگای کلاسیکی و بیرکردنەوەی کلاسیکی لەسەر بنەمای جیاوازی لە پلەکانی فەزیڵەت و کاروبارەکان رێکخرابوون.

بەلاٚم هزری نویٚ بنەمای خۆی لەسەر یەکسانی مرۆڤ و رەزامەندی هەمووان لە بەرپاکردن و بەڕێوەبردنی حکوومەتدا بنیاتنا. هۆبز سیستەمی فەلسەفەی سیاسی خۆی لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراند کە بەشێوەیەکی سروشتی هەرکەسەو خۆی باشترین دادوەر و بڕیاردەرە سەبارەت بە پاراستنی خودی خۆی و کەرەستەکانی. ئەم تێگەیشتنە لەمافە سروشتییەکان تێگەیشتنێکی تەواو نوێبوو. بەپێی تێگەیشتنی کلاسیك بۆ مافە سروشتییەکان ناکرێت هەموو مرۆڤەکان بەیەکسان دابنرێن، چونکە یەکسان نین لەگەیشتن بە کامڵبوونی مرۆیی. چونکە مەرجی دادپەروەری بریتییە لە رەفتاری یەکسان لەگەڵ مرۆڤە یەکسانەکاندا، بۆیە ناکرێت مافێکی یەکسان بۆ ئەو کەسانە دیاری بکرێت کە لە پلەیەکی نزمتردان لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لە پلەیەکی بەرزتردان. دەسەلاٚتداری، شایستەی ئەو کەسانەیە کە لە کامڵبوونی مرۆییەوە نزیکترن.

## لە پێشتر بوونی ماف بەسەر ئەرکدا

هزری کلاسیك جەختی لەسەر ئەرك دەکردەوە و تەنانەت کاتێکیش کە ئاماژەی بە مافەکانی مرۆڤ دەکرد دەیبەستەوە بە ئەرکەکانی مرۆڤەوە. هزری مۆدێرن مافی مرۆڤی بە لە پێشترداناو ئەرکەکانی مرۆڤیشی لە مافەکانییەوە هەلێنجان. لە هزری نوێدا ماف بناغەی واقیعیەتی سیاسییە و ئەرکی دەوڵەتیش پارێزگاری کردنە لە مافی خەڵکی. لە پێشتر دانانی مافی مرۆڤ بەسەر ئەرکەکانیدا بۆ خۆی شۆڕشێك بوو لە جۆری تێڕوانین بۆ تاك و کۆمەڵگا. بەم تێڕوانینە مافەکانی



دەسەلاٚتداران لە بنەڕەتدا بە وەرگیراو لەو مافانە دادەنران کە لە ناوەرۆکدا پێوەندییان بە تاکەوەهەبوو. دەسەلاٚتی فەرمانڕەواکان لە رەزامەندی و رێککەوتنی تاکەکانەوە وەرگیراوە. لە کاتێکدا کەلە هزری کلاسیکی فەرمانڕەوایان دەسەلاٚت و رەوایی خۆیان دەگەراندەوە بۆ خودا یان یاسای سروشتی نەك خەڵکی.

## رێزگرتن لە چێژ و شادی

چەمکێکی سەرەکی لە هزری سیاسی کلاسیك هەیە بە ناوی چاکە(یان بەرژەوەندی) کە پەیوەستە بە وەدیهاتنی کەماڵە شاراوەکانی ناو کەسێتی مرۆڤ. فەلسەفەی کلاسیکی هەموو چێژ و پێداویستییەکانی مرۆڤی لە زنجیرە پلەیەکدا پۆلین دەکرد کە گەڕان بە دوای چێژ لە پلەی خوارەوە و گەڕان بەدوای کامڵبوونی عەقلاٚنی لە بەرزترین پلەیدابوو. فەلسەفەی کلاسیکی وا بەڵگەی دەهێنایەوە کە چێژ بریتییە لە تێرکردن و پڕکردنەوەی پێداویستییەکان و پێداویستییەکانیش چەند پلەیەکی جۆرا و جۆریان هەیە. بۆ ئەوەی بزانین کە چ شتێك چاکەی(لەبەرژەوەندی) مرۆڤە، پێویستە بزانین سروشتی مرۆڤ چۆنە. ئەوەی کە مرۆڤ دەکاتە مرۆڤ و لە ئاژەڵ جیایدەکاتەوە عەقڵە:"مرۆڤ ئاژەلێکی بگۆیە "لێرەدا یگۆیی واتە عەقڵ. کەواتە ئەو شتەی کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا دەگونجێت بریتییە لە بیرکردنەوە و تێڕامان و کاری پەسندکراوی عەقڵ و ژیانی عەقلاٚنی. ئەوەی کە گونجاوترە لەگەڵ ژیانی بالاٚی مرۆڤدا فەزیلەتە نەك چێژ. بەلاٚم هزری سیاسی نویٚ گەڕان بە دوای چێژ و شادیش لە چوارچێوەی چاکەدا دانا. لایەنگرانی سوودگەرایی لەم بوارەدا زیاتر لە رێچکە هزرییەکانی تر جەختیان لەسەر شادی و خۆشی تاکەکەسی دەکردەوە. رێچکەکانیتر هەوڵیاندا کە زیاتر شادی تاکەکەسی لەگەڵ بەرژەوەندی گشتیدا هەماهەنگ بکەن و هیگڵ و مارکسیش لەو کەسانە بوون کە بەم کارە هەڵسان.



